

# ئەزموون و کەس

## خوێندنەوەیەک بۆ کۆمەڵێک کەسایەتی

ڕێبوار سیوەیلی

**ناوی بەرهەم:** ئەزموون و کەس
(خوێندنەوەیەک بۆ کۆمەڵێک کەسایەتی).
**نوسەر:** ڕێبوار سیوەیلی (١٩٦٩- )
**دیزاین:** لوقمان ڕەشیدی
**تایپ:** نوسەر
**تیراژ:** ٧٥٠ دانە
**نۆرەی چاپ:** چاپی یەکەم، بەرگی یەکەم، زنجیرە: (٧)

**بڵاوکردنەوەی:** دەزگای زەریاب. Zeryab Publisher
بە هاوکاری گۆڤاری (سڤیل)
**چاپخانە:** ڕۆژهەڵات، هەولێر
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ٢٥٠٩ ) ساڵی ٢٠١٣ی دراوەتێ.

Rebwar H. Amin Siwayli:
Person and experience
Some Persons in my life, Vol: 1
Salahadden University,
Philosophy department
Kurdistan, Iraq
First Edition 2013
Published by: Zeryab Publisher& Civil Magazine
Printed at: Rojhalat printer, Hawler

# پێڕست

# پێشەکی

مرۆڤ بوونەوەرێکی کراوەیە. هەم لە بەخشین و هەم لە وەرگرتندا. سرووشتیترین دۆخی مرۆڤبوون ئەوەیانە کە دەبەخشێ و وەردەگرێ. منداڵیی، بەپێچەوانەی تێگەیشتنی باوەوە، ئەو قۆناغەیە کە مرۆڤ زیاتر دەبەخشێ و کەمتر وەردەگرێ. بەخشینەکانی بێمەرجن و تەنیا ئەو کاتەش وەردەگرێ کە پێویستی پێیەتی، یان بۆخۆی ناتوانێ ئەو شتەی دەیەوێ، بەدەستی بهێنێ. بەخشینی بێمەرج، بنەمای یەکەمی هاوچەشندۆستی و ئەویندارین. ئەوەی لە گەورەییدا زۆر دەبەخشێ، یان لە منداڵیدا مەحرووم بووە، یان زۆری وەرگرتووە. وەلێ لە گەورەساڵیدا مرۆڤ، بەپێی ئەو ئەزموونانەی لە ژیان و واقیعەوە فێریان بووە، کەمێ مەیلی بەلای وەرگرتندا زیاد دەبێ. بۆیە خۆپارێزی وەک دۆخێکی سایکۆلۆژی و کۆنپارێزی (کۆنسێرڤاتیزم) وەک ئایدیۆلۆژییەک، لەوێدا مەترسیدار نین، کە هەر یەکەیان بەجیا مرۆڤەکان ڕام و دەستەمۆ بکەن، بەڵکو

ئەو کاتە مەترسیدارن کە مرۆڤ، یان تاکەکەس لە یەک کاتدا هەم خۆپارێز بێ و هەم کۆنپارێز.

ئەوانەی لە گەورەساڵیی خۆیاندا بەردەوام دەبەخشن، ڕەگێکی قووڵ دەیانبەستێ بە منداڵییەوە، چونکە وەک گوتم: لەناو قۆناغەکانی تەمەندا، تەنیا لە سەردەمی منداڵیدا مرۆڤ بێمەرج، بێ چاوەڕوانی بێ هیچ پاداشتێک دەبەخشێ. بەمجۆرەش لە منداڵی و لە دایکایەتیدا یەک گەورەیی هەیە کە مرۆڤ دەگەیەنێتە پلەی کەماڵ، ئەویش ئەو بەخشینەیە کە منداڵ و دایک لێکدی نزیکدەخاتەوە. ئەگەرچی هەموومان ڕۆژگارێک منداڵ بووین و بەخشندە، وەلێ هەموومان نابینە داییک. داییک بوونەوەرێکی ئەوەندە ئۆرگیناڵ و دانسقەیە، کە خەسڵەتی کەسایەتییەکەی تەنیا لەگەڵ سیفەتی یەزدان و سرووشتدا، بەراوورد دەکرێن: ئەوان ئافەریدە و بەدیهێنەرن. بۆیە بەلای منەوە دایکایەتی پلەی یەکەمی مرۆڤبوونە و منداڵێتیش پلەی سەرەتا. مرۆڤ لە سەرەتادا منداڵە و لە دایکایەتیشدا، دانسقە و بێنموونە. ئێمە کاتێ کڕنووش بۆ یەزدان و سرووشت و داییک دەبەین، هیچ کردەیەکی ملکەچانەمان ئەنجام نەداوە، لەبەردەم دانسقە و تاک و بێنموونەدا، لەبەردەم خوڵقێنەردا، سەری دانەویو، خۆی لە کەماڵ و جوانیی ڕەها نزیکدەخاتەوە. مرۆڤی سەرەتا و سەرخستنە سەر بەدی ڕەق، منداڵ و سەر خستنە سەر کۆشی داییک و ئیماندار و سەر خستنە سەر تاتەنوێژ و جۆرەکانی، لە بنەمادا یەک کردە ئەنجام دەدەن: ستایشی گەورەیی و مەستبوون بە عەشقی کەماڵ و دانسقەییەوە.

دایکایەتی پلەی یەکەمی مرۆڤبوون و منداڵییش پلەی سەرەتا. بەڵام لە نێوان دایک و منداڵیدا جیاوازیی هەرە سەرەکی ئەوەیە، کە قۆناغی منداڵی کۆتایی پێدێت و دایکایەتی، بێکۆتا. بۆیە ئەوانەی لە

گەورەساڵیی خۆیاندا لە بەخشین ناکەون، ئەو مرۆڤانەن کە هەم سیفەتی دایکیان تێدایە و هەم منداڵی.
من لەم زنجیرە وتارەدا، سەری کڕنووش بۆ ئەو کەسایەتیانە دادەنەوێنم کە هەر کامێکیان بە گوێرەی خۆی و بە شێوەی جیاواز، بەهۆی کەسایەتی و بەرهەم و بیریانەوە، یارمەتیانداوم تا بەشێ لە مرۆڤبوونی خۆم لە هەموو ئەو خۆپارێزی و کۆنپارێزییانە ڕزگار بکەم، کە دەشیا بەم یان بەو پاسا و یەخەم بگرن. ئەو کەسایەتیانەی لەم زنجیرە وتارانەدا بەسەریان دەکەمەوە، هەندێکیانم لە نزیکەوە ناسیون و هەندێکیانیشم لە ڕێگەی بەرهەمەکانیانەوە دۆزیونەتەوە و هەرگیز نەمدیتون. چونکە زۆر پێشئەوەی بیانبینم، کۆچیانکردووە. بەڵام قسەی هیچ کەس و زەمانێک لەسەریان، نەچۆتە مێشکمەوە. من ئەو کەسانە بەوجۆرە ستاییش دەکەم کە بۆخۆم ناسیومن و پێموایە لە شێوازبەخشین بە ڕۆح و کەلتووری ئێمەی کورد و مرۆڤایەتی، لە سەدەی بیستەم و ئێستاشدا، دانسقەن. من دەمەوێ باس لەو پەیوەندییە ناسکەی نێوان خۆم و ئەوان بکەم، کە لە سەدان و بگرە هەزاران سەرچاوەوە ڕایەڵ بووە. نامەوێ ئەوەی من بە ئەوانەوە دەبەستێتەوە بەسەر پەیوەندی گشت خوێنەرەکانم و ئەواندا، بگشتێنم، بەڵام مەبەستمە لە میانەی گێڕانەوەکاندا سوودێک بەو کەسانە بگەیەنم کە پێیانوایە پێگەیشتنی خۆیان بەندە بە بەخشندەیی ئەوانیترەوە.
ئەو کەسایەتیانەی لەم بەرگەدا ناویان هاتووە، تەواوی ئەو کەسایەتیانە نین کە لە پێگەیاندن و بەخشین لە ژیانی مندا ئامادەییان هەبووە، ئەمە تەنیا سەرەتایە بۆ دروستکدرنی فەرهەنگێکی کەسناسی، کە پێویستە زۆر فراوانتر بێت.
ئەوەی زیاتر وایکرد من کار لەم کتێبەدا بکەم، ئەم خاڵانەی

خوارەوەیە:

١. پێکەوەنانی کولتوورێکی ڕۆشنبیریی ئاشتیخوازانە کە فێرمان بکات، هیچ مرۆڤێک لەو پێگەیە و لەو ناونیشان و سیفەتانەدا کورت و بچووک نەکەینەوە، کە پێوەی ناسراون و بەهۆیەوە لە ڕووی مەعنەویەوە چەوسێنراونەتەوە. دەکرێ زیاد لە گۆشەیەکمان هەبێت بۆ ئەوەی لێوەی تەماشای مرۆڤێک بکەین.

٢. پێکەوەنان و دروستکردنی کولتوورێکی دیمکراتیک بەتایبەتی لە بواری ڕۆشنبیریدا بە ڕەتکردنەوەی هەر حوکمێکی پێشینە لەسەر کەسەکان و لایەنەکان و بیروڕا و ئایینەکان دادەمەزرێ. دیموکراتیزەکردنی بواری ڕۆشنبیریی سەرەتایە بۆ کردنەوەی کۆمەڵگا و ڕۆشنبیریەکەی و دامەزراندنی فرەیی و جیاوازیی. ئەمە ئەو بۆچوونەیە کە لەم کتێبەدا کاری پێکراوە.

٣. ڕەنگە ئەم کتێبە بیەوێت یارمەتیدەرێک بێت بۆ ئەوەی نەوەی نوێ ئاگاداری کۆمەڵێ کەسایەتی و ئەو ڕۆشنبیریی و چالاکیانە بێت، کە ئەم کەسایەتیانە لە چوارچێوەیاندا خەباتیان کردووە.

ڕێبوار سیوەیلی

٢٠١٣



ئاشتکردنەوەی سیاسەت و عەشق

# ئیحسان نووری پاشا:

ئەو کاتەی لە زستانی ئەمساڵدا(٢٠٠٨)، لە شکری تورک دەستدرێژی کردەوە سەر خاکی کوردان، کەس ئەوی لەبیر نەبوو. کەس نەیدەزانی ئەو نیوسەدە زیاتر بەر لە ئێستا، ڕووبەڕووی هەمان لەشکر ببۆوە و بەچاوی خۆی و لە نزیکەوە شەڕانییەتی سووپایەکی دیتبوو، کە لەسەر هەر شتێ هەڵوێستەی کردبا، لەسەر بەلاشەکردنی مرۆڤی کورد، نەیدەکرد. ئەومان لەبیر نەبوو کە چۆن باسی ئەو ئەزموونانەی خۆی بە جوانترین و ئینسانیترین زمان کردبوو، بەبێ ئەوەی ڕق و کینە لە قسەکانیدا بچێنێ و بەبێ ئەوەی وەک سەرکردە خۆ بەکەمزانەکانی ئەمڕۆ، دیپلۆماسیەت و شەرمنیی سیاسی، مافی میللەتەکەی و گەورەیی نەتەوەیی خۆی بیر بباتەوە و لەبەردەم خەڵکیشدا بە دروشمی هەستبزوێن، لێمان بچنە سەنگەرەوە. ئەو زۆر هەوڵیدابوو، لەجیاتی کوشتنی سەربازانی تورک و کورد بە دەستی یەکتر، خۆی و سەرۆک کۆماری تورک

لە مەیدانی جەنگدا ڕووبەڕووی یەکتر ببنەوە. هەر بۆیەشە لە زۆرینەی کتێبەکانی مێژووی سیاسیی کوردا، ناوی هاتووە بەبێ ئەوەی ئەو ناوهێنان و باسانە ببنە هۆی ئەوەی بیناسی. ئەوت نە لە کتێبەکاندا بۆ دەناسرێ و نە لە مەیدانی جەنگ و نە لەناوبانگیدا وەک شۆڕشگێڕ و ڕابەری شۆڕشی ئاگری داغ، لە چیای ئارارات.
ئەو، پێشتر لە سووپای تورکدا بەپلەی بەرزەوە، دژایەتی جەندرمەی عوسمانیی کردووە و پاشان کە بێوەفایی حکومەتی نوێی تورکیای بۆ ئاشکرا دەبێ، پەنا بۆ ئاگر و ڕاپەڕین دەبات و یاخی دەبێ و ئاڵای نیشتیمانەکەی لەسەر چیای ئارارات، هەڵدەکا. ئەو لە دوای کشانەوەی لەشکری تورکان، بەپێچەوانەی سیاسیە دووڕوو و ترسنۆکەکانی ئێستامانەوە، هەرگیز سوپاسی ئەو حکومەتە شەڕانییەی نەدەکرد، چونکە ئەو سەرکردە مەزنە هەرگیز بەرژەوەندی نەتەوەیی میللەتەکەی نەکردە قوربانی بەرژەوەندی گرێبەستی کۆمپانیاکان. لەسەردەمی ئەودا، هێشتا شەراکەتی ئابووری سنووری بۆ ئەخلاقی سیاسی دانەنابوو.
زۆر پێشتر و لە ساڵی ١٨٩٢ لە شاری بەتلیس، لە کۆڵان و ماڵی ئەلی قولی سەر بە تیرەی حسە سووری جبرانی، لە دایک دەبێ. لە ئەرزنجان و ئەستەمبووڵ خوێندنی سەربازی تەواو دەکا، دەچێتە نێو سوپای عوسمانلییەوە، دەچێتە یەمەن و لە جەنگی یەکەمی جیهانی و شەڕی گورجستاندا بەشداری دەکات. بەڵام ئەو دواجار لە «کۆماری نوێی تورکیای مەزن» و پەیمانەکانی بۆ نەتەوەی کورد، بێئومێد دەبێت و پەیوەندیی بە شۆڕشگێڕانی میللەتەکەیەوە دەکات و لەوێشەوە ژیانی پڕ دەبێ لە بەسەرهات و ئاوارەیی و تەنیایی. دواجاریش، مەرگ تاکو دوورترین کوچەکانی غوربەت و تاراوگە شوێنی دەکەوێت و لە تاران، لە کۆڵانێکی نێوان شەقامی

(جمهوری) و (ئینقلاب)دا و لە ماڵێکی کرێنشیندا، یەخەی دەگرێ. ئەو ئێوارەیەی کە دەچێتە دەرێ بۆ پیاسە و شتکڕین، ماتۆڕێک لەو پیاوە ناسک و عاشقە دەدات و ئیتر هەرگیز ناگەڕێتەوە ناو ئەو ژوورەی کە تیایدا، بەپشت سەرییەوە، (درووشمی خۆیبوون)ی هەڵواسیبوو. بەڵام ئەو ئاڵایەی لەسەر ئارارات هەڵیدەکا، ئەمووستیلەکانی پەنجەیی و خەونی سەربەخۆیی بە میرات بۆ دوا ڕۆژ جێدەهێڵێ..

ئیحسان نووری پاشا، یەکێکە لە مرۆڤە زۆر گەورەکانی نەتەوەی کورد. گەورە، بە مانا مەعنەوی و سیاسی و مرۆییەکەی. ئەو هەر لە تافی لاوێتییەوە شەیدای خانمێکی توورک ئەسمەر دەبێ و تا مردن لێی جیانابێتەوە و هەرگیز ناچاری ناکات زمانی کوردی فێر ببێ. ئیحسان نووری لە شۆڕشەکەیدا تێکدەشکێ و دواجار لە باوەش و ئامێزی یاشارخانمدا خۆی دەگرێتەوە. مێژوو فڕێی دەداتە دەرەوە و بە مەرگ و نائومێدی دەسپێرێ و یاشارخاتوون دەیهێنێتەوە ناو ژیان و ئومێدی پێدەبەخشێتەوە. بایەخی چیرۆکی خۆشەویستی و هۆگریی ئیحسان نووری پاشا و ئەم خانمە بەیەکتر، هیچ کەمتر نییە لە بەسەرهاتی خەباتە سیاسیەکەیان. ئەو یەکەمین سەرکردەیەکی کوردە، کە بە خۆشەویستی ئینسانیانەی هاوسەرەکەیەوە دەچەسپێ و لە باوەشی ئەودا چیرۆکە دوورودرێژەکەی خۆشەویستی خۆی بۆ نیشتیمان و کوردەکان دەهۆنێتەوە. من هەرگیز نەمدەزانی سیاسەت و عەشق دەتوانن ئەوەندە تێکەڵ و ئەوەندە بۆ یەکتر پێویست و ئەوەندەش بەیەکەوە جوان بن. بەبێ ناسینی یاشارخانم لە ژیانی ئیحسان نووری پاشادا، لەمانای خۆشەویستی بۆ مرۆڤ و خۆشەویستی بۆ نیشتیمان تێناگەین و لەگەڵ ناسینی ئەو دوو مرۆڤەشدا، هەم بیروڕامان لەسەر سەرکردەی سیاسی لە نمونەی

ئیحسان نووری و هەم لەسەر مرۆڤی تورکی وەک یاشارخانم، بەتەواوی دەگۆڕێ. هەر بۆیەشە لەبۆ ئەوانەی سەرکردەپەرستی خۆیان و عەبدایەتیان بۆ سەرکردەی سیاسی بەبێ ناسینی ڕاستەقینەی کەسایەتێ ئینسانیانەی ئەو سەرکردانە بیناکردووە و، بۆ ئەوانەش کە نیشتیمانپەرستیی خۆیان لەسەر بنەمای ڕقبوونەوە لە نەتەوەکانیتر دامەزراندووە، ئیحسان نووری پاشا و یاشارخانم، دوو قوومبەلەن و بەڕوویاندا دەتەقنەوە. ئەوانەی کە لێبووردەیی لە سیاسەت و مرۆڤ لە ئەخلاق دابڕ دەکەن، بەو هەموو قینەوە، ناتوانن بەرگەی ئەو تەبایی و هەڵکردنە بگرن، کە لە پێکەوەبوونی ڕاستەقینەی مرۆڤانەدا بەرجەستە دەبێ و لەسەرووی هەر سنوورێکی سیاسی و ڕەگەزی و ئایدیۆلۆژییەوەیە.

ئەوکاتەی یەکەم بەرهەمی ئیحسان نووری پاشام خوێندەوە، لە سەفەرێکی دوورودرێژی خۆشەویستییەکی بە ئاکام نەگەیشتوو، گەڕابوومەوە. شکست و دڵشکان و تەنیایی، وەک سێبەرێکی قوورس لێم جیا نەدەبوونەوە. ئا لەوکاتەدا ئیحسان نووری پاشا، بە هانامەوە هات و لە «بیرەوەریەکان»یدا باسی سەرکەوتن و تێکشکانەکان و ئیرادەی خۆی بۆ دەکردم. ساڵ ٢٠٠١ و شوێن پیرە هەولێر و دنیاش گەرم. لەسەر بەرگی کتێبەکەشی وێنەیەکی دوو قۆڵیی خۆی و یاشارخانمی لێدرابوو، کە ساڵەها لەوەدوا زانیم ئەو وێنەیەیان ساڵی ١٩٦٢دا، لە ورمێ گرتووە و ئەو جلوبەرگەی بەریشیان لەو ماڵەی لە ورمێ تیایدا میوان بوون، خواستووە. ئەوان لە ئەستەمبووڵ یەکتر دەناسن و لەوێش وێنەیەک دەگرن، پاشان لە چیای ئاگری وێنەی تر و لە تارانیش چەندانیتر: لە هەموو وێنەکاندا، بە پێچەوانەی چاوەڕوانی زەبری ڕۆژگارەوە، قنج و بڕوابەخۆبوو، سینەیان کەمێ هێناوەتە پێش و دەستیان بۆ دواوە و بزەیەکی

شاراوە لەسەر لێویان. نمونەی دوو ئەڤینداری ڕاستەقینە، کە دوای تێکشکان و پشتڕاستکردنەوە، پێماندەڵێن: (ئەمە ئێمەین پێکەوە). ئەخلاقی عاشقانە، ئەوەیە هەمیشە دەردەکانی خۆی بشارێتەوە تاکو ئەوانیتر لە عەشق بێزار و نامۆ نەبن. عاشقان قوربانین و عەشقەکەیان سەرمەشق. ئەوکاتەش کە وەفدی حکومەتی تورکیا دەچن بۆ ئارارات تاکو قەناعەت بە ئیحسان نووری و هاوەڵە خەباتگێڕەکانی بهێنن بۆ تەسلیم بوونەوە، ئەوان یەک وەڵامیان هەیە: ئێمە دەمانەوێ وەک کورد بژین، نەک کۆیلە. «شەکانەوەی ئاڵای کوردستانی ئازاد». کاتێکیش لە کۆتایی دیدارەکەدا لە خودی ئیحسان نووری پاشا دەپرسن: «بە چ شێوەیەک دەتوانین ڕاستەوخۆ یارمەتیت بدەین؟ ئیحسان نووری لە وەرامدا وتبووی: هاوسەرەکەم ڕەوانەی سووریە بکەن». لەوپەڕی سیاسەتەوە بۆ ئەو پەڕی عەشق و دروستکردنی پردێک لە نێوان ئەرکی نەتەوایەتی و وەفای تایبەتی، لە نێوان ئەخلاق و سیاسەتدا، کە پاشتر لە نەریتی سیاسیانەی سەرکردە کوردەکاندا چ لە ئاست نیشتیمان و چ لە ئاست هاوسەرەکانیاندا بە دەگمەن دووبارە بۆوە.

بیرەوەرییەکانی ئیحسان نووری پاشام وەک دەقێکی دانسقەی سیاسی خوێندەوە کە چاوەڕوان بووم سەرکردەیەکی کورد، تیایدا باسی خەباتی خۆیی و هاوسەنگەرەکانیم بۆ بکات. نمونەی ئەو جۆرە ئەدەبیات و بیرەوەری نووسینە لە ڕاپەڕین بەدواوە ئەوەندە زۆر بووە، کە نەدەکرا چاوەڕوانییەکێ ترم هەبێ. بەڵام هەر زوو تێگەیشتم ئەم کتێبە زۆر تایبەتمەندە و نووسەرەکەیشی تەواو جیاوازە لەو سەرکردانەی کە پێشتر ناسیبوومن و دەبوو بیانناسم. چونکە من ناسینی سەرکردە، بە ناسینی سایکۆلۆژیایەکی کۆمەڵایەتی نەخۆشەوە دەبەستمەوە، کە دواجار قەبووڵی دەکات

سەرکردە ببێتە ستەمکار و جەللاد و ئەو سایکۆلۆژیایەش هەر چەپڵەی بۆ لێبدات. میللەتێک لەسەر ڕیتمی ئەو چەپڵانەی بۆ سەرکردەکانی خۆی لێیان دەدا، قەبری خۆی هەڵدەکەنێ و ڕۆحی خۆبەکۆیلەکردن لەو چاوپۆشینەی میللەتەوە دروستدەبێ، کە لە ئاست هەڵەی سەرکردەکانیدا، نابینای دەکات..

وەلێ بە پێچەوانەی زۆرینەی بیرەوەری نووسەکانی ئەم ڕۆژگارەوە، نووسەری ئەو کتێبە بە ئەخلاقێکی سیاسیانەی بەرزەوە، کە پڕە لە لێبووردەیی و هاوچەشندۆستی، لە وێنەی گێڕەرەوەیەکی مەزندا دەردەکەوێ، کە باوەشی بە دنیایەکدا کردووە و دەیەوێ ڕێبگرێ لە هەڵوەشانەوە و لێکترازان. بۆیە ئەو کتێبە بەر لەوەی کتێبێکی سیاسی بێت، کتێبێکی ئەدەبییە و لەناو ژانرە ئەدەبییەکانیشدا لە ڕۆمانەوە زۆر نزیکترە. وەسفەکانی ئیحسان نووری، پاڵەوانە سەیر و سەمەرەکانی، میتافۆرە زۆر و دیمەن و نۆڕینەکانی لە دیدی سرووشت و بێگیان و پاڵەوانەکانیەوە، خەسڵەتێکی شعریانەی بەرزی پێدەبەخشن:

«لە یەکێک لە ڕۆژەکانی کۆتایی زستاندا بوو. چیای ئاگری کراسە سپییەکەی لەبەر کردبوو. دەتوت کفنی ئەو ژن و منداڵانەیە کە لە بیاباندا سینگی زیوینیان بە نووکی نێزە شەق کراوە. لاشەی زیوینیان ببووە خۆراکی دڕندە و باڵندەکانی کە لە خۆی کۆکردبوونەوە و ئەویش لە ژوور هەورە کەڵەکەبووە خۆڵەمێشییەکانەوە تەماشای کوشتارگایەکی خوێناویی دووری دەکرد و فرمێسکە سپییە درشتەکانی بەسەر زەویدا دەڕژاندن. هاوارە ترسناک و نارێکوپێکەکەکانی، کە لەبەریەککەوتنی بایە توندەکان بە دیواری درزە قووڵ و ترسێنەرەکاندا لە دایک دەبوون و لە گەرووی گیراویەوە دەهاتنە دەرەوە، نەفرەتی لە چەرخی

گەردوون دەکرد».
ئیحسان نووری لەگەڵ ئەوەشدا کە پیاوێکی جەنگاوەر بوو، بەڵام شەیدای شەڕکردن نەبوو. ئەو بەردەوام پێی وابووە دەکرا گفتوگۆ و دانووستان ڕێگە بە دروستکردنی سەنگەرەکان بگرن. هەر بۆیەشە «تەقەی تفەنگ و دەستڕێژی شەستیرەکان»، ئارامیان لەبەر دەبڕی و کاتێ وەسفی ئەو بارودۆخانە دەکا، وەک ئەوەیە لە میانەی باسکردنی ڕژانی بەیانیانەی دڵۆپێک شەونمی پاییزانەوە، باسی ئاخیرەتی بەهاری دنیات بۆ بکات:
«بەیانییەکی پایز بوو. هەوا بە یادی بەرەبەیانیانی بەهار، شەونمەکانی بە زەویدا دەپژاند، چیمەنە ژاکاوەکان شەونمەکانیان وەکو دڵۆپی مرواری و فرمێسک لەسەر ڕوومەتی زەردهەڵگەڕاویان بەرەوخوار خلۆر دەکردەوە. خۆر تازە تیشکەکانی بەرەو زەوی داشکاندبوو، کە چەند تەقە تفەنگێک . بەرز بوونەوە. بەدوای ئەوەشدا دەستڕێژی شەستیرەکان بیسرا».
لە هەناوی ئەم دێڕانەدا وەرسییەکی پڕ لە کۆژانی کوردیانە بەرامبەر بە جەنگە سەپاوەکان و ناچاریی بەرگریکردن لە خۆ، دەبینرێ. ئەم هەموو تێکەڵکردنی هەستە بە شتەکان و زەردهەڵگەڕاوی و شۆڕبوونەوەیە، لە ویژدانی کوردیانەوە نەبێت لە کوێوە دێت، کە بەو پەڕی جوانییەوە ناهاوسەنگیەک لە نێوان بەرزبوونەوەی گوولە و بارینی شەونمدا دروستدەکات؟ ئیحسان نووری پاشا، لە یادگارە ڕۆمانەکەیدا، هیچ کاتێک هونەری جوانکاری گێڕانەوە ناکاتە قوربانیی بیروباوەڕەکانی. ئەو کارێ دەکات سیاسەتمان خۆش بوێ و لە گێڕانەوە سیاسی و سەربازییەکانیدا، حەقیەقەتی جوانیی و هەستی مرۆڤانە نەشارێتەوە. لە بنەمادا ئیحسان نووری پاشا لە سیاسەتی کوردیدا، پەیڕەوکاری نەریتی سیاسەت بۆ ئاشتییە نەک

بەقوربانیکردنی ئاشتی لە پێناوی ئایدیۆلۆژیای سیاسیدا. ئیحسان نووری، وەک ڕەشید نەجیب ئەو دوو کەسایەتیەی کوردن، کە دەکرێ پێیان بگوترێ پێش گاندی، «گاندیانە بیریان دەکردەوە». ئەو لە چاوەڕوانیکردنی لێبووردەیی ستەمکاردا وەڕسیی خۆی لە خەباتەکەی نەدەشاردەوە، چاوەڕێی دەستکەوت نەبوو، نەیدەویست پەیکەری بۆ بکرێ، بەڵکو بەلای ئەو و ئاراراتیەکانی هاوەڵییەوە: «لێبووردن بۆ تاوانباران شایستەیە، بەڵام ئێمە تاوانبار نین. ئێمە مافی داگیرکراوی مرۆیی خۆمان دەوێت، نەک لێبووردن. بەڵکو ئێمە دەسەڵاتی بەخشینمان هەیە».

ئەمەیە خاڵی هەرەگرنگی جیاوازیی نێوان ئیحسان نووری و سەرکردەکانی ئێستامان سەبارەت بە لێبووردەیی و پیشاندانی گیانی برایەتی و سنگفراوانی و ئاشتەوایی: ئەو لە بڕوابەخۆبوونەوە بڕوای بە ئاشتەوایی هەیە و ئەمان لە ترس و شەرمەوە. ئەو بەڕاستی و بە کردەوە لەگەڵ هاوڵاتیانی خۆیدا دەژیا و لە نزیکەوە وەسفیدەکردن، ئەمانەی ئێستا پتر سەرکردەی سەر شاشەن و لە بۆنەکاندا خەڵکیان بیر دێتەوە. ئەو لە دڵدا جێگەی خۆی کردبۆوە، ئەمان لە تەماشادا. ئەو دواجار وەک کرێچییەک، وەک ساکارترین مرۆڤێک، وەک عاشقێک و وەفادارێک، کۆتایی بەژیانی هات و ئەمان وەک ئەو خاوەنماڵە پیرانەی کە لەسەرەتای مانگەوە داوای کرێ دەکەن. ئیحسان نووری پاشا لە ڕووی سیاسیشەوە، پتر لە سەرکردەکانی ئێستا لە ڕۆحی ئێمەوە نزیکە، چونکە ئەو بەر لە چەندین دەیە، بە ئاماژەدان بە ناوەڕۆکی ڕاپۆرتی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر کوردی عێراق و بۆ ڕێزگرتن لە هەستی نەتەوەیی کورد، دەینووسی: «هەستی کوردەکان بەتەواوی مانا کوردانەیە و هیچ ڕەهەندێکی عێراقیانەی نیە»، کەچی ئەمانەی

ئێستا لەم نزیکەوە، ناتوانن شعووری برینداری میللەتی خۆیان لە ئاست عێراقێکدا، ببینن، کە هیچ مژدەیەکی، نەک هەر بۆ کوردەکان، بەڵکو بۆ نەتەوەکانیتریش پێنییە. ئیحسان نووری پاشا لەو دوورەوە چەندە زیندووە و سەرکردەکانی ئێستاش لەم نزیکەوە، چەندە مردوو.

ئەو هەتا مرد لە ماڵێکی بەکرێدا بوو، کەلوپەلی ماڵەکەی بریتبوون لە: بەفرخەرێک، تەلەفزیۆنێک، چەند پارچەیەک قالی، هەندێ مۆبیلیات و شتی دیکەی ئاسایی، لەگەڵ ڕادیۆیەکی بچکۆلەدا، کە بەردەوام لەلای خۆیەوە دایناوە و وەک نەوەی باوکمان چاوەڕوان بووە، ئاخۆ هەواڵەکان چ شتێکی لەسەر چارەنووسی نەتەوەکەی بڵاو دەکەنەوە. ئیحسان نووری بەر لەوەی لە ٢٥ی نەورۆزی ١٩٧٦دا، لە نەخۆشخانەی (سینا)ی تاران، کۆچی دوایی بکا، پێشتر میراتییەکەی خۆی بەمجۆرە بەشکردبوو: ئاڵای نیشتیمان و شۆڕشەکەی بۆ کوردەکان و هەموو داراییەکەشی کە تەنیا بریتیبووە لە هەزار و سەد و پەنجا ڕیالأ، بدرێتە هاوسەرە میهرەبانەکەی: یاشار توکتامش جبرانی، ئەو خانمەی، ئیحسان نووری پاشا توانیبووی لە باوەشیدا سیاسەت و عەشق پێکەوە ئاشتبکاتەوە..

هەولێر ١١-٣-٢٠٠٨

ئەو سەرچاوە پڕبایەخانە لە پشت نووسینی ئەم وتارەوەن:
- بیرەوەرییەکانی ئیحسان نوری پاشا. و. وریا قانع، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠٠١
- ژنرال احسان نوری پاشا. رحیم شنۆیی محمودزادە. چاپخانە ایلیا، تهران؟، ٢٠٠٧
- وقایع ارارات: کاوە بیات. نشر شیرازە، تهران.

هێشتا هیچ کتێبێکیم نەخوێندبۆوە، بەڵام لەڕێگەی بەرهەمەکانییەوە، کە لە گۆڤاری (کاروان)ی هەشتاکاندا بڵاویدەکردنەوە، ناسیم و هەر زوو زانیم یەکێکە لەو نوسەرانەی دەتوانم بۆ پێگەیاندنی خۆم، هانای بۆ ببەم. پێشتر هەندێ بەرهەمیم هەبوو، وەک (تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەگەریی کوردیدا)، بەڵام یەکەم بەرهەمی کە خوێندمەوە و زۆری پێبەخشیم بریتیبوو لە (کوردستان لە ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا)، پاشان (مێژووەکە)ی و (ڕێنیسانس) و ئەو नامیلکەیەی لەسەر ئافرەتانی کورد، نووسی. وەلێ بەبڕوای من ئەو بۆمبایەی لەو کاتەدا تەقاندییەوە و کەسی نەهەژاند، بریتیبوو لەو پێشەکییە شاکارەی بۆ کتێبی (میر)ی نووسی و تیایدا ستایشی هزری مەکیاڤیللی کرد، وەک مژدەیەک بۆ سەرهەڵدانی فەلسەفەی سیاسیی مۆدێرن. من ساڵەها لەوەدوا کتێب و بابەتی زۆرم لەسەر مەکیاڤیللی و هزری سیاسی ئەو

بیرمەندەی ئیتالیا خوێندنەوە، لە وانەی چەند پرۆفیسۆرێکی بواری سیاسەتدا بەشداریم کرد و گوێم بۆ گرتن، بەڵام هیچیان ئەوەندەی مێژوونووسەکەمان نەیانتوانی لە نییەت و گوتاری سیاسیی مەکیاڤیللی نزیک بکەونەوە. ئەو لەوێ، چرایەکی بۆ بیری سیاسیی داگیرساند، کە نادانی هیچ سیاسەتمەدارێکی ئێستای کورد، نەیتوانی بیکوژێنێتەوە. من کە ئێستا بیر لە ڕەوتی سیاسیی ئەو ساڵانەی دوای ئەو نووسینەی مێژوونووسەکەمان دەکەمەوە، کاتێ بیر لەئەو نشووستییە ئابڕووبەرە یەکبەدوای یەکانەی کایەی سیاسی کوردی دەکەمەوە، کاتێ بیر لەو پەیامانەی مەکیاڤیللی دەکەمەوە، کە میری مێژوونووسەکانمان لەو نووسینەیدا بەبیرمان دەهێنێتەوە، یەک ڕاستیم بۆ ئاشکرا دەبێ: سیاسەت لە وڵاتی ئێمەدا لە جەهالەتێکی تاریکدا ئەو ڕووناکاییەی نەبینیوە کە مێژوونووس لە تاریکترین بارودۆخەکاندا هەڵیکردبوو. نەخوێندنەوەی ئەو پێشەکییەی کەمال مەزهەر بە بیر و بۆچوونی هەموو سیاسەتمەدارەکانی ئێمەوە دیارە، ئەوان هێشتا لە حوجرەی سیاسەتی پێش (میر)دان و هەر لەبەر ئەوەشە ئەمان سیاسەت ناکەن. بەڵام ئەمە لە بایەخی ئەو دەقە کەمناکاتەوە و ئێستا لەهەر وەختێ زیاتر پێویستیمان پێیەتی.

کەمال مەزهەر ئەحمەد: بۆ من لە ئەستێرەیەک دەچێ لەسەروەختی کشانا. دیمەنی ئەم ئەستێرانەم لە ئاسمانی ساماڵی شەوانەی گوندەکەماندا زۆر بینیون. من چەندە پابەندم بەو گوندە و ئەستێرە کشاوەکانیەوە، کە فێریانکردم دەبێ بەردەوام سەفەر بکەم و بەدوای پانتایی ئاسمانیی تردا بکشێم، ئەوەندەش زیاتر خۆم بە قەرزداری هەر دێڕێکی ئەم پیاوە مەزنەی کورد دەزانم، کە هەرگیز کوردایەتی بەوجۆرە نەکرد، کە دواجار کوێرم کات و نە لە مرۆڤدۆستیشدا کوردبوونی خۆی بیرچۆوە. سرووشتی ئەستێرەی

کشاو، دروستکردنی پەیوەندییەکی ڕووناکە لە نێوان دوو پنتی تاریکدا و پاشان دیار نەمان. کەمال مەزهەر بەهەر بەرهەمێکی کە خوێندبێتمەوە، چرایەکی بۆ هەڵکردووم و تا بەرهەمێکی دیکەی، نەمدیوەتەوە.

من، هەرگیز لە نزیکەوە بە خزمەتی نەگەیشتووم، لەبەرهەمەکانی ئەودا، جگە لە مێژوونووسێکی دیدەفراوان، بیرمەندێکی لێبووردە و ڕیوایەتگەرێکی سەرنجڕاکێشم ناسیوە. من بەخوێندنەوەی بەرهەمەکانی ئەو، بە پیاسەکردن بە ناو ڕستە و دەربڕینە ڕوونەکانیدا بەردەوام هێمن بوومەتەوە. ئەو لەسەر زۆر کارەسات و قۆناغی مێژوویی خوێناوی نووسیوە، بەڵام لێوانلێو لە هێمنی و بەدوور لە گرژی و هاندانی خوێنەر بۆ توندڕەوی. پرۆسەی خوێندنەوەی نووسینەکانی ئەم پیاوە بڵندە، جگە لەو زانیارییە زۆرە فرە دەنگانەی لە سەرچاوە زۆرەکانییەوە، پێمی بەخشیوە، بەردەوام هاوشانیش بووە بە ڕاهێنانێکی ڕۆحی و کاریگەریی بۆسەر ناخم. من لە ئەنجامی خۆ تەسلیمکردن بە هەزاربەهەزاری گێڕانەوەکانی، هەرگیز هەستم بە نادڵنیایی نەکردووە و بە تووڕەیی و بوغزەوە لێان نەهاتوومەتە دەرەوە. نووسەری مەزن لە عەوداڵبوونیدا بۆ گەیشتن بە حەقەیقەت، پتر پێویستی بە خستنەڕووی بەڵگەی عەقڵانی هەیە، تاکو هاندان و چاوبەستکردن.

لە سلێمانیی هەشتاکاندا، لە تەنیاییە خوێناوییەکەی شەوانی بەعسدا، ئەوم ناسی و هەرگیز لە نزیکەوە نەمبینیوە: بەڵام ئەودەم بە خوێندنەوەی کتێبی: (کوردستان لە ساڵەکانی..)، تێگەیشتم دەیەوێ ئەو دەستە ئاشکرا بکات، کە کورد لە هاودەردەکانی دابڕ دەکات. ئەو بەر لەوەی بیەوێ پاساو بۆ ڕۆڵی کورد لە کوشتاری ئەرمەندا بهێنێتەوە، مێژوویەکی هاوبەشی بۆ ئەرمەن و کوردەکان نووسییەوە:

مێژووی هاودەردی و بەقوربانیبوونی هاوبەش. ئەو، لەو کتێبەدا زیاتر ئەرمەنییە تا کورد، بەڵام کوردبوونەکەی مرۆڤدۆستی و هاوچەشندۆستی لێدەباری. من ڕۆژگاریٚ ئاواتم دەخواست ئەم بیرمەندە مەزنە بەو زمان و گێڕانەوەیەی شاکارێکمان بۆ بنووسێ لەسەر (گاندی) و ئێستاش ئاواتم ئەوەیە خودا لە عومری من هەڵگریٚ و بیخاتە سەر هی ئەو، بەڵام بەو مەرجەی ئەوەندەم تەمەن بمێنێ کە گاندییەکەی بخوێنمەوە..
نەوەی نویٚ بەبیٚ خوێندنەوەی بەرهەمەکانی ئەم مرۆڤە، بەشێ لە ناسنامەی خۆی بۆ نادۆزرێتەوە، کە لە مێژووی هاوبەشدا بۆی پاراستووین. من زۆر بەدەگمەن نووسینێکیم خوێندۆتەوە، کە تیایدا خۆی بە بڕیاری پێشینەوە بەستبێتەوە، ئەو نەرێتخواز نیە و نەرێتشکێنە، بەڵام دوای توێژینەوە و ڕامان. لە چنینی دەقەکانیدا، لە ڕستەبەندی و تێکهەڵکێشانی بابەت و هێنانەوەی گوتەزای کەسانیتردا، ئەوەندە کارامەیە کە خوێنەر وا هەستبکات لە یەک کاتدا دەقێکی مێژوویی بە دیدێکی ئێستاتیکیانەی بەرزەوە دەخوێنێتەوە. مێژوو بۆخۆی بەدوای ڕاستیدا وێڵە، بەڵام هەرگیز ڕەهەندی ئێستاتیکی لە نووسینەوەی مێژوو بە زمانی ئێمە، دابڕ نەبووە: میر شەرەفخان بۆخۆی دەستپێشخەری یەکەمە، ئەم ڕەوتە لەلای گەورە مێژوونووسانی وەکو: ئەمین زەکی بەگ و حوسێن حوزنی و عەلائەدین سەجادی (لە مێژووی ئەدەبەکەیدا)، بەردەوامی وەرگرتووە، بەڵام بەرجەستەکردنی ڕاستی بە زمانێکی ئێستاتیکیانە، هونەری کەمال مەزهەر ئەحمەدە.
بەڕاستی خۆبینینەوە وەک خوێنەری بەرهەمەکانی ئەم مێژوونووسە، خۆبینینەوەیەکی چێژبەخشە: بەپێچەوانەی زۆربەی نووسینە ئەکادیمیە وشکەکانی زانکۆکانی کوردستان، مێژوو لەسەر زاری

ئەم حەکایەتخوانە ئەوەندە تەڕدەبێتەوە، کە مەلەکردن تیایدا زۆر خۆش بێت: ئەو لە لاپەڕە جیاوازەکانی مێژووی کوردا، هەر جارەی دەمانباتەوە بۆ لای نیشانەیەک، کە لە شێوەبەخشین بە شوناسی ئەم نەتەوەیە گرنگیی تایبەت بەخۆیان هەیە..

من بە منداڵی لە شەوانی گوندەکەی خۆماندا: (بارێی بچووک)، ئەستێرەی کشاوم زۆر بینیون. سرووشتی ئەستێرەی کشاو، جگە لە جوانییە پڕ جموجووڵەکەیان، بریتیە لە ڕووناککردنەوەی نێوان دوو پنت. مێژوونووسەکەمان هەمیشە لە نێوان نەزانییە زۆرەکانم و بەخشینە مەزنەکانیدا، چرایەکی گەشی بۆ هەڵکردووم. چرایەک، کە ڕووناکاییەکەی لە ڕۆحی گەورەی مرۆڤێکەوە دێت، کە پڕە لە سنگفراوانی و متمانە و هاوچەشندۆستی..

٢٠٠٨/١/١

چەنــد جارێک و لــە چەند قۆناغێکی تەمەنمدا شــیعرەکانی هێمن و بەتایبەتــی ئەو پێشــەکییەی کە بۆ (تاریــک و ڕوون)ەکەی بەناوی (لەکوێــوە بۆ کــوێ؟)، نووســیویەتی، خوێندۆتــەوە. یەکەمجار کە خوێندمــەوە، کەمــێ ئەو پیاوەم زیاتر ناســی کــە ناوێکی دوور و درێژی هەبوو: (ســەید موحەمەد ئەمینی شێخەلیسلامی موکری) و دواجار وەکخۆی دەڵێ: شــاعیری ئەو ســوبۆ ئەو پیاوە هەیە، ئەو نــاوە دووروودرێــژەی لە کــۆڵ دەکاتەوە و دەیکاتــە (هێمن)، بەڵام هێمنی ناکاتەوە.

هێمن لە ســەردەمێکی زۆر جەنجاڵــدا ناوێک بۆ خۆی دەدۆزێتەوە تــا کەمێ ئــارام بێتەوە. بەڵام دواجار ئەو نــاوە ئەوەندە بەناوبانگ و کاریگەر دەبێ و یاســاخ، کە خاوەنەکەی شاربەدەر و قاچاخ بکا. ناو، زۆر جار نەک قەدەری مرۆڤ دەستنیشاندەکات، بەڵکو بۆخۆی شــێوەژیانێک بەسەر تاکەمرۆڤدا دەســەپێنێ، کە تەواو پێچەوانەی

مانای خۆیەتی. من مرۆڤی زۆرم ناسیون ناویان بەختیار، شاد و خەندە بووە و کەچی لە ژیانی خۆیاندا زۆرکەم بەختیار و شادمان و خەندەدار بوون. هێمن پیاوێکە لە خۆشەویستی ژندا ناکام، لە پێگەی کۆمەڵایەتی و سامانداریدا: بێتەماع و لە ژیاندا تاسەر ئێسکان لادێ پەرست: (خەڵکی کانگای وەفا) و لە خۆشەویستی بۆ شیعر و نیشتماندا: پادشا و لە دەرد و ئازارچەشتنیشدا: ئەییووبێک بوو. بەڵام هەرگیز چێژی لە ئازار نەدەبینی:

*ستەمکاری منی دوور خستەوە لەو یارە شیرینەم*
*ئیتر من چۆن ڕقی زۆرم لە ئازار و ستەم نابێ؟*

کە دڵنیام ئەگەر لە ئێستا و لەگەڵ ئێمەدا بژیابایە، لەو هاوشارییانەی زیاتر ڕێزمان لێنەدەگرت، کە لە وڵاتی خۆیاندا کردوومانن بێگانە. باش بوو هێمن بەر لەو نامۆبوونە کۆچی دوایی کرد، کە ئازادی و نیشتیمان و دیموکراسیەتی درۆزن، دروستیدەکەن. وەلێ ئەو زمانێکی غەریبانەی بۆ هەموو هاوشاری و هاونیشتیمانیەکانی خۆی بەجێهێشت، کە پاشتر لە وڵاتی خۆیاندا، بە دەردی هێمن چوون:

*خەم ڕەوێنێک لێرە من ناکەم بەدی*
*چۆن پەنا بۆ مەی نەبەم ساقی ئەدی!؟*
*نابینم ناسیاو و دۆست و یاری خۆم*
*ڕوو لە هەر لایەک دەکەم نامۆیە بۆم.*

شیعری هێمن، هەم شیعری دڵێکی ناسک و هەم شیعری مەسەلەیەکی ئینسانی و نەتەوایەتی گەورەیە. هەم بۆنی هەناسەکانی هێمنیان لێدێت و هەم ڕەنگی نائومێدی و هیوای سەرکەوتنەکانی نەتەوە:

*چۆن نەناڵێ ئەو دڵەی پڕ هەستی من؟!*
*چۆن لە ئەژنۆ بینەوە دوو دەستی من؟!*

*شـیوەنی مـن شـیوەنی ئینسـانیە*
*بانگـی ئـازادی و گـرۆی یەکسـانیە*
*شـیوەنی مـن شـینی کـوردی بێ بەشـە*
*ئـەو گەلەی حاشـا دەکەن لێی و هەشـە.*

هێمن لە بنەمادا شاعیرێکی پەرتەوازەیە، شەپرێوە، نائارامە و دەڵێی مێـژوو وەک مورتازێکـی هیندۆسـی بە زۆر مەحکومـی کردووە، لەسەر سەدان نووکی تیژی (شە)یەک ڕابکشێ بە بێئەوەی بیەوێ، یان بخوازێ وەڕسـیی و کۆڵنەدانی پێـوە دیاربێ. لە ئەنجامی ئەو هـەدادان و سـەبرە ئەییـووب ئاسایەشـەوە، هێمن هەمـوو گیانی و سـەراپای ڕۆحـی کـون کوون بـووە. ئەو مێژووی ئینسـانێکی بریندارکـراو، بێنازکراو، دڵشـکێنراو، لە قومارا دۆڕاو بەرجەسـتە دەکات. کاتێکیـش قومارکەران لە ئاوارەییدا وێڵی دەکەن، ئەو تەنیا یادوەری خۆی بەدەستەوە ماوە. بۆیە وەک منداڵێک دەیەوێ خۆی ژێر بکاتەوە و بەیادهێنانەوە و چەپککردنی پنجی گیا و گوڵە نێرگز و وەنەوشـەی لێرەوارانی کوردستان و دانانیان لەسەر برینەکانی، ڕۆحی خۆی هێور دەکاتەوە. ئەوەندە نیشتیمان و مرۆڤی وڵاتی خۆی خۆشدەویست، کە دەیتوانی بەئاسانی «هەموو باغی بەهەشتی خودا بکاتـە قوربانی ئەو کچە لادێییەی کە بۆ نوێژ ڕادەخا بەرهەڵبێنێ». ئامادەیی ئەو هەموو گژ و گیا و ناوی ڕووەک و گوڵ و کانیاوانە، ئەو هەموو ئەشـکەوت و زەندۆڵ و پەسـێوانە، ئـەو هەموو لێڕ و چڕ و بەسـتێن و چۆمانە، لە شـیعری هێمنـدا، ئاماژەیە بەوەی کە ئەم شـاعیرە هەسـتێکی قووڵی هەبوو بەرامبەر بە سـتەمکاری و داگیرکردن و پەرتەوازەیی و لەو ڕێگەیەشەوە دەیویست پانتاییەک دروستبکاتەوە، کە بۆنی نیشتیمان و قەڵەمڕەوێکی خۆمانەیی لێبێت. ئەو بەیانکەری جوانیناسی شکستە لە شیعری ئێمەدا. هێمن دەیویست

لە ڕێگەی ئامادەکردنەوەی زۆرترین شستگەلێ کە پەیوەندییان بە کوردستانەوە هەبوو، تەقەڵ تەقەڵ پارچە لەتوپەتەکانی ڕۆحی خۆی و پەرتەوازەییەکانی خۆی بدووریتەوە. لێرەشەوە زۆر لە جودایی و دابڕان و دوورکەوتنەوە دەترسا و لە ئاستی جوداییدا زمانی دەشکا، بۆیە دەینالاند. ناڵین دۆخێکی زمانە، کە تیایدا زمان مانا ڕۆژانەییەکانی خۆی لەدەست دەدات و دەبێتە زمانی ئازار و دەردی پەتی. ناڵەی جودایی، ناڵەی مرۆڤێکە لە دەمی ڕۆچوونیدا بەناو تاریکاییەکدا کە دەیگەیەنێ بە جودایی و ئەویش نەیدەویست جودا بێت. ئەو دەیویست لە نێوان (تاریک و ڕوون)ی ژیاندا، بەشی ڕووناکی بەرکەوێ.

*نابێ قەت ناڵەی جودایی بێ ئەسەر*
*جا چ نەی بیکا، چ پیاوی دەربەدەر*
*بۆیە ناڵەم تێکەڵی نەی کردووە*
*شیوەنێکم پێیە، نەی، نەیکردووە.*

چەند ڕەهەندێک لە شیعر و ژیانی هێمندا هەن، کە وێکچوونێکی سەرسووڕهێنەری لەگەڵ مرۆڤی کیاکەگۆردی، فەیلەسووفی دانمارکیدا بۆ دروستدەکەن. ئەو فەیلەسووفە، کە بۆخۆی لەتوپەتبووی سەردەمێکی دڵڕق بوو، ئەزموونی ژیانی مرۆڤ دابەشدەکاتە سەر سێ قۆناغ، یان پلەی ژیان، کە بریتین لە قۆناغی: ئێستاتیکی، قۆناغی: ئەخلاقی و قۆناغی: دینی. هەریەکێ لەم سێ قۆناغە جۆرە شێوازێکی ژیانکردن بۆ تاک دیاری دەکەن و هەریەکەیان پەیڕەوکار و بەرجەستەکەری فەلسەفەیەکی ژیانن. لە قۆناغی ئێستاتیکیدا، چێژ و ئارەزووپەرستی و گەڕان بەدوای حەزە هەنووکەییەکاندا دەبێتە خولیای سەرەکیی تاک، بەبێ ئەوەی بیر لە داهاتوو بکاتەوە. ئەو ئارەزووپەرستیە تاک لەتوپەت دەکات

و دواجار تەنیا و وەڕسی دەکات، سەرەتا لە دنیای دەوروبەری و پاشان وەڕس دەبێ لە خودی خۆی و ئەمەش سەرەتایە بۆ خۆوێرانکردن و لەدەستدانی ژیان. لە قۆناغی ئەخلاقیدا، تاک هەموو وزەی خۆی لە ئامانجێکی ئەخلاقی و وەئەستۆگرتنی دەروەستی و بەرپرسیارێتیدا چڕ دەکاتەوە. تاک لەم قۆناغەدا هەردەم لەگەڵ مەرگدا دەستوپەنجەی نەرمدەکات و هەر ڕۆژەی بەو جۆرە دەژی کە دوایین ڕۆژی ژیانیتی. لە قۆناغی دینیشدا، تاک ئەو بەرپرسیارێتیە، لە بەرپرسیارییەوە بەرامبەر بە ژیان و خودی خۆی، هەڵدەگێڕێتەوە بۆ بەرپرسیارێتی و دەروەستی لە ئاست خودا دا و ئەو دەکاتە ئامانجی خۆی..

هێمن هەر زوو لەژێر هەلومەرجەکانی ژیان و بە ئارەزووی خۆی قۆناغی ئیستاتیکی و ژیانێکی ڕووت و ڕواڵەتپەرستی، جێدەهێڵێ و لە ئاست خودی خۆی و ئەوانیتردا خۆی بەرپرسیار دەکات. لە قۆناغی دواتریشدا ئەو بەرپرسیاریەتیە لە بەرپرسیارییەوە بەرامبەر بە خودا، هەڵدەگێڕێتەوە بۆ بەرپرسیاری و دەروەستی لە ئاست کێشەیەکی ئینسانی و مرۆییدا، بەمجۆرەش لەلای هێمن، نیشتیمان جێگەی خودا دەگرێتەوە.

بۆ یەکەمجار ناوی هێمنم ئەوکاتە بەرگوێ کەوت کە هێشتا لە کۆڵان بەدوای تایەی عەرەبانەدا ڕاماندەکرد. شوێنی چەقاوەسووییمان سەر سەدەکەی مەجید بەگ بوو، لە سلێمانی. ساڵەکەم بیر نییە، بەڵام ئەو ڕۆژەی بەدوای پێچکەی گارییەکدا، کە بەهۆی پارچە تەلێکەوە پاڵمان پێوە دەناو بۆخۆشمان کە هێشتا پاتەی لاستیکی گوندمان لە پێدا بوو، بەدوایدا ڕاماندەکرد، بۆ یەکەمجار ناوی (هێمن)م هاتە بەر گوێ. لە قوتابخانەی ئەمین زەکی بەگ ڕەتماندابوو، گەیشتبووینە لای ئەو دیوارەی کە ئێستا بینایەی کۆلێژی زانستەمرۆییەکانی

زانکۆی سلێمانیە. ئەوسـا ئەوێ گۆڕەپانێکی قوڕاوی بوو. دیواری زانکۆ لە خوارتر و بینیمان خەڵکانێکی زۆر بەمدیوی دیوارەکەدا و ڕوو لە مەیدانی زانکۆ، خۆیان هەڵواسیوە. دیمەنێکی سەرنجڕاکێش بوو. برسـیمان نەبوو، وەلێ وامانزانی شتێ لەوێ دابەشدەکرێ و بەپەلـە خۆمـان گەیاندێ و چەپ و چیڕ، دوای ئـەوەی تایەکانمان لە ملمانکرد و تەلی لێخوڕین بەدەسـتمانەوە، بەدەسـتەکەی ترمان لەنـاو ڕیزی ئەوانەی خۆیان بە دیوارەکەوە هەڵواسـیبوو، بەدیوار هەڵگەڕاین و پرسیمان ئەوە چییە؟

هێمن شیعری دەخوێندەوە. هێمن چەپڵەی بۆ لێدەدرا و ئەو شتەش کە دابەشدەکرا و دەشیا وەریبگرین، سۆزی بێبڕانەوەی شاعیرێک بوو، کە سـاڵەها لەوەدوا زانیم نیشـتیمانێکی بـە کوڵەوەیە. نازانم چەندە بەوجۆرە ماینەوە، بەڵام بۆ ئێمەی منداڵ ئاسـان نەبوو زۆر لەو شـوێنە سـەختە بمێنینەوە. ساڵانیتر، لە شـوێنیتریش شیعری هێمنـم بەرگوێ کەوتن. حەمەجەزای گۆرانیبێژ، ناڵەی جودابیەکەی بەسـۆزەوە خوێندبـوو، وەلـێ هیـچ سـۆزێ نەدەگەیشـتە دەنگە تەڵخەکـەی هێمـن خۆی. نامۆیـی و خەم ئەوەنـدە ڕۆحی هێمنیان پێکابوو، کاتێ ئەو ڕۆحە دەیویسـت لە زیندانی جەسـتە ماندوو و پیربووەکەی بێتەدەرێ، لە خێزەی سـنگی منداڵێکی سـەرما بردەڵە دەچوو. لە ڕاستیشدا هێمن هەتا ما، ڕۆحی منداڵانەی خۆی لەدەست نەدا، ئەگەرچی سـەردەمی پیریی ئەو تـا دەهات ئەوەندە پیاوانە و نێرانـە و توندوتیـژاوی دەبوو، کە ئیدی بە ئاسـانی ڕێگەی نەدەدا ڕۆحێکی جوانپەرست و منداڵانە و ئەییوبیانە تیایدا بمێنێتەوە..

هێمن لەسـەردەمێکدا ژیا کە ئەو نەقشی مرۆیانەی خۆی تێدا بینی، بەڵام ئەو هەرگیز سەردەمەکەی خۆی نەژیا، ئەو ژیانی ڕاستەقینەی هەڵگرتبوو بۆ ڕۆژگارێک کە تیایدا بە ئازادی ڕاستەقینە بگات. هێمن

خەونی خۆشـــی دەبینیــن، خۆزگەی زۆری هەبــوون و ئارەزووی فڕینی دەکرد. ئەو مرۆڤ بوو بە هەســتیارییەکی قووڵەوە، گەلێکی ڕۆژگاری تاڵ و شیرین ڕابواردبوو، دەیویست کەرامەتی ئینسانیانەی خۆی و ڕەگەزەکەی لە سەوداپەرســتی ڕۆژگار قوتار بکات، بەڵام هەردەم ئەم پرســیارەی لە زەیینــدا بوو: ئاخۆ مەرگ مەودای دەدا ببینێ سەردەمێکی تر؟

ئێمــە لەوســەردەمەدا دەژیــن کە هێمن خۆزگەی بۆ دەخواســت و پرســیاری لەبــارەوە دەکرد، بــەڵام لانیکەم دەتوانیــن بەدڵنیاییەوە بڵێین: ئەو سۆزە مرۆییەی ئەو لەم سەردەمە لیخن و دووڕووییەدا هێمنیان دەکوشت. هەروەکو چۆن شیعری ڕاستەقینەشی کوشتووە. هێمن نەیدەتوانی بەو ڕۆحە ئەییوبییەوە، بەو مووچەیەی نووسەران بژی، کە دواجار بڕییان..

ئەگەر ئەو بۆچوونە ڕاست بێت کە دەڵێت: کتێب پەنجەرەیەکی ترە بۆ ئاشنا بوون لەگەڵ جیهان، ئەوە لە دایکبوونی ئێمە و ئاشنا بوونمان بە جیهان و ژیانمان لە ناو جیهاندا، لە خوێندنەوەی یەکەم کتێبەوە دەستپێدەکات. بە مانایەکی تر: ئێمە کاتێک لەدایک دەبین لەڕووی بایۆلۆژییەوە دێینە ناو جیهانەوە، بەڵام ئەوە یەکەم کتێبە کە ئێمە بە جیهان ئاشنا دەکات و ژیانمان پێدەناسێنێ. لەم تێڕوانینەوە ئێمە چەندە کچ و کوڕی دایک و باوکمانین لە ڕووی بایۆلۆژییەوە، ئەوەندەش لەڕووی ئاشنابوونمان بە جیهان، ئەوەی مرۆڤێکین کە یەکەم کتێبی ژیانی زۆربەمان لەبەرهەمی خامەی ئەوە: (ئیبراهیم ئەمین باڵدار) ناوی ئەو کەسەیە و کتێبەکەیشی: (ئەلف و بێ ی نوێ)یە. ئەلف و بێی نوێ بەرلەوەی ئەلف و بێی نوێی زمانێک و کەلتوورێک بێ، ئەلف و بێی نوێی ئاشنابوون بە جیهانێکە و دەروازەیەکە بۆ هاتنە ناو ژیانێکی منداڵانەوە. بۆیە

خوێندنـەوەی ئەم کتێبە بەبـێ ئەو هەسـتیاریە منداڵانەیە کارێکی وشـک دەردەچێت و پێویسـتە لـە هەمـوو خوێندنەوەیەکـی ئەم کتێبەدا، بەشـێ لە ئیشـکردنمان بریتبێ لە گەڕان بە دوای منداڵیی لەدەسـت دەرچووی خۆماندا، منداڵییەک، کە بۆی هەیە نیشانەکانی لەنـاو لاپـەڕە ڕەنگاوڕەنگەکانی ئەو کتێبەدا پارێـزراو بن، دەنا لە هیچ شوێنێکی دیکەی ئەم جیهانەدا پاشماوەیەکی لێ بەجێ نەماوە. ئەگەر وەک داهێنان تەماشای کتێبەکەی باڵداری نەمر بکەین، ئەوە ئـەم کتێبـە لـە ژیانی مرۆڤـی کـوردا هەمـان گرنگیی هەیـە، کە سـاتەوەختی ئـادەم هەیەتی لـە ناولێنانی بوونەوەر و شـتەکاندا. بەمانایەکی تر، ئەگەر شتەکان و بوونەوەرەکان لەو کاتەوە بوونی خۆیـان بەدەسـت هێنابێت، کە ئـادەم لە پۆلی یەکەمی سـەرەتایی ژیانـی خۆیـدا ناوی بـۆ دۆزینـەوە، ئـەوە بوونی ئێمە لـە ژیانی خۆماندا ئەو کاتە دەسـتیپێکردووە، کە کتێبەکەی باڵدار دەروازەی جیهانمان بەسـەردا دەکاتـەوە و شـتەکان و بوونەوەرەکانمان بۆ نـاو دەنێت. کردەی باڵدار لـە ژیانی ئێمەدا، کردەیەکی داهێنەرانەیە کـە دەیەوێـت بە (ئەلـف و بێیەکی نوێ) لە جیهاندا لـە دایکببین و ژیانمان پێ ئاشـنا بکات. کردەی داهێنەرانە هەمیشـە پێویسـتی بە زمانێکـی نـوێ و ئەلـف و بێیەکـی نـوێ هەیە، بێگومـان ئەلف و بێیەکـی نوێ لەبەرامبەر زمان و ئەلـف و بێیەکی کۆندا، کە چیدی ناتوانێـت ببێتـە پرد لەنێـوان ئێمـە و جیهاندا. ئەو کەسـانەش کە هەڵدەسـتن بە داهێنان، واتە بە ڕزگارکردنی ئێمە لە زمانێکی کۆن و کۆچپێکردنمـان بـەرەو ئەلـف و بێـی زمانێکـی نـوێ، هەڵگری خەونی فڕین و دەربازبوونن و چارەنووسیشیان بەپێی لێکدانەوەی (گاسـتۆن باشـلار) بۆ ڕەگەز و توخمە پێکهێنەرەکانی سرووشت: (ئاگر، خاک، ئاو، با)، دەچێتەوە سـەر ڕەگەزی (با). لەلای باشـلار

توخمە سرووشتیەکان ڕەنگدانەوەیەکی قووڵ و پڕ مانایان لە ژیانی مرۆڤدا هەیە و داهێنەریش ئەو کەسەیە، کە سرووشتی داهێنانەکەی لەگەڵ خەسڵەتەکانی یەکێک لەو توخمە سرووشتیانە بگونجێنێ. ئیبراهیم باڵدار، چ لە ناوەکەیدا و چ لە داهێنانەکەیدا، هەڵگری خەسڵەتەکانی (با)یە. خەیاڵی ئەو، خەیاڵە لەسەر بنەمای سرووشتی (با)وە دروستبووە و یەکێک لەو وێنایانەی ڕەگەزی (با)ش لە زەینی مرۆڤدا دەیانسازێنێ، خەونی فڕینە. هەوا ئازادییە و ئازادبوونیش جۆرێکە لە فڕین و خۆ گواستنەوە لە شتێکی کۆنەوە بەرەو شتێکی نوێ. لە شوێنێکی ئاشناو دیارەوە بۆ جێگەیەکی نائاشنا و نادیار، تاکو لەوێ سەر لە نوێ ژیان دەستپێبکاتەوە. (ئەمەیە سیحری سەفەری تۆی گوڵالەسووره لەسەر پشتی (با) بۆ ناو بەینی دوو تاشە بەرد!). لەبەر ئەوە ئەلف و بێی نوێ زمانی خوڵقێنەرێکە، دەیەوێ لە کۆنەوە بمانگوێزێتەوە بۆ دنیایەکی نوێ، لە شوێنە بەرتەسکەکانی واقیعەوە بۆ کەلێن و قوژبنە فرەمەوداکانی خەیاڵ، بۆ ناو ئازادییەکی فراوانتر.. سەیر نیە کە ئەرکی ئەو گواستنەوە و فڕینە لە داهێنان و کردەی خوڵقێنەردا، یاخود لە کردەیەکدا کە نزیکە لە کردەی یەزدانیەوە، بە زمان سپێردراوە. واتە زمان کراوەتە پردی پەیوەندی و خوڵقێنەر لە ڕێگەی ئەلف و بێ و ووشەکانەوە پەیامی خۆی ئاراستە دەکات. زمانیش هەڵگری هەموو ئەو پەیامانە بووە، کە لەلایەن داهێنەرەکانەوە ئاراستەی مرۆڤ کراون و وشەکان کلیلی کردنەوەی دەرگاکانی جیهان بوون: (ووشەکان سەرەتا بوون) وەک لە تەوراتدا هاتووە. ئەو جیهانەی باڵدار لە ڕێگەی ئەلف و بێ نوێکەیەوە دەرگاکەیمان بەسەردا دەکاتەوە، ڕاستە جیهانێکە کەسمان تیایدا نەژیاوین و کەسمان لە قارەمانەکانی ناوی

نەچووین، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە ئەو کتێبە خەیاڵی هەموومانی بزواند تا هەوڵبدەین، تا ژیانی خۆمان لەو ژیانە ڕەنگاوڕەنگە نزیک بخەینەوە کە لە (ئەلف و بێی نویٚ)دا هەیە. لە ڕاستیدا ژیان بۆ منداڵەکانی ناو کتێبەکەی باڵدار، لە چاو ئەو ژیانەدا کە ئێمە منداڵیی خۆمانی تیا ژیاین، ژیانێکی نمونەیی و یۆتۆپیاییە. ئێمە کەسمان لە منداڵیماندا جلوبەرگی وەک منداڵەکانی ناو جیهانی ئەلف و بێی نوێمان لەبەردا نەبوو، وەلیٚ خۆزگە خواستن بۆ لەبەرکردنی ئەو جلوبەرگانە، بوو بە خۆزگەی ناو سەرە بچکۆلەکەی هەمووومان. درەخت و میوە و سەگ و دۆ و دادە و پشیلە و ڕیشۆڵە و مامۆستا و باوک و ماڵ و یارییەکانی ناو ئەلف و بێی باڵدار، هیچیان لەو درەخت و میوە و سەگ و پشیلە و ڕیشۆڵانە نەدەچوون، کە لەژیانی ئێمەدا هەبوون. هەروەها بە ڕێکەوت دادە و باوە و مامۆستاکانی ناو ژیانی خۆمان هێندەی ئەوانەی ناو جیهانی ئەلف وبێی باڵدار، میهرەبان بوون، بەڵام جیهان و شت و کەسەکانی ناو کتێبەکە نمونە و خۆزگەیەک بوون لەبەر دەممانـدا. ئەو کتێبە فێری نەکردین چۆن جیهانی خۆمان بناسینەوە، بەڵکو جیهانی خۆمانی لەلا نامۆکردین چونکە هیچ شتێکی، تەنانەت ڕەنگی سەوزایی چیا و ڕەنگاوڕەنگیی تۆپ و پەپوولەکانیشی لە هی جیهانی خۆمان نەدەچوون. کەواتە ئەم کتێبە بەجۆریٚ لە جۆرەکان فێری کردووین بە دوای جیهانێکی ئەڵتەرناتیڤدا بگەڕێین و لێرەشەوە یەکێک لە ئامانجە پەروەردەییەکانی خۆی پێکاوە کە بریتیە لە ڕۆشنەنگەرکردنی مرۆڤ و هاندانی بەرەو دۆزینەوەی دنیایەکی تر، جیاواز بێت لەوەی تیایدا دەژی. ئەم کتێبە لەوێدا جەوهەری پەروەردەییبوونی خۆی ئاشکرا دەکات، کە نەک هەر تەنیا منداڵیی ئێمەی دنە دا بۆ

خوێندنەوە، بەڵکو هانیشـیدابن تیایـدا بژین وەکو جیهانێکی جیاواز لـە واقیعـی دەوروبـەری خۆمـان. (هەمـوو لـە بیرمانـە کاتێ لە قوتابخانـە دەگەڕاینـەوە، بە هەڵمی پەنجەرەکە دەماننووسـی: دارا دوو داری دی!) و ئیدی لە شوێنی ئەو پیتانەوە کە ئەو ڕستەیەمان لەسـەر هەڵمەکە پێدەنووسین، تەماشای دنیای دەرەوەمان دەکرد. بـە مانایەکـی تر: ئەگەر ئـەم کتێبە بە تێڕوانینی باڵـدار بۆ ژیان و بوون لەقەڵـەم بدەین، ئەوە دەتوانین هەوڵـە داهێنەرانەکەی باڵدار لەچەنـد تەوەرێکـدا بخەینـە بەربـاس. واتـە ئەگـەر ئـەم کتێبـە پەنجەرەیـەک بێـت بۆ ئاشـنابوون لەگـەڵ جیهان، ئـەوە جیهانی پێشنیارکراوی باڵدار، بەشێوەیەکی زۆر پەروەردەییانە و لە ئاستی دەرککردنـی منداڵ بـۆ ماناکانی ژیان، ئەم خەسـڵەتانەی هەیە کە هەوڵـدەدەم لێرەدا بـە کورتی بەرهەمیـان بهێنمـەوە و تەئویلیان بکەم: یەکەم: بوون لە جیهاندا لە لای باڵدار، ژیانی ناو سرووشـت دەگرێتـەوە. بە خۆڕایی نیـە یەکەم وانەی ناو ئەم جیهانە بریتیە لە ئاشـناکردنی منداڵ بە (دار). هەڵبەت دار وەک نوێنەری سرووشت و پاشـانیش وردە وردە ئاژەڵ و باڵندە و چیاکانیش وەک بەشـێک لە سرووشـت دەناسـێنێ و مەودای دەرککردنـی منداڵ لە جیهانی دەوروبـەری خـۆی بەرفـراوان دەکات. کەواتـە باڵـدار بـاس لە جیهانێکـی نامومکین نـاکات، بەڵکو دەستنیشـانکردنی ئەو بۆ ئەو شـوێنەی کە دەشێت بوونی ڕاستەقینەی خۆمانی تێدا بەرینە سەر، دەستنیشـانکردنێکی واقیعبینانەیە نەک ئایدیالیسـتانە. ئەو شـوێنە جیهانـی سرووشـتە نەک بەهەشـت، دنیایەکە دەشـێت ئەزموونی بکەین، نـەک دنیایەکی وێناکـراو کە گریمانـەی ئەزموونکردنی لە ئـارادا نیـە و بێگومان لە پشـت ئەمـەوە ئامانجێکـی پەروەردەیی عەقڵانیانـە هەیە، ئەمـەش وایکردووە زمانی کتێبەکـەی باڵداریش

زمانێکی واقیعیانەی ڕۆژانەیی بێت، نەک زمانێکی ئایینیانەی ئایدیالیزە کراو. دووەم: بوونی واقیعی، بوونە لەگەڵ ئەوانیتر و لەگەڵ مرۆڤەکانی تر. بۆیە وانەی دووەمی ناو کتێبی ئەلف و بێی نوێ بریتیە لە ئاشناکردنی ئێمە بە (دارا) و ئاشتکردنەوەی لەگەڵ (دار)دا: دارا داری دی (ل: ٦). واتە دروستکردنەوەی پەیوەندی لە نێوان مرۆڤ و سرووشتدا. هەڵبەت لە ئاستی دیداریدا (مرئی) پەیوەندی نێوان هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ، لە وێنەی سەر بەرگی کتێبەکەوە دانی پێدا نراوە، بەڵام لە ئاستی نووسین و تێکستەکەدا، (مێ) هەتا وانەی هەشتەم ناوی نیە! تەنیا لەوێدایە کە (زارا)مان لەسەر ئیقاعی ناوی (دارا) پێدەناسێنێ. لێرەدا دوو خاڵ تێبینی دەکرێت، کە لە واقیعیبوونی جیهانبینی کتێبەکە کەم دەکەنەوە: ئەلف: جیهانی ناو کتێبەکەی باڵدار بە وێنەی جیهانی بەهەشتیی ناو کتێبە ئایینیە مەزنەکانی وەک تەورات و ئینجیل و قورئان، جیهانێکە یەکەمجار ماف بە نێرینە دەدات تیایدا بژی و جیهانێکی پیاوسالاریە. بوون یەکەمجار بوونی نێرە و پاشان دەبێتە بوونی مێ. شەرعیەت یەکەمجار هی پیاوە پاشان ئافرەت شەرعیەتی بوونی خۆی وەردەگرێ و بوونی ئەو دەبێتە بوونێکی پەراوێزی. بێ: لە نێوان گۆکردنی ناوی (دارا) و (زارا) و مۆسیقای هەردوو ناوی (ئادەم) و (حەوا)، یان (ئیڤا)دا، لێکچوون و نزیکایەتی هەیە و لە هەردوو حاڵەتیشدا مێینە دەکەوێتە پاش نێرینەوە. سێهەم: بوون لەناو جیهاندا، بوونە لەناو ژیانێکی سرووشتیدا و بوون و ژیانە لەگەڵ ئەوانیتر و ئاژەڵ و باڵندەکاندا. بەڵام خۆشترین ئاست و ساتەوەختی ژیان بۆ منداڵ، ئەوەیە کە ئەو ژیانە پڕ بێت لە یاری. یاری بەشێکی گرنگ و چێژبەخشە لە ژیانی دارا و زارا و هاوڕێکانیاندا، کە دەتوانین ئەم ڕاستیەش هەر لە

وێنەی بەرگی کتێبەکەوە تێبینی بکەین و پاشان لە وانەکانی (٢، ٣، ٤، ٦، ٨ هتد.) و گەلێ وانەی تردا بەڵگەی بۆ بهێنینەوە. کەواتە لە تێڕوانینە پەروەردەییەکەی باڵداردا یاری و وازیکردن هەم بەشێکە لە ژیان و هەم جۆرێکیشە لە پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان پێکەوە. بەڵام هەموو ژیان وازی نییە و بۆی هەیە ژیان (داو) و (ڕاو)یشی تێدا بێت، وەک لە (لاپەڕە: ٧ و ٢١)دا دەبینرێت. سەیر لەوەدایە ئەوەی داو دەنێتەوە و ڕاو دەکات، دارایە نەک زارا. واتە ڕەگەزی نێرە نەک ڕەگەزی مێ و لێرەشدا جیهانبینی باڵدار لەسەر مێ، لە جیهانبینی ناو چیرۆکی ئادەم و حەوای کتێبە ئاسمانییەکان جیا دەبێتەوە. چونکە لەو بەسەرهاتەدا ئەوەی دەبێتە سەرچاوەی خراپە، یان هەڵەکردن، حەوایە نەک ئادەم. جێی سەرنجە کە باڵدار لە تێڕوانینە پەروەردەییەکەی خۆیدا تێڕوانینێکی پیاو/نێرسالارانە لەسەر مێ فێری منداڵ ناکات، کە بێگومان ئەو تێڕوانینە لەکاتی نووسینی بەرهەمەکەی و هەتا ئێستاش لە کۆمەڵگای ئێمەدا لەسەر مێ باڵا دەستە. کەواتە ئەوە مەرجێکی پەروەردەییانەی باڵدارە بۆ بەرهەمهێنانی تێکست بۆ منداڵ، کە نابێت لایەنگیرانە بێت و فەزڵی ڕەگەزێک بدات بەسەر ئەویتردا. چوارەم: لەلای باڵدار یەکێک لە ئەرکە گرنگەکانی فەلسەفەی پەروەردە بریتییە لە بەرهەمهێنانی مەعریفە لەسەر جیهان و دەستنیشانکردنی گۆڕانکاری و جموجووڵەکانی ناو دنیای دەوروبەر. (لێرەدا باڵدار بەئاراستەی ئەو کۆمەڵە فەیلەسووفانەدا کار دەکات، کە لە مێژووی فەلسەفەدا بە فەیلەسووفانی سرووشت ناو دەبرێن و کاریان ئەوە بوو لە سرووشت و دیاردە و دەرکەوتەکانی وردببنەوە و لەوێوە مەعریفەیەک لەبارەی سەرەتای گەردوونەوە بەرهەم بهێنن). ژمارەی ئەو بابەتانەی کتێبەکەی باڵدار، کە تیایاندا وەسف و

دەستنیشـانی دیـاردە و گۆڕانەکان دەکرێت، لـە ئەلف و بێی نوێدا کەم نین و هەر یەک لە وانەکانی: (دۆ ڕژاوە ل: ٥١، داری درێژ ل: ٧١، بـاران دەبارێـت ل: ٤٢، گڤەگڤـی بـا ل: ٨٤) بەڵگـەی ئـەم بۆچوونـەن. واتـە منداڵ لەڕێـی ئەم وانانـەوە لـەو گۆڕانکاریانە ئاگادار دەکرێتەوە کە لە دەوروبەری ڕوو دەدەن و ئەمەش دەبێتە هـۆی دروسـتکردنی پەیوەندییەک لە نێوان منـداڵ و دەوروبەری. پێنجـەم: بـوون لەناو جیهاندا، بوونێکی بـێ ئامانج نیە و هەر تەنیا لە سەرگەرمبوونی تاکەکەس بە یاری و ناسین و دەستنیشانکردنی مـرۆڤ بۆ دیـاردەکان و گۆڕانەکانـدا، کورتنابێتـەوە. بۆیە ئەگەر یەکێک لە ئەرکە گرنگەکانی پەروەردەکردن، دروستکردنی مەعریفە بێـت لەسـەر ژیـان لەلای منـداڵ، ئـەوە ئامانجی ئـەو مەعریفەیە پێویسـتە پەروەردەکردنی هەستی بەرپرسیاری و دەروەستی بێت لەلای ئەو منداڵە. باڵدار ئەم هەسـتە لەسـەر پرانسیپی (تێگەیشتن) و (پێویسـتییەوە) دروسـتدەکا، نـەک لەسـەر پرانسـیپی ترس و گوناهبارکـردن و سـزادانەوە. واتە باڵدار، وەزیفـەی پەروەردە بە دروسـتکردنی ترس و گوناه و سـزا بڕینەوە دەستنیشـان ناکات. بەڵکو منداڵ هاندەدات پەیوەندییەکی هاوکارانە لەگەڵ سرووشـتی دەوروبەریدا دروستبکات و ئەم پەیوەندیەش ببێتە هۆی تێگەیشتنی مـرۆڤ، یان منداڵ لە دەوروبەرەکەی. لە وانەی (ئاودان، ل: ٨١)دا، زارا و ئازاد دەڕۆن دار ئاو دەدەن، لە وانەی (نازێ: ل ٨١) و (دار دەڕوێنـم ل: ٩١)دا، نـەورۆز و نازێ دەچـن دار بڕوێنن. لە وانەی (پشـە سـپی، ل: ٣٣)دا، زەینەب نان و پەنیر دەداتە پشـە سـپی و داوای لێدەکات لێی نەترسـێ. لە وانەی (ووسبە ل: ٦٢) و لە وانەی (مـرۆڤ ل: ٧٤)دا، هەریـەک لە دارا و ئازاد (دیسـانەوە دوو نێر!) دەیانـەوێ ئـازاری مەلەکان بدەن، بەڵام هەردووکیان دەسـت لەو

کارە هەڵدەگرن چونکە وەک (نەسرین/ ڕەگەزی مێ) پێیان دەڵێت: (برام مرۆڤ وا ناکات، مرۆڤ ئازاری مەل نادات). لە هەندێ وانەی دیکەدا، مرۆڤ نەک هەر تەنیا ئازاری گیاندارەکانی دی نادات، بەڵکو ڕۆڵی ناوبژیکەریش لە نێوانیاندا دەگێڕێت و بەرپرسیارییەکی زیاتر دەگرێتە ئەستۆی خۆی، کە باڵدار بە زمانێکی شەففاف و نزیک لە دنیای منداڵییەوە، دەری بڕیوە. یاخود منداڵ فێر دەکات خۆی تێکەڵ بەهەموو ناکۆکیەک نەکات و مەرج نیە ببێتە لایەنێک لە لایەنەکانی ناکۆکی: لە وانەی (شەڕە مریشک ل: ٣٠) و لە وانەی (قەلەڕەش ل:٩٥)دا مرۆڤ ناوبژی دەکات و لە وانەی (سێ سەگ ل:٤٣ )دا، کە بە هەرسێکیان کەرویشکێک ڕاو دەنێن، بێ لایەن دوەستێت و تەنیا داوا دەکات لەو دیمەنە ڕابمێنین و هیچیتر. شەشەم: لە جیهانە پەروەردەییەکەی باڵداردا، منداڵ هەر تەنیا بوویکی پاسیڤ و وازیکەر و بەرپرسیار نیە. بەڵکو کەسێکی چالاک و بکەرێکی خاوەن هەڵوێست و بەرهەمە. واتە باڵدار بە ئەرکی پەروەردەی دەزانێ کە منداڵ هانبدات بۆ نواندنی چالاکی و کارکردن، چونکە ئەو ئەرکی پەروەردەکردن هەر لەو خەسڵەتانەدا کورتناکاتەوە، کە پێشتر باسمانکردن. بەڵکو وەک دەردەکەوێ، پەروەردە لەلای باڵدار هێزێکی هاندەریشە بۆ چالاکی و دروستکردنی ڕۆحی یارمەتیدان. لە وانەی (سێو ل: ٧٢) ئازاد سێو بۆ نەسرین لێدەکاتەوە و لە وانەی (نانی ساج ل:٩٤)دا، نەسرین نان دەکات و لە وانەی (کاری ناو ماڵ ل:٦٦)دا، نەسرین چا لێدەنێ و نێرگز بەدەم سترانبێژییەوە پیاڵەکان دەشوات و لە وانەی (گوڵ چاندن ل:٣٧)دا، جوامێر داوا لە نێرگز دەکات ڕێگەی بدات یارمەتی بدات و گوڵەکانی دەستی بۆ هەڵگرێ. بەمجۆرەش باڵدار بوونی ناو جیهانە تایبەتی و منداڵانەکەی دەکاتە بوونێکی

چالاک و بەرهەمهێن و ڕۆحی یارمەتیدانیش دەکاتە خەسڵەتی بنەڕەتی ناو ئەو جیهانە.
حەوتەم: ئەگەرچی ڕەگەزی حەکایەتکردن و گێڕانەوە (Narration) لە کتێبە نایابەکەی باڵداردا زۆر ئاشکرا و دیارە و دەکرێ ئەم کتێبە وەک ڕیوایەتێک لەسەر ژیانی کۆمەڵە کاراکتەرێک بخوێنینەوە، بەلام ژمارەی ئەو وانانەی تیایاندا گێڕانەوە (سرد) دەبێتە بابەتی سەرەکی، لە هەموو وانەکانی تر زیاترە. ڕۆڵی گێڕانەوە لەلای باڵدار هەرتەنیا مەسەلەیەکی تەکنیکی نیە، کە ئەو وەک پەروەردەکارێک تیایدا شارەزایی تەواوی هەیە. بەڵکو گێڕانەوە بەشێکی گرنگە لە سازدانی ئەو جیهانەدا کە باڵدار وەک جیهانێکی پەروەردەیی ئەڵتەرناتیڤ پێشنیاری کردووە. گێڕانەوە لەم بەرهەمەدا ئەرکێکی پەروەردەیی جێبەجێ دەکات، کە بریتیە لە پەیوەندی دروستکردن لە نێوان ڕابردوو، ئێستا و داهاتوودا. بە مانایەکی دی: بوون لە فەلسەفە پەروەردەییەکەی باڵداردا خاوەنی مێژوویەکی تایبەت بە خۆیەتی کە پڕە لە بەسەرهات و ئەزموون، کە دەشێت منداڵ لێیانەوە فێر ببێت و بەهۆیانەوە بەرچاو ڕوون بێت. باڵدار بە پێچەوانەی حەکایەتە فۆلکلۆری و باوەکانەوە، لە گێڕانەوەکانیدا (بە دەگمەن نەبێت) پشت بە ئامۆژگاریکردن و پەند دادانی منداڵان نابەستێت. بەڵکو ئەو لە گێڕانەوەکانیدا ڕووداوێک، یان زەمەنێک بەیاندەکات بەبێ ئەوەی بە باش، یان بە خراپ حوکمی بەسەردا دەر بکات. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە باڵدار، خەسڵەتێکی گرنگی فەلسەفەی پەروەردە ڕەچاو دەکات، کە بریتیە لە دروستکردنی ئیمکاناتی هەڵبژاردن لەبەردەم منداڵدا و خستنەڕووی ڕووداوێک لەبەردەم لێکدانەوەکانیدا. وەلێ بڕیاری هەڵبژاردن بۆ منداڵەکە خۆی دەهێڵێتەوە: ئایا ئەو ڕووداوە، یان کردەوەیە دووبارە دەکاتەوە،

یـان نـەء? لە وانەی (گونـدی ئێمـە ل:٣٦)دا، گێڕانەوەکە هاندان و حوکمدانـی تێدایە و باس لە گوندی ئێمە دەکات کە: (گەلێک جوانە، چونکـە گوندێکی ڕەنگینی کوردسـتانە)، بەڵام لە وانەی (سـەردان ل:٨٦) و لـە وانـەی (ترێ ل:٩٦)و هەروەها لە وانـەی (نیگارەکانی نێرگز: ل٧٧-٨٧)دا، کە باس لە چیرۆکی گورگ و بزن دەکات، هاندان و حوکمدانی تێدا نیە و گێڕانەوەکە تەنیا بە بەیانکردنی بارودۆخەکە گیرسـاوەتەوە. بەهێزترین دۆخی گێڕانەوە لە دوایین وانەی کتێبی ئەلـف و بێی نوێدا بەدی دەکەین، کە بریتیـە لە پێداچوونەوەیەکی گشـتی بـە کۆی ئـەو ماوەیـەدا، کـە وەک (مێـژووی هاوبەش)ی منداڵەکان دروسـتبووە. منداڵەکان لـە یادکردنەوەی ئەو مێژووەدا، ژیانێکیان بە بیردێتەوە کە پڕە لە پەیوەندی و یاریکردن و ئاشنایەتی و بەرپرسیارێتی و چالاکی نواندن، کە ئەوانی لە توندوتیژی دوور خسـتۆتەوە. هەربۆیەشە لێرەدا، باڵدار بە وریاییەوە بابەتی کۆتایی سـاڵ دەکاتە وانەی خۆشەویسـتی و ئەمەگـداری. واتە لە ڕێگەی ڕیوایەتکردنـەوەی ڕابـردووی هاوبەشـەوە، ڕۆحـی لێبووردەیی لـەلای منداڵ پتەو دەکات. بێگومـان ئەمەش ئەو خاڵە جەوهەریەی پەروەردەیە کە ئێسـتا لە سیستەمی پەروەردەیی ئێمەدا بەتەواوی ونبـووە، چونکە ئـەوە خۆزگەی هەر قوتابـی و فێرخوازێکە، زوو کۆتایـی سـاڵ بێـت و ڕزگاری ببێت لـەو پەیوەندیـە گرژانەی کە دەیبەسـتن بەو شـوێنەوە کە ناوی: قوتابخانەیە! هەرچۆنێک بێت باڵـدار بەداهێنانی ئەم بەرهەمە دەرگای جیهانێکی تایبەتی لەسـەر منداڵیـی هەمووومان کردەوە. ڕاسـتە بەرهەمەکە هەندێ ناکۆکی لە خۆی گرتووە و کەم کوڕی هەیە کە لە خوارەوە بەکورتی ئاماژەیان پێـدەدەم، بەڵام چەندین نەوە لـە کۆمەڵگای کوردیدا (پۆلی یەکەمی سـەرەتایی ژیانی خۆیان) لەم بەرهەمەوە دەستپێکرد. لە کتێبەکەی

باڵـداردا، هەنـدێ ناکۆکـی هەسـتیان پێدەکرێت کە دەمـەوێ بەم شێوەیە ئاماژەیان پێبدەم: - یەکەم ناکۆکی لە نێوان دەقەکان و ئەو نیگارانەدا بەرچاو دەکەوێت کە بۆ وانەکان کێشـراون. لە کێشـانی نیـگاری جـل و بەرگەکاندا، بەزۆری کـەش و هەوایەکی مۆدێرنی شاریانە لە پێشچاو گیراوە، لە کاتێکدا کە شوێنی ڕووداوەکان لادێ و گوند و سرووشتە. ئێمە ئێستا پاش چەندین ساڵ تێدەگەین، ئەو خانمەی نیگارەکانی کێشـاون، کورد نەبووە و ئەورووپی بووە و بە هەمان بونیادی زەینی خۆیەوە تەماشای ژیانی کوردەواری کردووە کە شوێنی ڕووداوەکانی ناو ئەلف و بێی نوێیە. یەکێک لە خەسڵەتە باشـەکانی ئەم ناکۆکیە ئەوەیە کە نیگارەکان بەهۆی جوانیی ڕەنگ و گۆشەی ڕوانین (پێرسپێکتیڤ) و هێڵی ڕێک و هتد وە، کەماڵێکیان بەخشیوە بە هەموو شتێک و ئەمەش وایکردووە، خەیاڵی منداڵ زۆر بەهێزتر بکەوێتە کار، لەوەی کە دەقە نووسراوەکان دەیخوازن. ئەمە جگە لەوەی کە سرووشـت و دەوروبەر لەو نیگارانەدا ئەوندە پاکژ دیـارە، کە مرۆڤی بینەر نایەوێت بۆ سـاتێک لێی دوور بکەوێتەوە و حـەزی کۆپیکردنـەوەو لەبـەرا ڕەسـمکردنەوەی تێدا دروسـت دەکات. (یەکێک لە ساتەوەختە خۆشەکانی منداڵیم ئەوەبوو، بەهۆی نەوتاویکردنـی پەڕەیەک کاغەز و دانانی لەسـەر نیگارەکانی ئەلف و بێی نوێ، بکەومە خەتکێشانەوەی نیگارەکان و ڕەنگکردنەوەیان، ڕەنگە ئەمە یەکەمین مەشقکردن بووبێت بۆ فێربوونی قۆپیکردن و دزی و بەموڵکایەتیکردنیش!).. - ناکۆکی نێوان وێنەی جل وبەرگی قارەمانەکانی ناو ئەلف و بێ و دەوروبەری سرووشتییان، دەمانباتە سـەر ناکۆکیەکی تر، کە ئەویش خۆ سـاخ نەکردنەوەی باڵدارە لە نێوان کەلتووری لادێ و کەلتووری شاردا. ئایا باڵدار لە کوێی ئەم دوو کەلتوورەدا وەسـتاوە و دەیەوێـت لە ڕێگەی بەرهەمەکەیەوە،

نـرخ و بەهای کامیـان فێری منداڵ بـکات؟ - ئەگەرچی ئەم کتێبە بــە ڕۆحێکی پەروەردەییەوە نووســراوە و دەقێکی ســکۆلاریانە و عەقڵانیانەیــە و لێرەشــەوە زمانی ئایینی تیایدا ونە، بەڵام جەســتە تیایدا ئامادەیی نیە، کە ئێمە دەزانین ونبوونی جەســتەش پەیوەندی بەو سانسۆرەوە هەیە کە ئایین لە کۆمەڵگای ئێمەدا لەسەر جەستە دایناــوە. بۆچی لەم کتێبەدا، جەســتە وەک بابەتێکی پەروەردەیی و مەعریفــی ونە؟ بۆچی وانەیەکی تیادا نیە باس لە جەســتەی نێر و مــێ و جیاوازییەکانیــان بــکات؟ بۆچی پێمان ناڵێــت ئێمە چۆن لە دایــک بووین و لە کوێــوە هاتووینەتە جیهانــەوە و میکانیزمەکانی دروستبونی مرۆڤێک کامانەن؟ بێگومان بەشێکی ئەم پرسیارانەش لــەو قۆناغەی تەمەنی منداڵدا ســەر هەڵدەدەن کــە باڵدار کتێبەکەی ئاراســتە کــردوون و کەچــی لە قۆناغــی زانکۆییشــدا و لە وانەی ئەناتۆمی بەشی پزیشکیشــدا، بێ وەڵام دەمێننەوە.. - ئەگەرچی لە کــۆی وانەکانی ناو کتێبەکەی باڵداردا، دارا، بەوجۆرە دەردەکەوێت و دەناســێنرێت، تــا ببێتە مرۆڤێکــی نمونەیی و چاولێکــراو، بەڵام پرۆسەی گەشەکردنی کەسایەتی(دارا) بەرەو شوێنی مەترسیدارمان دەبات. دارا لە زۆر شوێندا کاراکتەرێکی پێچەوانەی چاوەڕوانیەکان وەردەگرێت و لە هەندێک شوێنیشدا تەواو شەڕانی خۆی دەناسێنێ. بــۆ نمونە: لــە وانەی (تەیــارە ل: ٥٢)دا، دارا تەیارەکەی دەباتە ناو دارەکانــەوە و ئەوانیتر هاندەدات بیدۆزنەوە تاکو ببێتە هی خۆیان. لە وانەی (ووس بە ل: ٦٢)دا، دیسانەوە دارایە کە دەیەوێت ئازاد دنە بــدات بۆ دەرهێنانی تەیرەکان لــە هێلانەکەیان. لە وانەی (هێلکە ل: ٨٣)دا، نەسرین داوا لە دارا دەکات هێلکەیەکی بۆ بهێنێت، بەڵام ئەو دەیەوێت بۆی بهاوێژێ! هەروەها لە وانەی (کەڵەباب و قاز ل: ٢٤) دا، دارا خەریکی بەشەڕدانی کەڵەباب و قازەکانە! ئەمە جگە لەوەی

لە وانەی (گا بەڵەک ل: ٥٥)دا، بەناوی پاسەوانیکردنی گوڵەکانەوە دەیەوێت گوریس بکاتە ملی ئەو گایەی کە ئەو بە (بڵح) ناوی دەبات. ڕاستە دارا لە هەموو وانەکاندا دارایەکی شەڕانی نیە، وەلێ زۆربەی ئەو میکانیزمانەی شەڕانیەتی دارایان لەسەرەوە دروستبووە، لە کەسایەتی ئێمەدا ڕەنگیان ڎاوەتەوە! دواجار دەتوانم بڵێم: ئەگەرچی پڕۆژەکەی باڵدار بە پلەی یەکەم پڕۆژەیەکی پەروەردەیی و فێرکاریانەیە، وەلێ لەوەدا کە ئەم بەرهەمە دنیای هاوبەشی منداڵیی چەند نەوەیەکی مرۆڤی کورد بوو، توانی زۆر لەو ئامانجە سیاسیانەش بەدی بهێنێت کە شۆڕشەکانی کورد هەوڵیان بۆ دەدا. باڵدار نەک لە ڕێگەی سیاسەتەوە، بەڵکو لە ڕێگای هووشیارکردنەوە و پەروەردەوە، شۆڕشی خۆی بەرپا کرد. بەم مانایەش ڕۆڵی ئەو کەمتر نیە لە ڕۆڵی هیچ شۆڕشگێڕێکی دی سەدەی بیستەمی ئێمەی کورد، بەتایبەتیش لە سازدانی ناسنامە و زەمینەیەکی هاوبەشی گەشەکردنی عەقڵی لەسەر بنەمای یادوەرییەکی بەکۆمەڵی. وازهێنان و بەلاوە نانی ئەو کتێبە، هیچ ناگەیەنێت جگە لە سڕینەوەی ئەو یادوەرییە هاوبەشانەو تێکدانی ئەو زەمینەیەی کە ناسنامەیەکی بە بوونی ئینسانیانە و کوردانەمان دەبەخشی. بەبڕوای من کارکردن و مشتومال کردن و گۆڕانکاری لە کتێبەکەی باڵداردا، کارێکی پێویستە، بەڵام لابردن و پاسیڤکردنی، وەکئەوەی لە لەلایەن هەردوو وەزارەتی پەروەردەی دوو ئیدارەکەی حکومەتی هەرێم و هەندێ ناوەند و کەسایەتی ئەکادیمییەوە کاری بۆ کراوە، جگە لە (هەڵەیەکی پەروەردەیی)، هیچیتر ناگەیەنێت و ئەمەش دەریدەخات کە سیستەمی پەروەردەیی و هزری پەروەردەیی لە وڵاتی ئێمەدا، لە چ تەنگژەیەکدایە. واچاکە نەوەی ئێمە، لە ڕێگەی خوێندەوەی ڕەخنەییانەی ئەم کتێبەوە و بەدوور لە نۆستالیژیا

و ڕابردوو پەرستی، نەهێڵێت (نیشـتیمانی منداڵییەکانمان) لێزەوت بکرێت و هێزی باڵگرتن و فڕینمان لێبسـەنرێتەوە. لێگەڕێ ئەمەش جیاوازییەکی دیکەی نێوان ئێمە و ئەوان بێت..

هەولێر: ٢٠٠٢



خودایە،
ئەو حەسەن زیرەکەت بۆ
لێسەندینەوە؟!

پێنج ساڵ پێشئەوەی لە دایک ببم، سەردانی گوندەکەی ئێمەی کردووە و چەند شەوێک لەوێ میوان بووە و گۆرانیی گوتووە. بەڵام من بۆخۆم لە تەمەنێکی زۆر زووی منداڵیمدا، لە ڕادیۆی دەنگی کرماشانەوە ناسیم، کاتێ لەدوای دەنگە سیحرییەکەی کابرایەک، کە جگە لە شوکرولای بابان کەسیتر نەبوو، گۆرانی دەچڕی. زیرەک، زۆر پێش لەدایکبوونی من هاواری کردبوو، بەڵام دڵنیام تا بمێنم دەنگی ئەو لە ڕۆحمدا دەزرینگێتەوە. ئەو مرۆڤێک بوو، هەژاری و کۆژان و ئازار دروستیانکرد، کەچی نەتەوەکەی خۆی بەجۆرێ دەوڵەمەند کرد، میراتێکی ڕۆحیی ئەوتۆی بۆ بەجێهێشتین، کە لە مێژوودا نمونەی نەبوو. لەوە دەچێ حەسەن زیرەک بە مانایەکی سیمبولیکیانە ئەو دەنگە ئومێدبەخشە بێت، ڕووبەڕووی سنوورێکی دەستکرد، کە لە شەڕی چاڵدێرانەوە لە نێوان کوردی خۆرهەڵات و باشووردا دروستکرابوو، بەرز دەبێتەوە. ئەو لەسەردەمێکدا کە

کوردی خۆرهەڵات لەمدیو قاچاخ و هی ئێرە، لەوێ قاچاخکرابوون و سـنوورەکان پڕکرابوون لە گوزارشچی و جاسووس و تادەهات وڵاتـی ئێمـە بەهـۆی سیاسـەتی شـۆڤێنیانەی ڕژێمـی ئێرانـی و عێراقـی، دوولـەت و پارچەپارچە دەکرا و کوردانیـان لێکتر دوور دەخسـتنەوە، حەسـەن زیرەک پردێکی لە ئاواز دروسـتکرد و بە گۆرانـی و ئامادەییەکانی خۆی لەمدیو لـەو دیو، هەوڵیدا تاکو ئەو دابڕانە سیاسی و دەستکردە، نەبێتە دابڕانێکی ڕۆحی و کەلتووری و مەعنەوی.

میراتی حەسـەن زیـرەک بە پلەی یەکـەم میراتێکی ئیسـتاتیکی و هونەرییـە، ناوەڕۆکی ئەم هونەرە باس لـەو بارودۆخانەی ڕۆحی مـرۆڤ دەکات، کـە بـە پلـەی یەکـەم زادەی ژیـان و ژینگەیەکی کۆمەڵایەتیانەی هونەرمەندەکەیە و بە پلەی دووەمیش ئەو ناوەڕۆکە بـاس لە ناخی مرۆڤ دەکات وەکئەوەی کە کائینێکی هەسـتەوەرە. ئێمـە لە ئێسـتادا ئەو شـێوە ژیـان و بارودۆخـە کۆمەڵایەتیەمان تێپەڕاندووە کە بۆتە ناوەڕۆکی بەشێکی زۆری هونەرەکەی حەسەن زیرەک. ئێمە ناچار نین عەوداڵی گەڕانەوەبین بۆ ئەو شێوازە ژیانە. ئەو شـێوازە ژیانە بەهای خۆی لە سـەردەمی خۆیدا بوو، وەلێ لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا هەندێ بەهای دیکە، چ لە ژیان و چ لە هونەر و گۆرانیدا، خۆیان سەپاندووە. بەم مانایە ڕۆژگاری ناو گۆرانییەکانی حەسـەن زیرەک و خودی ئەم هونەرمەندە بۆ ئێمە بەسـەر چووە، ئەگەرچـی لەهەرلا دەبینیـن و گوێمان لەدەنگی ئەوانەش دەبێت کە بە شێوازێکی نۆستالیژیانە یاد و لاسایی حەسەن زیرەک دەکەنەوە. وەلێ ئەوەی کە ئیستاتیکای حەسەن زیرەک تا هەنووکەش لەگەڵماندا دەژی و بـۆ حاڵەتـە ڕۆحییەکانمان پێویسـتە، بەڵگـەی ئەوەیە کە ئەو بەشـەی دیکـەی هونەرەکەی ئەم پیاوە، تـا لووتکە لە ناخێکی

مرۆڤانــەوە هەڵقــوڵاوە و بەردەوام گفتوگۆ لەگــەڵ ئەو ڕەهەندەی ناخماندا دەکات، کە وازهێنان لێی ئاســان نیە. بەم مانایەشیان بێت، حەســەن زیرەک تا ئەو کاتەی ئێمــە ناخمان زیندووە، ئامادەییەکی بەردەوامی لە ژیانی ئێمەدا هەیە..

حەســەن زیــرەک یەکەمیــن نیە، باســکردنی ئــەو وەک «یەکەمین هونەرمەنــد» کــە وایکــرد و واچــوو، بێمانایــە، چونکــە لەگــەڵ گریمانەکردنــی ئەودا وەک «یەکەمین»، دەبێت باس لە دووەمین و سێیەمینەکانیش بکەین و ئەوکاتەش بریقە و باقی «یەکەمین» کاڵ و کاڵتــر دەبێتەوە. بەڵام ئەو بــەردەوام و لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژگار و وردبوونــی زەوقــی تایبەتیمــان لەژێر زەبری هونــەری بازاڕیی بێڕۆحدا، بریســکە و کاریگەریی زیاتر و بایەخدارتر دەبێت. هەموو ئەم قسانە پێماندەڵێن: حەسەن زیرەک، ئەو پیاوە «نەخوێندەوارە»، «شایەرە»، «لۆتییە»ی ڕۆژگارێکی دوور و درێژ لە پێناوی نان و ژیان و هونەردا ئەمدیواو دیوی دەکرد، ئەو مرۆڤەی پۆلیســەکانی سەرسنووری عێراق و ئێرانی دەستکرد، لەسەر خاکی کوردستان، کەلەبچەیــان لەدەســتدەکرد و ئەو کەســەی عەقڵیەتــی هەڕەمەکی کۆمەڵایەتــی کورد، ســەدان توانج و ئیدیعایەیان بۆ هەڵبەســتبوو، لــە مەجلیســەکاندا ســووکایەتیان پێدەکــرد و کەســایەتی خۆی و هاوســەرەکەیان برینــدار دەکــرد، بە عارەقخۆر و ســووک ناویان دەبــرد، هونەرمەندێکــی دانســقە و بێنمونە و ئۆریگینــاڵ بوو. ئەو ســاتەوەختی دانســقەیی لە مۆســیقا و گۆرانیی کوردیدا چەسپاند، بەدەگمەن نەبێ، لاســایی کەسی تری نەکردەوە، بەڵام لەشکرێ لە لاســاییکەرەوەی دروستکرد و خەسڵەتی چیاییانە و بەهاریانەی لە گۆرانی کوردیدا بەجۆرێ چەسپاند، کە هەمیشە وابزانین لوتکەیەک هەیە پێویســتە بچینە ســەری و بەهارێک بەڕێوەیە پڕە لەسەیران.

ئەو لە پێدەشــت و گەرمەسێردا خەیاڵی ئەوەت دەخاتە زەینەوە کە هەست بە فێنکایەتی بکەی. لە بەردەڵانیی چیاکان و بایەرترین عەردا، بیرۆکــەی هەڵقووڵانی کانیاوێکت لەلا دروســتدەکات. با نەچووبیتە کرماشــان، وەلێ ئەو کرماشانت لەلا شیرین دەکا، لە تەنیاییەکانی غەریبایەتــی، هاودەمێکــە پــڕت دەکات لە ئیرادە و نۆســتالیژیا. لە بێکەســی و زویربوونەکاندا هەمیشــە دەتهێنێتە سەر ئەو بڕوایەی کە هەمیشــە (ســەبری و لەیلا و خاتوونێک) هەن تۆراون و دەبێ ئاشتیان بکەینەوە. زیرەک لە لوتکەی ناوبانگیدا و لەناو کۆمەڵگایەکی نێرســالار و ئافرەتکوژی داخراودا، لای لایە بۆ خانمێکی ســوورە گــوڵ دەکات و داوای لێدەکات ببێتە خوڵامی تاکو بەســەر پەنجەی جۆلانــەی بۆ ڕابژێنێ بە جۆرێ کە لە خەوی هەڵنەســتێنێ. ئەو لە جیاتــی پاڕانەوە لە خودا بۆ چوونە بەهەشــت، هاوار دەکا: (خوایە هەڵکەی بای شەماڵی/با دەرکەوێ خەت و خاڵی)، و لە خەڵوەتەکانی ڕۆحیشدا پەنا بۆ مانگ دەبات و باسی هاودەردی خۆی و ئاسمان دەکات و کاتێ بیرۆکەی مەرگیش یەخەی دەگرێ: دەچێتەوە ســەر گردی (ناڵە شکێنێ) بەرامبەر بە بۆکانێ، لەوێ ئارامگایەک بۆخۆی چێدەکات.

یۆنانیە کۆنەکان سێ جۆر پۆلێنکردنیان بۆ کاری هونەری هەبووە: تەخنە، میمیســیس و پۆیســیس. تەخنــە لەلای ئــەوان زاراوەیەکە، ئاماژە دەکات بۆ پرۆســەی کارکردن و دروســتکردنی شــتێک بە تەمــای ئامانجێــک. بــۆ نمونە دارتاش کورســی بــە ئامانجی ئەوە دروســتدەکات کە لەبار بێت بۆ ئەوەی لەسەری دابنیشین. کورسی باش، ئەنجامی تەخنە و پیشــەی باشــە و ئامانجی کەســێکیش کە پیشــەکەی کورسیی دروستکردنە، ئەوەیە کە کورسی بکاتە ئامراز و شوێنێکی ئاسوودە بۆ دانیشتن. بەم پێیە زاراوەی تەخنە ئاماژەیە

بە مەهارەت و لێهاتوویی تەخنەکار (مرۆڤی پیشـــەیی) لە کارەکەی خۆیـدا. پۆلێنـی دووەم (میمیسـیس)ە: ئێمە لە زمانـی خۆماندا لە جیاتی زاراوەی میمیسـیس، وشەی لاسـاییکردنەوە، یان گێڕانەوە بەکار دەهێنین. لاساییکردنەوە و گێڕانەوە لە مانای کۆمەڵایەتیانەی خۆیاندا خۆش بەرگوێ ناکەون. تەنانەت بۆی هەیە بە کەمایەسـی بۆ لاسـاییکەرەوە دابنرێ و ببێتە شـوێنی گاڵتەجاڕی. پێکەنین لەم بـارەدا، زیاتر لەوەی دەربڕینی دۆخێکی سـایکۆلۆژی بێت، دەبێتە ئامرازێک بۆ شـکاندنی ئەوەی پێی پێدەکەنین. لە تێگەیشتنە یۆنانیە کۆنەکەدا، میمیسـیس دوو جۆری هەیە: یەکەم، هەموو بەرهەمێکی هونەری جۆرێکە لە میمیسـیس، واتـە دووبارەکردنەوە. بەتایبەتی دووبارەکردنەوەی، یاخود تەقلیدکردنەوەی شتە ئاساییەکان، وەک تەقلیدکردنەوەی پەیکەرێ لە وێنەکێشاندا، یان دەنگێکی سرووشتی لە گۆرانی و مۆسـیقادا. بەڵام میمیسـیس لەمانای دووەمیدا بریتیە لە خسـتنەڕووی کاراکتەر و کەسایەتی ناو بەرهەمە هونەرییەکان وەکئەوەی کە گوایە ڕاستەقینەن.

هەرچی زاراوەی پۆیسیسە، لەلای یۆنانەکۆنەکان بەمانای (ئەفراندن) دێت لە پەیوەندی بەکاری هونەرییەوە. ئەوان دەیانگوت هونەر وەک (پۆیسـیس) واتە ئەفراندنـی کاری هونەری لە نەبوونەوە بۆ بوون. شتێ کە نەبێت و نمونەی نەبێ و هەرگیز بوونی نەبووبێت، دابهێنرێت و بوونی پێببەخشـرێ و بکرێتە نمونەی ئەفراندن و داهێنان، ئەوە (پۆیسیسـە). هونەرمەندە گەورەکان، یان داهێنەرەکان ئەوانەن کە بەهـۆی کاری هونەرییـەوە، ژیانێک، بەرهەمێک لـە نەبوونەوە، لە نادیـارەوە بەرهەم دەهێنن و بوون و ئاشـکرایی و بەرجەسـتەیی پێدەبەخشـن. بەپێی ئەم تێگەیشتنە بێت، هونەرمەند لە ساتەوەختی داهێنان و خەڵقکردندا، هیچ نمونەیەکی پێشتری ئەو بابەتەی نییە کە

لە بەرهەمەکەیدا دایدەهێنێ و مانای پێدەبەخشێ. پێدەچێت وشەی ئەفراندن، یان داهێنان و بەدیهێنان، لەمانای پۆیسیسەوە نزیکتر بن. کەواتە دەتوانین بڵێین: وشەی (پۆیسیس) ئاماژەیە بە داهێنان، وشەی (تەخنە) ئاماژەیە بە پیشەیەک و وشەی (میمیسیس)یش ئاماژەیە بە کاری هونەری.

بەپێی ئەم پۆلێنکردنە حەسەن زیرەک، کەمتر لاساییکەرەوەیە و ئەو کاتەی لاسایی دەکاتەوە، لاسایی کەسایەتیەکی وەکو سەی عەلی ئەسغەری گەورە هونەرمەند دەکاتەوە: (ئەی ڕەفیقانی تەریقەت دەردی عیشقم چارەکەن..)، بەڵام لاساییکەرەوەیەکی خراپە. لەبەرامبەر ئەمەشدا، ئەو لە بەشێکی هەرە زۆری کارەکانیدا، تەخنەکارێکی کارامەیە و بەدڵنیاییشەوە بەردەوام: ئەفرێنەرێکی مەزنە. ئەو بەدیهێنەری ڕەوتێکی نوێیە لە گۆرانی و مۆسیقای کوردیدا، کە بۆ قسەکردن لەسەر لایەنە مۆسیقاییەکەی پێویستە گوێ لە پسپۆڕانی ئەو بوارە بگرین. وەلێ هەمووومان دەتوانین سەبارەت بە کاریگەریی دەنگ و مۆزیک و گۆرانیەکانی ئەم مرۆڤە لەسەر ناخی خۆمان، قسەی خۆمان هەبێ. ئەم قسەکردنەش لەسەر حەسەن زیرەک، لەلایەکەوە گرنگی و بایەخ و پێویستیی هونەری ئەو بۆ سەر ڕۆح و جیهانی ناوەکیمان ئاشکرا دەکات و لەلایەکیتریشەوە، وەڕسیی ئەم ساتەوەختەمان لەلافاوی ئەو هەموو بەرهەمە بۆ ئاشکرا دەکات، کە تەنیا بۆ مەسرەفکردنی ڕۆژانە بەرهەمهاتوون و بەدەگمەن تینوێتیمان دەشکێنن. پشتگوێخستنی هونەری حەسەن زیرەک بە کەناڵ و میدیا بە کلیپ مەستبوو و بێهۆشکراوەکانی کوردستانەوە، زۆر دیارە. ئەوان بە نومایشدانەوە گیرۆدەبوون و لە زۆرینەی کاتدا لە هونەر و جوانی بەتاڵ. من ئەوەندەی گۆرانیبێژ دەبینم کە گرێ و هەستکردن بە کەمایەتیەکانی

خـۆی نومایـش دەکات و لە کەنار سـیمای «کچـە جوانەکەی ناو کلیپ»دا سـیما و سـەلیقەی خۆی دەخاتە پەراوێزەوە، بەزەییم بە داهێنەرێکی گەورەی وەک زیرەکدا دێتەوە، کە نە دەنگی لەو کەناڵ و میدیایانەوە دەبیستم و نە سیمایشی دەردەکەوێ. باشتر، چونکە بیرکردنـی ئـەو ناچـارم دەکات، خۆم لەو تەلەفزیـۆن و ڕادیۆیانە بدزمـەوە و لەگـەڵ ئاوازەکانـی ئەودا گەشـتێک لەگـەڵ دەنگێکدا بکەم، کە بێگومان لە سـەدەیەکدا بەرجەستەکەر و پەروەردەکەری هەسـتی جوانیناسـانەی مرۆڤێکە، کە سەدەی کوشتن و هێرشێکی هەمەلایەنەیـە بۆسـەر ئەم مرۆڤـە. بەڵام دواجار زیـرەک جەنگی خـۆی دەباتەوە، ئـەو جیهانی ئێمـە وەک جیهانـی هونەری خۆی ڕەنگاوڕەنـگ دەکات: جـارێ دەژی و چەندجـار دەمـرێ، گاهـێ دەگـری و گاهێ دەتـۆرێ و گاه هەڵدەپەڕێ، جاری وایە نائومێد و زۆرینـەی جارانیش پڕ لە مەسـتی و هیوا. ئەو کوڕی سـەردەم و نەتەوەکەی خۆی بوو: بەرگریی لەبەرامبەر ناهەمواری ژیانیدا کرد و هەرەسی لەگەڵ هیچ هەرەسێکدا نەهێنا و مایەوە. بەڵام هەمیشە ژیان پەرست و لە عەشقدا مەست و بێئۆقرە و نامۆ مایەوە. دڵنیام حەسـەن زیرەک ئێسـتا لەناوماندا ژیابایە، یان بەتەواوی لە هونەر دوور دەکەوتەوە، یانیش هونەری بازاڕی و شاشـە، دەیقۆسـتەوە و لەگـەڵ «کچەکەی کلیپ»دا، کە بێگومان کورد نەدەبوو، خەریکی تۆران و ئاشـتبوونەوە و جیابوونەوە دەبوو. ئەو ئێسـتا لێرەبایە، دەمـرد. بـەڵام نەک شـوققە و هوتێلیان بەنـاوەوە نەدەکرد، بەڵکو ناوەکەشیان لەسەر کوێرە شەقام و دێبەرە پارکێکیش نەدەنووسی، چونکە لەگەندەڵکردنی گۆرانی و مۆسـیقای نەتەوەکەیدا بەشداریی نەکردووە.

خودایـە کـە تـۆ لە سـەردەمی هـەرەس و هێرشـەکاندا بۆسـەر

نیشــتیمان، حەســەن زیرەکــت بەو کوردانــە بەخشــی، چۆنە ئاوا لەســەردەمی هەرەســی ڕۆح و بێزەوقیدا، لێت ســەندنەوە و کلیپ بارانــت کردن؟ خودایە غەزەبی ئەو کلیپانەیان لەســەر هەڵگرە، کە هونەری ڕاستەقینەیَ بیر بردوونەتەوە و لەهەر کات زیاتر تەنیاتری کردوون. خودایە، با ئەو حەسەن زیرەکە بێتەوە.

مێژووی وڵاتەکەمان تا سەدەی بیستەم چەند خانمە ناودارێکی پێبەخشیوین، کە بە دووبارە و چەندبارەکردنەوەی ناوەکانیان لە بۆنەکاندا، هەم یادیان کراوەتەوە و هەم ئەوەندەش بە گوێمان ئاشنا بوون، کە ئیتر تەنیا لە ڕووی عادەتەوە ناوەکانیان دووبارە دەکەینەوە و یادگارەکانیشیان فەرامۆش. وەلێ لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە، بەتایبەتی لە هەشتاکانی هەمان سەدەوە، چەند ناوێکی دیکە بەناو هەزاربەهەزاری یادوەری پیاوانەی ئێمەدا، خۆیان دەگەیەننە سەدەی بیست و یەکەم و شایەتی لەسەر قەهر و ستەمکارییەکی بێوێنە دەدەن کە لەناو مێژووی نەتەوەیی ئێمەدا، بەسەر هاوڕەگەزەکانیاندا سەپێنراوە. ئەم دەنگانە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆکەدا ئەوەندە زاڵ و زوڵاڵن، کە مرۆڤ، یان (من)ی نێرینەی میراتگری باوکسالاری، بە گوێڕادێران بۆیان، لە قورسایی ئەو ستەمە تێدەگەم کە لەناو مێژوویەکدا بەسەریاندا سەپاوە، بەبێ ئەوەی

بەشـداریم تێدا کردبێ، بـەڵام مێـژووی هاوڕەگەزەکانی منە. منی نێرینەیی میراتێکی خوێناوی و شـەرمەزارانەی بۆ بەجێهێشتووین، کە تەنیا گەورەیی و خۆگری ئافرەتانی کورد بەرگەی دەگرن.
لەو ڕۆژانەی پێشوودا لە بەشێکی ئەو گفتوگۆیانەدا ئامادەبووم کە لە ئەنجومەنی وەزیران سـەبارەت بە گۆڕینی یاسای باری کەسی هاتنە ئەنجام. لەوێبووم و بە گوێی خۆم گوێم بۆ ئەو خانمە کوردانە گرتبوو کە لەدەنگیاندا حوزنی سـەدان سـاڵەی چەوسـاندنەوەیان بەرجەسـتە دەکرد. ئەوان لەوێ ڕووبەڕووی هێرشێک دەبوونەوە کە ڕەنگە هەزاران سـاڵ بێت، لەوانەیە لە سەردەمی ئیمبراتۆریەتی (میدیا)وە، کرابێتە سـەریان و تا ئەم ساتەوەختەش بەردەوام بێت.
بەبینین و گوێگرتن لەو خانمانە، لەلایەکەوە هەستی شاگەشکەبوون و لەلایەکیتـرەوە هەسـتی بچووکبوونەوەی هێواش هێواشـی ئەو (من)ـە مێژووییەی نێرینەیم لەلا دروستدەبوو، کە هەمیشە دووری خسـتومەتەوە لە بینین و ناسین و ڕووبەڕووبوونەوەی ئافرەتانی وڵات و خانمـە هاوزمانەکانـم. مـن لـە ناوەڕاسـتی گفتوگۆکانـدا هۆڵەکەم بەجێهێشت و تا بڵێی مەست و شاگەشکە، چونکە دەمزانی ئیـدی سـەردەمی نوێنەرایەتیکردنی مێینەیی لەلایـەن پیاوەوە، لە کۆمەڵـگا و لە ڕۆشـنبیریی ئێمەدا بەرەو کۆتایـی دەچێت و ئەگەر نێرینەیی باوکسالارانە لە سەدەی بیستەمدا ڕۆحی مرۆڤانەی ئێمەی کـوردی بە زۆر شـێوە کوشـتبێ، ئەوە لەم سـەدەیەدا کوردەکان بە تەسـلیمبوونیان بە ئەقڵی مێینەیی، چانسێکی گەورەی بوونەوە بـە مرۆڤیـان لەبـەر دەمدایە. سـەدەی بیسـت و یەکەم سـەدەی سەرهەڵدانەوەی مرۆڤێکی دیکەی کوردە، کە ئەمجارەیان بەدەستی مێینەکان لەو میراتە کوشندەیە ڕزگاری دەبێ، کە نێرسالاری بۆی بەجێهێشتووە.

(حەکایەتەکان دەگێڕنەوە، دوایئەوەی کوردەکان لە ئەزموونکردنی هەموو ئەو بەڵایانە بوونەوە کە خودا و ئاسمانان بۆیان ناردبوونە خوارەوە، کەوتنە دروستکردنی دۆزەخێک بۆ ئافرەتانیان و ئەوەی لە میراتە دێرینەکەی نێرسالاری و باوکسالاری بۆیان مابۆوە و ئەوەشی لە توانایاندا هەبوو، بەسەر ژنان و ئافرەتانی خۆیاندا هێنا. هەزارانیان خەتەنە کردن، هەزارانی تریان بە زۆر بەشوودان و بە سەدانیان ناچارکردن خۆیان بسووتێنن و سەدانی تریان تێزابرێژ کردن و چەندانی تریشیان ناچارکردن لەژێر دەواری ڕەشی کۆیلایەتی بێهاوسەری (بێوەژنکۆشی)دا بمێننەوە و ئەوانەشیان کە بێدەنگییان هەڵبژاردبوو، ناچاربوون لە کاتی جوتبووندا بە کرۆشتنی لێوی خۆیان ئەو ئازارە لەبیری خۆیان بەرنەوە، کە لە ئەنجامی هێرشی پیاوە ترسنۆکەکانی ناو جێگاوە، دووچاری دەبوون. هەر بەمەشەوە نەوەستان و ئەوان کەوتنە شکاندنی ئاوێنەکان، کوێرکردنەوەی کانییەکان و تەقاندنەوەی ئارایشگاکان و دواجار یاسایەکیان دارشت تاکو زۆرترینیان بەناوی فرەژنییەوە، بکەنە کۆیلە).

لەناو ئەو ژنانەدا کە لە ئاست ئەو شاڵاوانەدا هەوڵی ڕزگارکردنی خۆیاندا، چەند دانەیەکیان سەنگەری شیعریان هەڵبژاردبوو و ئەو هونەرەیان کردە پانتاییەک بۆ بەرجەستەکردنی خودی خۆیان، کە پڕبوو لە خۆزگە و ویستی توانەوە لەناو کوپێک قاوەدا. باسی کەژاڵ ئەحمەد دەکەم، ئەو خانمەی کە قسە لەسەر هەر شتێ بکات، وەک ماچەکانی بۆ ژیان، شیرینتری دەکات و وەک پرانسیپێکی بنەمایی، هەموو حوزنێک دەگەڕێنێتەوە سەر بنەچەی خەندەیەک تاکو پێشکەشی تۆی بکات. ئەم خاتونی ڕووخۆشییە، لە سەردەمێکدا شیعری کردە سەکۆی پەڕینەوە بۆ ناسینی (ئەو)،

بــۆ میهرەبانکردنــەوە و بــە مرۆڤکردنــەوەی، کە ئیتــر پیاو ببووە ئاســن و بەرد. هەر لەبەر ئەوەشــە کە من بــەردەوام کەژاڵم وەک تەنیاترین مێیینەی ئەم وڵاتە بیر دەکەوێتەوە، کە عەشــق و باجێک ئەو لە پێناوی بەرجەستەکردنی دەنگی مێیینەیی خۆیدا بەخشی، بە تێپەڕینی ساڵەکان کردیانە ئەنفالکراوترین شاعیر.

نازانــم کەی و چۆن یەکترمان ناســی و هەرگیز لە نیوکاتژمێریش زیاتر پێکەوە دانەنیشــتین، بەڵام دەزانم ئێمە سەر بەهەمان نەوەی کەرنەڤاڵ و خوێنین. سەر بەو نەوەیەین کە ئەو ڕۆژەی دەچووینە ژووانی خۆشەویستەکەمان، بەسەر مەرگیدا دەکەوتین و ئەو کاتەش لــە کەرنەڤاڵدا و لە ڕیزی شــاییدا دەریاندەهێنایە دەرەوە، بۆ ئەوە بــوو غەرقی نــاو خەمێکی خوێناویمان بکەن. کەســیش لەو نەوەیە لە کەژاڵ وردتر و کچانەتر و ڕاســتگۆیانەتر باسی ئەو کەرناڤاڵ و خوێنەی لە شــیعرەکانیدا بۆ نەکردین. ئەو کە هەر «بە بەرسیلەیی عاشــق بوو»، شــیعری ئێمەی پڕکرد لە دڵخۆشــیی کورتخایەن و لــە کۆژانی باڵابەرز. لە نێوان ئــازاری مێیینەیی خۆی و خۆزگەی مرۆڤانــەدا، پردێکــی لــە وشــەی بوێری دروســتکرد. ئــەو پیاوی خۆشویســت و پیاوەتی لە پێکرد. ئەو ستایشی مێژووی هاوبەشی کرد و لە نووســینەوەی مێژووی مێیینەییدا، ڕیسوای کردین. ئەو لە ســەردەمی بەعســدا دەستی بە دەمییەوە نەگرت و لە سەردەمی ئازادیشــدا خۆی شــەرمکووژ نەکرد. لە شــیعری کەژاڵدا گوێمان لــە نووزە و پاڕانەوە نییــە، هێندەی ئەوەی مرۆڤێک ڕووبەڕوومان دەبێتەوە، کە وابزانین پێویستیمان بە دەستە میهرەبانەکانی هەیە تا سارێژمانکاتەوە لە خۆشەویستی.

نازانم کەی و چۆن و لە کوێ بۆ یەکەمجار یەکترمان ناسی، وابزانم

لە ژوورەکەی خۆی بوو لە (پاشـکۆی کوردسـتانی نوێ)ی ساڵی دوو هـەزار و دوو؟، بـەڵام زۆر پێش یەکتر ناسـین بۆ یەکەمجار لە پاسـێکدا بینیم. لە پاسـێکی پۆلۆنیدا کە بە جادەی سـەهۆڵەکەدا دەیگواسـتینەوە بـۆ پەیمانگای هونەرە جوانەکان. پاسـەکە فۆرمی ئێمـەی گرتبوو، نێرینەیی لەبەر دەڕژا و یـەک ئافرەتیی تیا نەبوو، جێگەش نەمابوو. کەچی ئەوەندەمان نەزانی وەسـتا و دەنگی وتی: ئـا زەحمـەت نەبـێ جێی ئـەو ئافرەتە بکەنـەوە. ئەو بـە هێمنی و لەسەرخۆ و هووشیار هاتە سەر و لە کورسییە سێ نەفەرییەکەی پاڵی دەدا بە پشـتی شـۆفێرەکەوە، دانیشت و منیش وەک هەمیشە، هەسـتی غەریبایەتیم لە شـاری سلێمانی و ترسـی خۆشاردنەوەم لە مەفرەزەکانی تەفتیش، بە کراسـە سپی و پانتۆڵە ڕەساسییەکەی پەیمانگامەوە، ڕایانپێچابوومە کورسـیی دوای دواوەی پاسەکەوە. دیمەنی لادیوار و سەقفی پاسەکە پڕبوون لە وێنەی گۆرانیبێژە تورک و فارس و هیندییەکان و سـەردەمەکەش عاشقی ئەو پۆستکارتانە بوو، بەتایبەتی ئەوانەیان کە ئەگەر لەلاوە تەماشات کردبان، تیلەی چاویـان لێدادەگرتی. سـەردەمەکە سـەردەمی قسـەکردن نەبوو، بەعـس زمانی ئاماژەی زاڵکردبوو بەسـەر زمانی گۆکراودا: دەمی کراوە پڕ دەکرا لە فیشـەک. بۆیە سەفەری ناو ئەو پاسانە چێژێکی تایبەتیان هەبوو. هەمیشـە دەتتوانی لە تەنیشـت ئەو کورسـییەی لە ناو پاسـەکەدا لەسەری دانیشـتبوویت، بە تەماشاکردنی وێنەی کچێ، گووگووشێ، سپیلکانیک و مەهەستییەک و بەبێدەنگی خەمی تەنیایـی خـۆت بڕەوێنیتەوە. ئـەو وێنانە ئەوەنـدەی ئامادەیی ئەو کەسـانەی لـە ڕۆژگاری گەنجێتی و ناوبانگی خۆیاندا بەرجەسـتە دەکرد، ئەوەندەش زیاتر خۆزگە و چەپاوەکانی نێرینەی سەردەمێکی بەرجەستە دەکرد، کە نمونە ئایدیاڵیەکانی مامە ڕیشە و مام ڕۆستەم

و داریووش، ستار و ئیبراهیم تاتلیساز بوون و ناسری ڕەزازیش بەجۆرێ ڕۆحی کردبوو بە بەری «بیست و حەوت ساڵە»کەی (بێکەس)دا، کە باری گرانی بیست و حەوت سەدە دیلێتی بەبیر دەهێنایەوە.
بە هاتنی کەژاڵ بۆناو پاسەکە، شەپۆلێ لە بێدەنگی هەموومانی لە لێژایی بەردەم تەلاری ژووری بازرگانی شۆڕکردەوە خوار. هەستم بە نەرمبوونەوەی پاسەکە دەکرد. ئەو کەمێ نەرمە عارەق لە گەردنی نیشتبوو، ملوانکەیەک لە ملی و جووتێ گوارەی شۆڕ لە گوێدا و بزەیەکی هەمیشەیی لەسەر لێو. پاش کەمێ زۆر بە لەسەرخۆییەوە کیفی پارەکەی کردەوە و ویستی خۆی باداتەوە تاکو کرێی پاسەکە بدات، بەڵام لەو کاتەدا دەستی ئەو پیاوەی کە ئیتر دەبوو تا ویستگەی داهاتوو بە پێوە لەلای دەرگاکەوە بوەستێ، لەشێوەی پاڕانەوەدا کرێکەی لە کەژاڵ وەرگرت و دایە دەستی شۆفێرەکە. (لەبەرامبەر بەخشندەیی مێیینەدا، دەستگرتنەوە، پیاو لە نێرێتی و هەتیویی ڕزگار دەکات). کەژاڵ، وەک ئەوەی هەستیکردبێ تازە بەهاتنی ئەو، کەس تەماشای وێنەکانی ناو پاسەکە ناکات، کیفەکەی داخست و لە پەنجەرەکەوە بە ئارامی نیگای بڕییە دەرەوە. نازانم ئەو هەموو تەماشایە دڵی خۆشکردبوو، یان نەیدەتوانی لەبەرامبەر نیگای داریوش و ستارە دڵشکاوەکانی ناو پاسەکەدا، بەرگەی ئەو هەموو بۆکڕووسی ئاهە بگرێ..
ساڵەها لەوەدوا، ئەوکاتانەی لە دانمارک لەناو شەمەندەفەرەکاندا شیعری کەژاڵم دەخوێندەوە و هەستمدەکرد ئەوانەی ئەمبەراوبەرم لە سیمای خۆرهەڵاتیانە و غەریبانەی لاوێتیم دەڕوانن، بە نیگای کەژاڵی ناو پاسەکەوە، دەمڕوانییە ئەو دیو پەنجەرەی شەمەنەفەرەکە. نازانم ئەو چی دەبینی و تەماشای چیدەکرد، بەڵام وێدەچێ نیگای

تاقەکچێکی ناو پاســە پۆڵۆنیەکانی ئەوســای ســلێمانی، زۆر دوور نەبــێ لە نیگای پەنابەرێکی شــەرم لەخۆکردوو لە شــەمەنەفەرێکی وڵاتی غوربەتدا. ئەگەرچــی ئەوان لە ڕەگەزدا جیادەبنەوە و مێژوو یەکێکیانی کردۆتە جەللاد و ئەویتریشیان بە قوربانی، وەلێ لە ئاستی تاکەکەســیدا نیشــتیمانی ڕاســتەقینەی هەردووکیــان و کچ و کوڕە هاوشێوەکانیان غەریبایەتیە و هەستکردنیانە بە نامۆییەکی کوشندە، کە وایان لێدەکات هەمیشــە لەدەرەوەی ئــەو واقیع و دەوروبەرەی تیایدا دەژین، لە دەرەوەی پەنجەرەکان، بۆ نیشــتیمانی ڕاستەقینەی ڕۆحیی خۆیان بگەڕێن. کەژاڵ ئەحمەد نیگایەکی بەردەوامە لە ناخێکی هەستیارەوە بۆ دەرەوەی واقیعێک، بۆ ئەو دیو پەنجەرەکانی سەفەر، کە حورمەت و ئازادیی ئەو تیایدا ناگاتە کەمترین ئاستی ئەو مافانەی هــەر پەنابەرێک لە هەندەران بەدەســتیان دەهێنێ. کــەژاڵ هەرگیز نەبووە پەنابەری هیچ وڵاتێکی تر، شــیعری ئەو لە چوارچێوەی ئەو ئازادیــە شــەرمنانەی (بەندەری بەرمۆدا) و (نیشــتیمانی تیرۆر)ـەدا لــە شــەقەی باڵیدا، کــە پڕ بوو لــە وادەکانی نەهاتــن و ناوازەترین ئازارەکان و پیاوە ئاســنینەکان. کەس لە پاســەکەدا ئەوی نەدەبینی، چونکــە هەمووان تەماشــایان دەکرد. کاتێ لە ســاڵی دوو هەزار و دووشــدا لە ژوورەکەی خۆی، لە کوردستانی نوێ بینیمەوە، ئەو بە چاوە گەشــەکانییەوە، لە پشت مێزەکەیەوە هاتە بەرامبەرم دانیشت و جاروبار دەســتی خۆی بە عەلادینەکە گەرم دەکردەوە. بۆســاتێ بیرمکردەوە: ئەوە هەمان ئەو چاوە پڕنیگایانەن کە ساڵەها لەوەپێش لە پەنجەرەی پاســە پۆڵۆنیەکەدا قەتیس مابــوون و ئەوەش هەمان ئەو دەستانەن کە هەرگیز واژووی شەڕێکیان نەکرد. کەژاڵ ئەحمەد، ئەو کچەی لە ڕۆژگارێکدا کە دەمانویســت زۆرترین درۆمان لەگەڵ بکرێ، ئەو ڕاستگۆیی هەڵبژارد.



## پێکەنین و ئازادی:

## عەلادین سەجادی

یەکەم ناسینم بۆ مامۆستا عەلادین سەجادی و (ڕشتەی مرواری) ییەکـەی، ڕێکەوتـی قۆناغـی موو لێهاتـن و دەنگ گـڕی و زیپکە دەرهاویشـتنم بوو. ئەو قۆناغەش قۆناغێکی ئاسـایی گەورەبوون و سـەرەتای شـەرمکردنەوەیە لـە گۆڕانێـک، کـە هەروەکچـۆن قەبوولکردنـی لەلایەن دەوروبەرەوە بێکێشـە نیـە، ئا بەوجۆرەش شـاردنەوەی لە کەسـانیتر، ئاسـان نییـە. ئاخر، مـرۆڤ تا دوێنێ دەنگێکی ناسک و ئاسایی هەبوو، کەچی ئەمڕۆ کە قسان دەکا وەک ئەوەیـە دارێک لە تەنەکەی بخشـێنی. جاران ڕووخسـارێکی ئارام و سـاف و ئەمێسـتاش زیپکـە و دوومەڵ بەجۆرێ دایانپۆشـیوە، کـە مرۆڤ فریای تەقاندن و سـڕینەوەیان ناکەوێ و زۆرجارانیش لە پێناوی شـاردنەوە و ئاساییکردنەوەیان، لەگەڵ لەتە ئاوێنەیەکی شـکاو، پەنا بۆ ئاودەسـتی مزگەوتێک یان کونجێکی ماڵ دەبات تا لەخۆی و گۆڕانە ناوەختەکانی لەشـی خۆی بڕوانێ. ئەوە دۆخێکی

ناکۆمەڵایەتـی گووشـارهێنەرە، کـە هەمـوو هەرزەکارێـک پیایدا تێدەپەڕێ، ئەگەرچی هەمووومان نامانەوێت بیرمان بکەوێتەوە. وەلێ من ئەو ڕۆژگارە تەنیاییە دوور لە کۆمەڵیانەی گۆشـەوکەنارەکانی ماڵ و ناو ئاودەستێ مزگەوت و کەلێن و پاسارەکان بەبیری خۆم دەهێنمـەوە، تـا بزانم چۆن توانیم خۆم لە شوناسـێک ڕزگار بکەم کە دەکرا بەسـەرمدا بسەپێ و شوناسێ دروست بکەم، کە بۆخۆم پێویستیم پێی هەبوو دروستیبکەم. ئا لەو قۆناغەی ژیانمدا، لە نێوان تێڕوانینی خۆم بۆخۆم و تانە و تەشەری ئەوانیتر لە سیما و دەنگ و ڕووخسارم، عەلادین سەجادیم ناسی و هەر زوو زانیم ئەو مەلایەکی خۆشخوان و دەوروبەر ئاوەدان و زانایەکی گەورەی وڵاتەکەمە. لە پێش (مێژووی ئەدەبی کوردی)یەکەی و پاشـان بەرهەمەکانیتریدا، لەگەڵ (ڕشـتەی مرواری)یەکەی گۆشەگیریم کردبووە پیشە و بەو پێکەنینـەی لە ئەنجامی خوێندنەوەی ئەو زنجیرە کتێبەوە لە ناخمدا دروسـتدەبوو، هەم خۆم و هەم قسەی ئەوانیترم بیر دەچۆوە. ئەو پێکەنینە دەسـتێک بوو، فریادڕەسـێک بوو منی لە ناخی تراژیدیای گۆڕانە بایۆلۆژیەکانی لەشـی خۆم و ئەو سـاتەوەختانە دەردەهێنا کـە بەهۆیانەوە ئەمن دەبوومە قەشـمەجاڕ و جێگەی گاڵتە پێکردن و توانـج لێدانی ئەوانیتر. من بەو گۆشـەگیرییەم، لـە ناخدا گەورە دەبووم و وردە وردە کەوتمە سـەرئەوەی نەک هەر تەنیا پێبکەنم و لەو عەبووسییەی شـەرمکردنەوەلەخۆم، تیامدا دروستیکردبوو، ڕزگارم ببێ، بەڵکو ئیدی دەمتوانی قاقا بەخۆشم پێبکەنم و بوێریی ئەوەم هەبێ، قسـە و توانجی ئەوانیتر لە هەڕەشـەی دەرەکییەوە، بکەمە سـاتەوەختێکی شـادی ناو ناخی خۆم، کە تیایدا منیش وەک ئەوانیتر هەم پێبکەنم و هەم بەخۆشم پێکەنینم بێت. ئیتر بیرکردنەوە لە تانە و تەشـەری ئەوانیتر، دڵی ئـازار نەدەدام و خەفەتم بەخۆم

نەدەخوارد، بەڵکو لە ناخی ناخەوە دەمدایە پێکەنین و «حیلکەحیلک».
ئەوکاتەش پێیاندەگوتم: لێیگەڕێن، شێت بووە..
ئـەوە سرووشـتی مرۆڤە کە دەتوانـێ پێبکەنێ. بـەڵام من پێموایە پێکەنیـن، ئەوەنـدەی توانایيەکی سرووشـتی مرۆڤە بـۆ دەربڕینی شادی ئەوەندەش زیاتر کەلتوورێک هەیە ستایشی پێکەنین دەکات و مرۆڤەکان لەسەر ڕووخۆشيی و شادی و پێکەنین، پەروەردە دەکا.
مـن بڕوام وایە مرۆڤ بە زۆر بهێنرێتە پێکەنین جوانترە لەوەی بە سرووشتی خۆی مڕومۆچ و ڕووگرژ و عەبووس بێت. هەموو ئەو فەیلەسـووف و بیرمەندانەی لەبارەی پێکەنینەوە بیریانکردۆتەوە و نووسـیویانە و لەوانەیە پێکەنینیشـیان گرتبێ: (هۆبز، شۆپنهاوەر، فرۆید و برگسـۆن..)، باس لەو ڕاستییە مرۆییە دەکەن و لە هەوڵی وەڵامدانەوەی پرسـیاری لەم بابەتەن: ئایا چ شـتێ ئێمە بە پێکەنین دەهێنـێ؟. پێکەنیـن لە ئەنجامی پووچی و بێمانایی و شـتی ناکۆک و چاوەڕواننەکـراوەوە بێت، یـان پەرچەکردارێکی عەقڵانی یاخود سـۆزگەرایانەی مـرۆڤ بێـت، یانژی لـە ئەنجامی بێدەسـەڵاتی و بێتوانایی و هەرشـتێکیترەوە بێت، بەشـێکە لە سرووشـت و ناخی هـەر مرۆڤێک. تەنانەت ئـەو مرۆڤانەی هەرگیـز نایانەوێ پێبکەنن و حەزناکەن پێکەنینەکەیان ئاشـکرا ببێـت، دەتوانن پێبکەنن. بەڵام وەک کۆلاکۆفسـکی فەیلەسـووفی پۆڵۆنی دەنووسێ: خۆشتەبعی، قۆشمەیی و شیرینزمانی، دیاردەیەکی دەگمەنە و پەیوەستە بەوەی تاکەکەس چەندە دەتوانـێ مەودایەکی گاڵتەجاڕانە لەخۆی بگرێ و لە دوورەوە بەخۆی پێبکەنێتەوە: «جیاوازیی کەسـێکی قۆشـمە و قسـەخۆش لە هەرکەسـێکی تر کـە دەتوانێ پێبکەنێـت، ئەوەیە کە هـەر مرۆڤێ دەتوانێ بەو نوکتانەی گوێی لێیان دەبێ، یان بۆخۆی دەیانگێڕێتـەوە بداتـە قاقـای پێکەنین، وەلێ تەنیـا ژمارەیەکی کەم

دەتوانــن و بوێــری ئەوەیــان هەیە بەخۆیــان پێبکەنــن». ئەمەیان هونەرە..

عەلادین سەجادی، ستاییشــکەری بێنمونەی کەلتووری پێکەنینە لە دنیای ئێمەدا. لەپێش ئەودا، دەنگی قاقای شێخ ڕەزای تاڵەبانی و مەلا ئەحمەدی نالّبەند، لە بادینان، هاتوونەتە گوێم و گەلێکیش لەگەڵیاندا پێکەنیوم. وەلێ لە سەدەی بیستەمدا کەسێکی دیکەی وەک عەلادین سەجادی لە بواری تۆمارکردن و بەرجەستەکردنی گوتاری پێکەنیندا، نایەتەوە بیرم. پەیکەری ئەو پێویستە بەرجەستەکەری کەسایەتیەک بێت کە بە گێڕانەوەکانی، بە ڕشتەی مرواریەکانی، نەتەوەی خۆی هێناوەتــە پێکەنین، بەجۆرێ کە بە تەماشــاکردنی ئــەو پەیکەرەی ورەی بەردەوامی و ویســتی ئازادبوونمان لــە دووبارەبوونەوە و ڕووخان، تێدا زیندوو بکاتەوە..

لەپاشــاندا و لە قۆناغێکــی دیکەی تەمەنمدا، کە دەبــوو پێبکەنم بۆ ئــەوەی نەمرم، کاتێ هەمدیســان ڕشــتەی مرواریــم دەخوێندەوە، عەلادین ســەجادیم وەک یەکەمین مرۆڤێک دەهاتەوە پێشــچاو کە بە ڕیوایەتکردنی ئەزموونە ڕۆژانەییەکانی ژیانی کوردی پێدەکەنێ و لە هەمان کاتیشــدا دەمانخاتــە پێکەنین و بەخۆمانپێکەنین دەکاتە ســەرچاوەی شــادیی و خۆشــتەبعی و خۆشــحاڵیمان. لێرەشەوە، ڕشــتەی مرواری ڕەوایەتیدانــە بە ڕەهەنــدی کۆمیکیانەی ژیان و گێڕانــەوەی ئەزموونــە لــە فۆرمێکــی شــادیبەخش و کۆمیدیانەدا. عەلادین ســەجادی بــە تۆمارکردنی ڕەهەنــدی کۆمیکیانەی ژیانی کوردەواری، ئەو گۆشــەگیرییەی کوردمان بەدەســت تراژیدیاکانی ژیانــی مێژوویــی خۆیەوە پیشــاندەدا، کــە لە قۆناغــی تێپەڕین لە شوناســێکەوە بــۆ بەدەســتهێنانی شوناســێکیتر، لەجیاتــی ئەوەی دووچــاری خەمۆکی بــکات، دەبێتە قاقا و پێکەنین و خۆشــتەبعی.

ئەو ئەزموونانەی سەجادی تۆماریان دەکات، ئەزموونی ئاسایی مرۆڤی ئاسایی ناو واقیعێکی تاڵ و ژیانێکی جەبریانەن، کە تەنیا کار و زەحمەتکێشان و عەرەقڕشتن، سەرچاوەی مانەوەی نین، بەڵکو پێکەنین و گاڵتەجاڕیش بەو ژیانە و لەناو ئەزموونەکانی ئەو ژیانەدا، بەشێکی گرنگن لە بەرگریکردن لە خۆ و بەرزکردنەوەی ورەی مرۆڤ بۆ بەردەوامی و مانەوە. پێکەنینی میللەتێک لە ڕۆژگارە تاڵ و لەناو ئەزموونە تراژیدیاکانییەوە، ئیرادەی ئەو میللەتەمان بۆ گەیشتن بە ئازادی بۆ ئاشکرا دەکات: پێکەنین و کەلتووری شادی، بەشێکی گرنگن لە ڕێگای گەیشتن بە ئازادی، چونکە دۆخی عەبووسی و تووڕەیی و خۆ مۆنکردنەوە، دۆخێکی نائازادانەن و مرۆڤ لەسەر بوون بە ستەمکار ڕادەهێنن. لە کاتێکدا پێکەنین و شادی و خۆشڕوویی، سرووشتێکی کۆمەڵایەتیانەی هەیە و بانگهێشتێکی هەمەلایەنەیە بۆ پێکەوەبوون و لەگەڵ یەکتر بوون. هەر لێرەشەوە، خەندە و ئەو شتانەی دەمانهێننە پێکەنین، فرە ڕەهەندن و عەبووسی و گرژوومۆنیش تاکڕەهەند. پێکەنین گەرمکەرە، خرۆشێنەر و کۆکەرەوە و تەبایی دروستکەرە. مۆنی و عەبووسی، ساردکەرەوە و چەپێنەر و پەرتەوازەیی دروستکەرن. هەموو ئەوانەی لە ساتەوەختێکدا ڕۆحی شەڕانگێز و ستەمکارانەی چەپاوی خۆیان بەشێوەیەکی نائاگایانە بەیان و بەرجەستە دەکەن، قریوەی پێکەنین بە «حیلکەحیلک» و «هەراهەرا» و «قریووهوور» وەسف دەکەن. لەکاتێکدا ئەوانەی لە مانای ئازادیَ و تەبایی تێدەگەن، هەمیشە پێکەنین و پێکەنیناویکردن و بەشادی ژیان، بەشێکە لە خەباتەکەیان. لەناو سەنگەرەکانی جەنگ و ژیانی پێشمەرگەی جاراندا، بەردەوام پانتاییەکی فراوانی دروستکردنی نوکتە و قسەی خۆش و پێکەنینهێنەر ئامادەیی هەبووە و ئەو کەلتوورەش ورە

و وزەیەکـی زۆری پێبەخشـیون تاکـو بەرگەی مەرگەسـاتەکانی ئەزموونەکەیان بگرن.
سـەبارەت بـە پەیوەندیـی پێکەنین و ئـازادی، میکاییـل باختین لە یاداشـتەکانیدا نووسـیویەتی: «تەنیـا کەلتـووری دەقبەسـتوو و سـتەمکارییەکان بەشـێوەیەکی تاکڕەهەنـد شـێلگیرن. توندوتیژی پێکەنین ناناسێ. پێکەنین ڕێگای مرۆڤ داناخات، بەڵکو مرۆڤ ئازاد دەکات». با بپرسـین: ئاخـۆ پێکەنین چ پەیوەندییەکی بە ئازادییەوە هەبـێ؟ پێکەنیـن دەنگی کەرناڤاڵ و شـایی و ئاهەنگەکانە و مانای ئازادیش لەو بۆنانەدا فراوانترە وەک لە مانای ئەو چەمکە لە ژیانی ڕۆژانەدا. مرۆڤ ناتوانێ هەموو ڕۆژێکی شایی و ئاهەنگ بێت، بەڵام بـۆی هەیە قۆناغێکی ڕەنجکێشـان لە ئاهەنگێکـدا، کە تەنیا ڕۆژێک دەخایەنێ، کورتبێتەوە. وەلێ ئەو ڕۆژە لە ژیانی مرۆڤەکاندا مەزن و بەنرخە. باختین نوسـیویەتی: «هەرشـتێ بەڕاسـتی مەزن بێت، دەبێ ڕەگەزێکی لە پێکەنین تێدابێ، دەنا هەڕەشـەئامێز، مەترسیدار و بە ئەرک، یان سنووردار دەبێ».
هیچ کەس لە کوردەکان، لەسـەدەی بیسـتەمدا وەک سـەجادی لە مانای پەیوەندیی پێکەنین و ئازادی تێنەگەیشت و هیچ کەسیش وەک ئەو، ئەو ڕۆژانەی لە ژیانی مرۆڤی کوردا نەمر نەکردن، کە تیایاندا ئـەو میللەتە پێکەنیوە و ئازاد بووە. سـەجادی مێژوویەکی دیکەی کوردەکانی نوسییەوە، کە تیایدا ئەوانی نەک وەک مرۆڤی عەبووس و تووڕە و تۆڵەستێن بەرجەستە کردووە، بەڵکو وەک بوونەوەری قۆشـمە و قسـەخۆش و بەرهەمهێنەرانی پێکەنین و شادی ناساند، وەک تینووە ڕاسـتەقینەکانی ئـازادی و وەک ئەو مرۆڤانەی کە بە هـۆی کەلتووری پێکەنینـەوە لەناو ژیانێکی داگیرکـراودا، ئیرادەی خۆیان بۆ ژیان ئاشکرا دەکرد. نرخی ڕشتەی مرواری لە ڕۆژگاری

ئەمڕۆکەدا، کە پێکەنینمـــان بیرچۆتەوە، لەهەر کات زیاترە. ئەویش بە پێنج بەڵگە:

یەکـــەم: پێکەنین لـــە زەمەنی نایەکســـانیدا، بەدیهێنـــەری جۆرێ لە یەکســـانیە، بەتایبەتی لە ئاســـتی دەروونی و مەعنەویدا. من بۆخۆم پێموایـــە هەمیشـــە هـــەژاران لە پێنـــاوی ژیانـــی مادیدا، لـــە هەوڵی گەیشتن بە یەکســـانیدان لەگەڵ دەوڵەمەندان، وەلێ دڵنیام هەژاران لـــە دەوڵەمەندەکان زیاتر پێدەکەنـــن. بۆیە ئەوە دەوڵەمەندەکانن کە پێویستە لە پێناوی ژیانی مەعنەویدا فێری پێکەنین و تریقەی هەژاران ببن و خۆیان یەکسان بکەنەوە. بەهەمان شێوە لە کۆمەڵگای ئێمەدا هەمیشە دەنگی پێکەنینی پیاوان بەرزترە لە قاقای خەندەی ئافرەتان، وەلێ ئەگەر خانمەکانی ئێمە زیاتر لەوەی دەگرین، پێبکەنن، دەنگیان ئاوەدانی بە وێرانە دەبەخشی.

دووەم: لـــە ڕۆژگاری درۆکردن و دووڕوویـــی و مەراییکردندا، کە هەموویان بواری ئاشتی تەســـکدەکەنەوە و فیتنەیی و دووبەرەکی و پەرتەوازەیـــی لە ژیانی مرۆڤدا دەخوڵقێنن، پێکەنین یارمەتیدەری مرۆڤـــە بـــۆ کرانـــەوەی بـــەرەو ئەوانیتـــر و ڕاســـتگۆیی و متمانـــە دروســـتکردن. مرۆڤ کە پێدەکەنێ جوانە و جوانییش بەخشـــینەوە و بەخشندەیی ئەو هەستە ڕاستگۆیانەیە کە مرۆڤی پێدەناسرێتەوە. مـــرۆڤ لە ناســـینەوەدا، لەوەی کە چۆن مرۆڤـــە و ماهییەتی چییە، دەبێتە جێگەی متمانـــە و یەکڕوویی جێگەی دووڕوویی دەگرێتەوە و ئەوکاتـــەش دەتوانین بەو جۆرە لەگەڵ یەکتردا بژین، کە بۆیەکتر پێویستین، نەک زیادە. بەهەشتی یەکترین، نەک دۆزەخ.

ســـێیەم: لـــە ڕۆژگار و پاشـــماوەی ڕۆژەکانی جەنگ و شـــەڕەکان (شـــەڕی سەنگەر و شەڕی دەروونی)، مرۆڤ پێویستییەکی زۆری هەیە بە پێکەنین. چونکە ئاشـــتی لە پێکەنین، لەو بزە و خەندەیەوە

دەستپێدەکات، کە لایەنەکان دەیبەخشنە یەکتر و زمانی پێکەنین، فۆرمێکی زمانیی پێش ئاخاوتن و گوتنە. منداڵ بەرلەوەی قسان بکا، بۆ پڕکردنەوەی ئازارە بایۆلۆژییەکانی و بێدەسەڵاتی خۆی، دەگری، وەلێ بۆ سەلماندنی خۆی وەک هەستەوەرێک، پێدەکەنێ و دەتریقێتەوە و بەوەش ژیانی ئێمە دەوڵەمەند دەکا و ئاشتی و ئاوەدانیمان بەسەردا دەبەخشێتەوە..
چوارەم: کۆمەڵگای ماتەمگێڕ، ئەو کۆمەڵگایەی بەهایەک بۆ عەبووسی و توورەیی دادەنێ، کۆمەڵگایەکی تاکڕەهەند و تاک دەنگە، وەلێ پێکەنین کرانەوەی کۆمەڵگایە بەرەو فرەڕەهەندی و فرەدەنگی. وەک کۆلاکۆڤسکی دەڵێ: ئەوکاتە پێکەنین گرنگیی خۆی هەیە کە دڵنیامان کاتەوە لەوەی ئەگەر واقیع هێندە بە جیدی نەگرین و بەردەوام لە پرسەکانیدا دانەنیشین، ئەوەندەش هەڕەشەئامێز و مەترسیدار نیە. نوکتەکانی سەردەمی بەعس و ئۆردوگاکانی ستالین و قۆشمەیی زیندانیە سیاسیەکان لە ژوورەکانی چاوەڕوانی سێدارەدا، بەڵگەی ئەو قسەیەن.
پێنجەم: ئیمان و بڕواهێنانیش پەیوەستییەکی جەوهەرییان بە پێکەنینەوە هەیە. لە ئاییندا جیهان شوێنی تاقیکردنەوە و دەرد و ئازارە و ئەگەر خۆمانی بەدەستەوە بدەین، زۆر بواری شادی و پێکەنینمان بۆ ناهێڵێتەوە. بەپێی تەورات و قورئان، یەزدان و خودا بۆخۆی جەوهەرێکی خۆشڕوو و شادمانانەی هەیە: (قل بفچل الله و برحمته فبڑالک فلیفرحوا). شاعیرانیش گوتویانە:
(بە جهان خرم از انم کە جهان خرم از اوست
عاشقم بر همە عالم کە همە عالم از اوست).
بۆیە ئەگەر ئەمڕۆ لە کۆمەڵگای ئێمەدا عەبووسان بە ناوی ئایینەوە، پێکەنینمان لێقەدەخە دەکەن، پێویستە ئەسڵی شادمانی یەزدانییان

بیر بخەینەوە و بە پێکەنینەوە، لەباری قورسیی ژیان و ئازارەکانمان کەمبکەینەوە. لە گوتاری سەجادیی نەمردا، ستاییشکردنی پێکەنین، بەشێکە لە ستاییشکردن و پەیوەندیی نێوان یەزدان و مرۆڤ. مرۆڤی بڕواداری ڕاستەقینە، پێش هەمووشتێ خۆشتەبع و قسەخۆش و پێکەنینهێنەرە. ڕێگای پەیوەندیگرتن و چوونەوە لای خوا، بۆ سەجادی زۆرن، پێکەنین خستنەسەر زار و شادومانکردنی خەڵک یەکێکە لەو ڕێگایانە کە سەجادی ئەو پەیوەندییەی ناوەناوە: ڕشتەی مرواری.

٢٠٠٨/٤/٢٨ هەولێر



# پانتاییەک بۆ تراژیا و کەرنەڤاڵ

**ئەحمەد سالار**

پێشئەوەی لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی بەدیداری شاد بم، لە مەجلیسەکانی ماڵی خۆماندا، شەوانە ناوی دەهات و لە مەدحەوە تا هێرشی دەکرایە سەر. پاشان لە نومایشی (پیسکەی تەڕپیر)دا ناسیم و دوایئەوەش لە هۆڵی نەقابەی کرێکاران گوێم بۆ کۆڕێکی گرتبوو لەسەر مێژووی شانۆ، یان بابەتێکی تر بوو، کە ئیتر لەبیرم نەماوە.

ئەحمەد سالار ناوێکی ئەوەندە درەوشاوەیە، کە مرۆڤ پاش گوێبیستبوونی چەندجارەی ئەم ناوە، ڕووناکییەکی ئەوەندە بە تینی بیردەکەوێتەوە، گەرمایی دەخاتەوە ناو تاریکترین دڵێک، کە بڕوای بە داهاتوو نەماوە. هیچ شتێ لەو مرۆڤە سەلارەدا ئەوەندەی ئیرادە مەزنەکەی بۆ بەردەوامی و ماندوونەناسییەکەی لە کارکردندا، سەرنجڕاناکێشێ. ئەو تاقگەیەکە، نە کەمدەکا، نە لێڵ دەبێ و نە بەدەوری خۆیدا پۆنگ دەخواتەوە، ئەو لە ڕێکردنی بەردەوامی

خۆیدا، پاکژی بە هەموو ئەو گیانانە دەبەخشێ، کە گەرد لە ڕۆحیان نیشتووە و ئومێد لە دڵیاندا نەماوە. لە پەیمانگای هونەرەجوانەکان، کاتێ لە ژووری مامۆستاکانەوە بە پلیکانەکاندا دەهاتە سەر، هەستمدەکرد زەویەکەی ژێرپێیشی وەک ئێمەی قوتابی، دڵی خۆی ڕاگرتووە، تا ئەو مامۆستایە بەسەریدا بڕوات. پێشئەوەی لە دەرگا بێتە ژوورەوە، دەنگ و (نوور) و قورساییەکەی لە دڵ و نیگاماندا بوو، کاتێ بۆخۆشی دەردەکەوت، وەک ئەوە وابوو، دیمەنەکە بچێتە ناو چوارچێوە و قاپی خۆیەوە. یەکەم قسەی (ڕۆژتان باش) بوو، کە ئێمە واماندەزانی ئەو دەستەواژەیەش لەو ڕۆژگاری بەعسەدا، مانایەکی بەرگریکەرانەی هەیە چونکە لە زمانی ئەوەوە دەیبیستین..

لە پۆلدا وانەی (مێژووی شانۆی) پێدەگوتین، بەتایبەتیش جەغدی دەکردەوە سەر شانۆی گریکیی کۆن، کە بەلای ئەوەوە لوتکەی ئەو هونەرە بوو. ئەو هەمیشە لە ئاستی لوتکەشدا قسەی دەکرد. سالاری مامۆستا، ئەوەندە دڵسۆزی هونەرەکەی و شارەزای بەهرەی خۆی بوو، کاتێ باسی یۆنانی کۆنی بۆ دەکردین، ئێمەی دەبردە کەشوهەوایەکی ئەوەندە ئەفسووناوییەوە، کە حەزبکەین هەر لەوێ نەیەینەوە بەشکم ئەسخلیۆس، یان سۆفۆکلیس لێمان پەیدا ببێ و باسی فەلسەفەی تراژیدیامان بۆ بکات. من ئەگەر بۆخۆم لەو سەفەرە خەیاڵییەمدا نووسەری شانۆیی (ئۆدیب پاشا)م دەبینی، لێمدەپرسی: باشە کاتێ چارەنووس بۆ ئۆدیبی بڕیوەتەوە کە باوکی بکوژێ و لەجێی ئەو ببێتە پاشا و دایکی خۆی مارە بکاتەوە، بۆچی ئەو دەمەی غەیبگۆکان ئاشکرای دەکەن کە تاوانبار لە کۆشکدایە، ئۆدیب ئەوەندە سوورە لەسەر گەڕان بەدوای ڕاستیدا؟ ئاخر ڕاستیی سەرت دەخوات. ئێستە تۆ کە پادشای،

ژیان و گوزەرانت دەسووڕێ، ژن و منداڵی خۆت هەیە و میللەتێکی دەستەمۆی ملکەچت بۆ هاتۆتە سەر چۆک، وەک هەر پاشایەکی تر، بخۆ و بکە و بژی، چتداوە لە حەقیقەت و دۆزینەوەی؟ کوا لە مێژووی پاشاکاندا پێشینەی گەڕان بەدوای ڕاستیدا هەیە؟ من دەمەوێ بزانم نوسەری ئەو تراژیدیایە لە خۆشەویستییەوە بۆ حەقیقەت ئەوکارە دەکات، یان لە خۆشەویستییەوە بۆ ئۆدیب وەک پاشایەکی نمونەیی؟
هەرگیز ئەوەندە لە ژیانی تایبەتیی ئەحمەد سالار نزیک نەبوومەوە، تا بتوانم لەو هاوسەنگییە تێبگەم کە ئەو لە نێوان کۆنیی شانۆ و بۆنی عەترەکانیدا دروستیکردبوو. لە نێوان تراژیدیاکان و خەندە و قۆشمەییەکانی خۆیدا. لە نێوان شکست و کەرنەڤاڵەکانیدا. ئەو هەمیشە باسی قارەمان و ئەفسانە و تراژیدیا کۆنەکانی بۆ دەکردین، بەڵام بەردەوام بۆنی خۆش و ئەمڕۆیی و گەنجانەی لەخۆی دەدا و وەک مامۆستایەکی کەشخە، سەرەمان دەبەست تاکو لە میانەی گوێگرتنمان بۆ زانست و گوتەکانی، بە بۆنی شەماڵی عەتر و هاژەی سنگفراوانییەکەی، مەست بین.
ئەو کاتانەی بیر لە یەکەمین یەکترناسینم لەگەڵ ئەحمەد سالار، دەکەمەوە، سەرم دەسووڕمێ لەوەی ئەو هەموو ئومێدە چیبوو لە ناخی مندا چاندی. دڵنیام بەشێکی پەیوەندیی هەبوو بە دۆخیی عاشقیی ئەوەوە: هێندە نەبوو نەجیبەخانی کردبووە دەزگیران، یان هاوسەری خۆی. من پاشتر زانیم هەموو عاشقەکان ئومێدبەخش و لالێکەرەوەن. بەشێکیشی پەیوەست بوو بە سرووشتی خۆیەوە کە حەزی لە ڕووخاندن و ساردکردنەوەی کەسەکان و بەتایبەتی گەنجەکان نەدەکرد. لە ڕۆژگارێکدا کە هیچ داهاتوویەک نەبوو، من نامیلکەی (ئەفسانەی خۆشەویستی)م پێشکەشکرد و ئەو بە

قســەکانی پڕیکردم لە داهاتوو. پێشــنیاری کرد فیلمنامەی (پایسکل دز)ی (ڤیتۆریـۆ دیســیکا)م بـۆ بهێنــێ و منیش بیکەم بــە کوردی. ئەگەرچی بێگومان پێشــنیارەکەم پەســەند کرد، بەڵام لە ســەرەتادا لەمانای گەورەیی ئەم پێشــنیارە تێنەگەیشــتم کە خرابووە بەردەم منی شازدە، حەڤدە ساڵ. پاشتریش کاتێ بیرم لێدەکردەوە، ئەوەی بەلامــەوە خۆش بوو تەرجەمەکردنی شــاکارێکی ســینەمای ئیتاليا نەبوو، بەڵکو ئەوە بوو کە ناوی من و ئەو دەچوونە پاڵ یەکترەوە. کاتێ دەقەکەشم تەرجەمە کرد، ئەو پێشەکییەکی ناسکی بۆ نووسی، کە پڕ بوو لە وشــەی جوان و ستایشــکردنی هونەری ســینەما، بە تایبەتــی ڕیالیزمــی ئیتاليا. من ئــەو دەقەم بەدرێژایی ســەفەرێکی سیازدە ساڵان پاراست، ئەگەرچی هەرگیز دەرفەتی بڵاوکردنەوەی بۆ نەهاتە پێش..

ئەو پۆلەی ئەو وانەی تێدا دەگوتەوە، مامۆستای جیاوازی بۆ دەهاتن: هەیانبــوو بە هەڕەشــەی ئەوەی ئەگەر بیســمیلا لەســەر کاغەزی تاقیکردنەوەکان نەنووســین، ســفرمان دەداتێ، دەمکوتی دەکردین. هەیانبــوو بە دروشــمەکانی بەعــس دەیتۆقاندین، تیاشــیاندا بوو ئەوەندە لە خۆی بایی بوو، لاساییکردنەوەی زۆر ئاسان بوو..

مامۆستاکان جۆراوجۆرن، هەیانە بە تووڕەبوون و گرژی، نەزانیی خۆی دەشــارێتەوە. تیایاندایە دیواری ئەوەندە پان و بڵندت لەگەڵدا دروستدەکات، کە وابزانیت وەستای خانەنشینکراوی دیواری چین، یان هەرەمەکانی میسر بووە. بەڵام ئەحمەد ســالار نوقڵێ بوو کە دەتخســتە زارتــەوە، حــەزت نەدەکرد هەرگیز تامەکــەی لە زمانت دەرچێ. لە قسەکردندا هێمن، لە گوێگرتندا قووڵ تەماشای دەکردی و لــە پەرســڤدانەوەدا پەیامبەرانە دەهاتە زمان. ئــەو لە یەک کاتدا کاریگەریی هونەری، ئەخلاقی و سیاسیشــی لەســەر ئێمە دانا بوو،

بەڵام لە سەرووی هەموو ئەوانەشەوە، من شەیدای سنگفراوانیەکەی بووم و ساڵەها لەوەدواش لەسەر زاری فەیلەسووفێکی ئێرانییەوە زانیم، ئەو خەسڵەتەیان پەیوەندیی بە دانایی و بەخشندەییەوە هەیە. دانا ڕاستەقینەکان سوکراتیانە بیر لە ژیان دەکەنەوە: ئەوان دەزانن کە نەزانن، بەڵام لەناو ئەوانەدا دەژین کە نازانن نەزانن. بۆیە مامۆستا سالار زۆر وریایانە و بە ئیحتیاتەوە قسەی دەکرد و کەمتریش بیروڕای ڕاستەقینەی خۆی دەردەبڕی. ئەو هەمیشە وایدەکرد و وایپیشاندەدا کە تەنیا ڕەهەندی هونەریانەی شانۆ بۆ ئەو گرنگیی هەیە و واتدەزانی بە زۆر دەیەوێ سیاسەت و شانۆ لەیەکتر دابڕێ، بەڵام ئەو لەپاڵ ئەم درووشمە گوتارەدا، شانۆی وەک پانتاییەکی هووشیارکردنەوە و بێدارکەرەوە و پەروەردەکار بەکار دەهێنا. سالار بەبێ ئەوەی بیەوێ هونەر بکاتە قوربانیی سیاسەت و دایبەزێنێتە سەر ئاستێکی بازاڕی، بەجۆرێکی دیکە گەمەی سیاسەتی لە شانۆدا پەرەپێدا: ئەو دەیویست دەنگ و لەشی مرۆڤی کورد لەسەر شانۆ، گەورەتر لە قەبارەی خۆی پیشانبدات، تاکو بتوانێ بەرگەی ئەو بچووککردنەوە و پێشێلکارییانە بگرێ کە ڕۆژگارەکە سەپاندبووی. ئەو کاتێ لەسەر شەقامەکان و لەناو شوێنە گشتییەکاندا دەیبینی، گەردنی بەرزی مرۆڤ ناچار بە ملکەچی و سەربەرەژێری دەکرێ، لەسەر شانۆ گەردنی مرۆڤی بەرز و قنج و بڕوابەخۆبوو، پیشاندەدا. ئەو ڕۆژگارە ڕەشانە ڕقیان لە بەرجەستەیی لەش و سنگی دەرپەڕیو دەنگیَ هەڵبڕیو، دەکرد، کەچی ئەو لەسەر شانۆکانی جەستەیەکی قەبە و سنگی پان و پۆڕ و دەنگێکی بەرزتر لە ئاسایی بەکار دەهێنا و چپەچپ و سەر بردنە ژێرسەری یەکتر و لەژێر لێوەوە وریتەکردن، لە نومایشەکانیدا نەبوو، یان زۆر کەمبوو.

ڕۆژگارێکی تر کاتێ بەدەم تەماشاکردنی نومایشە تۆمارکراوەکانیەوە، بیرم لەم ڕەهەندانەی هونەری مامۆستا سالار دەکردەوە، بۆ ئەوە دەچووم ئەم خەسڵەتەی لە کەلتووری یۆنانیی سەردەمی زێڕینی شانۆ و هەروەها سەردەمی ڕێنیسانسەوە وەرگرتبێ. چونکە لە هەردوو ئەو قۆناغەدا، هونەر کار لەسەر بەرجەستەکردنی ئیرادەی مرۆڤ و سەروەریی لە ژیان، لەسەر بنەمای گەورەکردنی قەبارەیەوە دەکات. مرۆڤی یۆنانی سەردەمی پریکلیس شا، مرۆڤێکی بڕوا بە خۆبووی سنگ بەرجەستەی سەر بڵندە، نەک مرۆڤێکی بەزیوی بەسەرخۆدا شکاوە. ئەمەش لە هونەری یۆناندا ڕەنگیداوەتەوە و وەک مرۆڤێکی بڕوابەخۆبووی نەترس بەرجەستە کراوە. لە قۆناغی ڕێنیسانسیشدا، کاتێ ویستیان ویستی خۆیان بۆ ژیان و خۆشەویستیان بۆ بەردەوامبوون پیشانبدەن، هەر گەڕانەوە سەر ستایلی یۆنان و ئەوییان کردە پێشنمونەی خۆیان. لە هونەری ئەحمەد سالاریشدا بەردەوام (گەڕانەوە) هەیە، وەکئەوەی ئەو لە گەڕانەوەیدا بۆ ئەو شتانەی بۆیان دەگەڕێتەوە، سەرمەشقێک ببینێ کە لە ڕۆشنکردنەوەی ڕۆژە تراژیدیاکاندا ببێتە گرێکەرەوە و چارەساز. هەر لەم ڕوانگەیەشەوە پێویستە تەماشای گەڕانەوە بەردەوامەکانی بۆ بابانیەکان و نالی و بەیت و داستان و سرووت و سیمبوولە کوردییەکان و بابەتە فۆلکلۆرییەکان، لە بەرهەمەکانیدا بکەین. هەندێ جار بیر دەکەمەوە، مامۆستا سالار، لە بەشێ لە بەرهەمە هونەرییەکانیدا بە هەمان نیگای ڕێنیسانسیانەوە بۆ یۆنانی کۆن، دەڕوانێتە سەردەمی بابانیەکان و بەرجەستەکردنەوەی کەسایەتی نالی. لە ڕاستیشدا نالی بۆ یەکەمجار پانتاییەکی بۆ پێکەوە ژیانی تراژیدیا و کۆمیدیا، شین و کەرنەڤاڵ لە دنیای ئێمەدا دروستکرد و هەر ئەویش سەرمەشقی سالار بووە لە هێنانی ئەو

پانتایـی پێکەوەژیانە بۆ ناو شـانۆ. لەسەرەتاشـەوە گوتم: سـالار هەمیشە لە ئاستی لوتکەدا قسەی دەکرد، بەڵام پێویستە بشزانین کە ئەو بەزۆری دەچووە ژێر کاریگەریی لوتکەکانیشەوە، هەر بۆیەشە هونەری ئەو، بەردەوام ڕەسەن و نەمر و جوانە.



درەوشانەوەی ناو تاریکەسەلات..

# مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس

ئایا ئەگەر مامۆستای مودەڕیس شیعرەکانی (نالی) و (مەحوی) و (مەولەوی) ڕاڤە نەکردبان و ماناکانی لێک نەدابانەوە، ئێستا من چ مرۆڤێکی دەستەپاچە و نەزان و نامۆ دەبووم بەرامبەر بە بوونی خۆم و دەوروبەر و یەزدان؟
ئەمە ئەو پرسیارە بوو کە زۆرجار لە کاتی خوێندنەوەی شیعرەکانی (نالی) و (مەحوی)دا، بەتایبەتی لەو سیازدە ساڵەی هەندەران، کاتێ لەدوای سەفەر بەناو هەزاربەهەزاری بەیتە شیعرێکدا، بەدەستی خاڵی دەگەڕامەوە و ئەمجا پەنام دەبردە بەر لێکدانەوەکانی مامۆستا و بۆ تێگەیشتن لە شیعرەکان، لەوێوە ڕووناکاییم وەردەگرت، ئەوپرسیارەی سەرەوە بە خەیاڵمدا هاتووە. ئەو پرسیارە دەشێت پرسیاری نەوەیەکیش بێت لەو نوسەرانەی کە سەرەتای یەکەمین ئەزموونەکانی نوسین و بیرکردنەوەیان لەپاش بڵاوبوونەوەی ئەو کارانەی مامۆستا و کوڕەکانیەوە دەستیان پێکردووە و بەم پێیەش

بەشـێکی زۆری ئەو نەوەیە ئەگەر کەمێ لە دەستەپاچەیی و نەزانی و نامۆبـوون ڕزگاریان بووبێت، ستاییشـەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مامۆسـتا گەورە شیعرناسـەی کورد. لێرەشەوە دەکرێ بگوترێ: لە گیرفانی پاڵتۆکەی ئەو مرۆڤەوە نەوەیەک شـاعیر و نووسـەر هاتنە دەرەوە، کـە ئەگەر دیوانی (نالی) و (مەحوی)یـان بە لێکدانەوەکانی ئەو شیعرناسـە نەخوێندباوە، هەرگیز نە ئەو شیعرانەیان دەنووسی و نـە ئەو دیدەشـیان بۆ شـیعر و شوناسـی شـیعری دەبـوو، کە بەهۆیەوە خۆیان ناساند و گەلێ مرواری جوانیشیان لە زمانی ئێمەدا دۆزییەوە.

لەڕاسـتیدا هەروەکـو چۆن سـەرهەڵدانی شـاعیرانی وەکـو (نالی) و مەحـوی) و (مەولـەوی) و هاوڕێکانیـان لەناو مێژووی شـیعر و ئەدەبی ئێمەدا (ڕووداوێکی ئەدەبی)ی گرنگ بوو، ئاواش لێکدانەوەی شیعری ئەم شاعیرانە لەلایەن مامۆستای مودەڕیسەوە (ڕووداوێکی ڕەخنەیـی و ڕاڤەکاریانە)ی گرنگە. سـەرهەڵدانی ئەو شـاعیرانە بۆ مێژووی ئەوسـای ئێمە و هاوسەردەمەکانیان چەندە بایەخدار بووە، لێکدانەوەکانی مامۆسـتای مودەڕیسـیش بۆ شـیعری ئەو شاعیرانە لـە مێژووی هاوچەرخماندا بۆ هاوسـەردەمەکانی خۆی، ئەوەندە بە نرخ بوو. مودەڕیس بەوکارەی نەک هەر پردێکی ڕۆحی و مەعنەوی و جوانیناسـیی پتەوی لە ڕابردووی مێژوویی ئێمەوە بۆ ئێسـتامان ڕایـەڵ کرد، بەڵکو لەڕێگەی پرۆسـەیەکی شـیکاریانەی وردەوە بۆ (مانا)ی وشـەکان و بەیتە شـیعرییەکان، زمانێکی (هاوبەش)یشی لە نێوان (ئێمە) و (ئەوان)دا دروستکرد. لەڕاستیدا ئەو هەر تەنیا شیعری ئەو شـاعیرانەی بە ئێمە نەناساند، بەڵکو لە ڕێگەی لێکدانەوەی ورد و ئاماژەکـردن بۆ سـەرچاوەکانی مانای شـیعری ئەوان، ئێمەشـی بـردەوە ناو قوڵایی ئـەو دەریایەی کە دەکرێ پێـی بڵێن: جیهانبینی

شــیعریی شاعیرانی کلاســیکی کورد. بەخوێندنەوەی ڕڤەکردنەکانی مامۆســتا، بۆمان دەردەکەوێ کە (مانا) لە شیعری کلاسیکیی ئێمەدا، ئەگەرچی لەناو کەش و ئەتمۆسفێرێکی ئایینی داخراو و ڕەهاگەریی میتافیزیکییــەوە زمانــی دەپژێ، بەڵام گوتارێکی شــیعری فرە مەودا دەهێنێتە ئاراوە کە خۆی نادات بەدەست تاکڕەهەندی و ڕەهاییگەریی ئایینــی و ئایدۆلۆژییەوە. مودەڕیس بە پشتبەســتنی بە زیاد لە چەند دەستنووســێک و بــە شــیکردنەوەی (فرەڕەهەندانــە)ی مانای هەر تاکە وشــەیەک و بەیتەشــیعرێک و بە لێکدانەوەی مانای (تایبەت) و مانای (گشــتی) کۆی وشە و بەیتەکان، هیچی نەکردووە جگە لەوەی ویســتویەتی پێمان بڵێت: مانا لە شیعری ئەو شاعیرانەدا هەمەڕەنگە و گوتاری شــیعری کلاســیکی کورد گوتارێکی بە ڕێژە کراوەیە، کە تیایدا شــاعیرانمان هەوڵیانداوە لــە بابەتگەلێکی گەردوونی و مرۆیی و سرووشــتی تێبگەن، کە بەهیچ شــێوەیەک خۆیان نادەن بەدەست تاکڕەهەندی مانا و ڕەهاییگەری دەربڕینی ستانداردی زمانییەوە.

ئەگەر تەماشــای پەراوێزبەندی هــەردوو دیوانی (نالی) و (مەحوی) بکەیــن، دەبینین کە مودەڕیس لە لێکدانەوەیدا بۆ شــیعرەکانی (نالی) و (مەحوی) لە (تکاکار)ێک و (ناوبژیوان)ێک دەچێ کە نەیەوێت هیچ بەدحاڵیبوون و بەهەڵە لێکدی تێگەیشتنێک لە نێوان (ئێمە) و (ئەوان) دا ڕوو بــدات، کە ئیدی مەودایەکی زەمەنی و ڕۆحی و جوانیناســی کەوتۆتــە نێوانمانــەوە. دەتوانیــن مەجازیانــە بڵێیــن: مودەڕیــس لە لێکدانــەوەی ئەو شــیعرانەدا لە فەیلەســووفێکی ئارام و لەســەرخۆ، لــە ئەڤیندار و حەکیمێکی عــەوداڵ دەچێ بەدوای زانیندا. شــێواز و هەدادانی ئەو نزیکە لە شــێواز و سەبری ئەو بودایيەی کە ساڵەهای ســاڵ بەدیار چلێ گیاوە تێدەفکرێ تا دواجــار بڵێت: ئەمە تەجەللای بوونــی یەزدانە! ئارامیی لە کۆی لێکدانەوەکانی مودەڕیســدا تاڤگەی

بەستووە، وەکئەوەی نەیەوێ بەهیچ شێوەیەک چنین و فەزای قەسیدەکان بشێوێنێ. ئەو لە کەسێ دەچێ کە بیەوێ پارچەیەکی چنراو بەدەستی وەستایەکی شارەزا هەڵبوەشێنێتەوە، بەڵام نەک لە پێناوی (هەڵوەشاندنەوەیدا)، بەڵکو بۆ ئەوەی (فێر) ببێت چۆن ئەو پارچەیە چنراوە. ئەمەش وایکردووە ساتەوەختی ڕاڤەکردنەکانی، بکاتە ساتەوەختێکی ڕەخنەیی و هزریی زۆر گرنگ، کە ئەگەر دەروونی بیرکەرەوە و ڕاڤەکار ئارام و هێمن و پاکژ نەبێت، هزریش ناتوانێ ئەوەندە وردەکارانە لە ناو زماندا و بە زمان بیر بکاتەوە. ئەم (حەکیمە) لە لێکدانەوەی مانای ئەو شیعرانەدا، بەر لەهەر شتێ لەو تکاکارە دەچێ کە لەنێوان (ڕووالەتگەرایی) سەردەمی خۆی و (قووڵایی) سەردەمی ئەو شاعیرانەماندا، لە هاتووچۆدایە. لەلایەکەوە هەموو توانا هەنووکەییەکانی ئەوسای زمانی کوردی لەسەردەمە ڕواڵەتگەراکەی خۆیەوە بەرەوپیری شیعری (نالی) و (مەحوی) دەبات و لەلایەکی دیکەیشەوە، زۆرترین مانای شیعری ئەو بلیمەتانە دەکاتە ماڵ بەسەر زمانێکەوە، کە ئیدی مەودایەکی زۆری هەیە لەگەڵ ئەو زمانەی (نالی) و (مەحوی) و (مەولەوی) بیریان پێدەکردەوە و پێیان دەنووسی. وەک ئەوەی مودەڕیس ویستبێتی بەر لە کارەساتێک بگرێ کە لە ئەنجامی دابڕبوونی یەکجارەکی (ڕووکەش) و (قووڵایی) و (ڕواڵەت) و (حەقیقەت)وە، دێتە ئاراوە. بەڵام ئەو بەهۆی ئەو پردەی ڕایەڵیکرد، سەلماندی کە هەرکامێ لە جەمسەرەکانی (ڕواڵەت) و (حەقیقەت) و (ڕووکەش) و (قووڵایی)، هیچ نین، ئەگەر ڕایەڵێکی پەیوەندی لە نێوانیاندا نەبێت و پێکیانەوە نەبەستێتەوە. بەمجۆرەش مودەڕیس توانی ئەو ڕایەڵە دروستبکات و بەهۆیەوە هەم ئێمە لەو تەنیاییە ڕزگار بکات، کە دەشیا ڕواڵەتگەرایی و خێرایی سەردەمەکەمان بەسەرمانیدا بسەپێنێت و هەم ئەو شاعیرانەشی لە

بیرچوونەوە ڕزگارکرد، کە لە قووڵاییەکانی جیهانبینی شیعریاندا بۆ مانا ڕێژەییەکانی حەقیقەت دەگەڕان.
ئالێرەوە ئەو پرسیارە گرنگیی خۆی هەیە کە پێشتر خستمە ڕوو: ئەگەر مامۆستای مودەڕیس شیعرەکانی (نالی) و (مەحوی) ڕاڤە نەکردبان و ماناکانی لێک نەدابانەوە، من ئێستا چ مرۆڤێکی دەستەپاچە و نەزان و نامۆ دەبووم بەرامبەر بە بوونی خۆم؟ بەمانایەکی دیکە ئەگەر ئێمەی کورد بەهۆی لێکدانەوەکانی ئەم مرۆڤەوە دەروازەیەکی فراوانمان لەسەر جیهانبینی ئەو شاعیرانە بۆ نەکراباوە، ئاخۆ ئێستا چەندە دەستەپاچەتر و نەزانتر و نامۆتر دەبووین بەرامبەر بە قەڵەمڕەوی مرۆڤ و قەڵەمڕەوی سرووشت و قەڵەمڕەوی خودا؟
ئەوکارەی مامۆستای مودەڕیس کردی، هەرتەنیا گواستنەوەی ماناکانی (بەیتی شیعری) نەبوو بۆ ناو (زمانی داڕشتن)، هەر تەنیا وەرگێڕانی ئیقاعێکی قافیەداری شیعریی نەبوو بۆسەر (ئیقاعێکی پەخشانی)، بەڵکو جەوهەری کاری ئەو بریتیبوو لەبەستنەوەی (ئێمە) بە (ئەوان)ەوەو ئامادەکردنەوەی (ڕابردوو) لە (ئێستا)دا. ئەو ویستی ئێمە لە ڕابردووەکان تێبگەین و لەڕێگەی گوێگرتن لەو پرسیار و وەڵامانانەی لەسەر دەمی خۆیاندا کردویانن و بەهۆیانەوە هەوڵیانداوە کێشەکانی خۆیان چارەسەر بکەن، بەشداربن لەوەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی لە ئێستادا ئێمەیان بەخۆیانەوە سەرقاڵکردووە و داوای چارەسەرکردنی کێشە هەنووکەییەکانمان لێدەکەن. بۆیە ئێمە بەخۆمان بزانین یان نەزانین، سوودێکی زۆرمان لەو بەیەک گەیشتنە وەرگرتووە کە مودەڕیس لە نێوان کلاسیکەکان و ئێمەدا ڕەخساندی.
ئەگەر ئەوان نەدەبوون و پڕ نەدەبوون لە پرسیار و گومانی ڕۆحی و مودەڕیس ئەمەی بۆ ڕاڤە نەکردباین، ئێمە زۆر تەنیاتر دەبووین لەوەی کە هەین و ئەگەر لە ڕێگەی ئەو مامۆستا وردبینەشەوە لە

وردەکاریی شـاعیرەکان تێنەگەیشتباین، ئێستا زۆر نەزانتر دەبووین لەو نەزانییەی یەخەی گرتووین. بەمجۆرەش مودەڕیس تا ڕاددەیەکی زۆر ئێمەی لە دەسـتەپاچەیی و تاریکایی سەردەمی نەزانیی خۆمان ڕزگار کرد و لەناو تاریکایی ڕابردووشـەوە باوەشێ ڕووناکایی بۆ هێناین کە دەشێ لە شوێنێکدا پێویستیمان پێی بێت.

مودەڕیس بەهەموو مانایەک لەلێکدانەوەی دیوانی کلاسیکە کوردەکاندا مرۆڤێکی مۆدێرن بوو: ئەو پرسـیارەکانی ئەوانی دەستنیشـانکردن، ڕەگوڕیشـەکانی ناسـی، سـەرچاوەکانی پیشـاندایـن و بۆ هەمیشە ناچاریکردین کە لەهەر سـاتێکی قەیرانـاوی ڕۆحی و مەعنەویماندا، بکەوینـە گفتۆگۆکردن لەگەڵ ڕابـردوو. گفتوگۆکردن و ڕۆچوون بە ڕابردوودا، شـێوازی ئەو بوو بۆ بەرەنگاربوونەوە و (قووڵکردنەوە) ی ئێسـتا. بەبێ کارەکانی ئەو، ئێسـتای ئێمە لەڕووی مەعنەوییەوە لەنـاو ڕواڵەتگەراییدا نغرۆ دەبوو. ئەو توانی لەڕێگەی بەسـتنەوەی بیـر و خەیاڵی شـاعیرانەی (نالـی) و (مەحوی) و گەورەشـاعیرانی دیکە بە ئێمەوە، نەک هەر سـەدەی نۆزدەهەم بە سـەدەی بیستەوە ببەستێ، بەڵکو کارێکی وایشی کرد سەدەی بیستەم بۆ ئێمەی کورد هەر بەتەنیا سـەدەی تێکشـکانە ڕۆحییە بەکۆمەڵییەکان (لە ئەنجامی نسـکۆ و تێکشـکانە سیاسـییەکانەوە) نەبێت، بەڵکو سەدەی ناوبراو بۆ تاکەکەسـی ئێمە سـەدەیەکی شاعیرانەش بێت. ئەوەی مودەڕیس لەسەدەی نۆزدەهەمەوە گواستییەوە بۆ سەدەی بیستەم، کە سەدەیەکی بەتەواوی مانا سیاسـی بوو (سیاسـەت) نەبوو، بەڵکو (شیعر) بوو. لێرەشەوە شیعر وەک ئەڵتەرناتیڤ و جێگرەوەی سیاسەت خرایە ڕوو. ئەگەر سیاسـەت بە دیوێکدا و لە سەدەی بیستەمدا بەردەوام کۆمەڵگای ئێمەی ڕووبەڕووی تێکشـکان و نائومێدی بەکۆمەڵی دەکردەوە و لە ژیان وەڕسـی دەکردین، ئەوە شـیعر لە هەمان سەدەدا و لەکەناری

دەربڕینـــی کۆژانەکاندا، بەبەردەوامی هەوڵیداوە تاکەکەســی ئێمە بە ژیان ئاشـنا بکاتەوە و تیماری برینە شەخسییەکانی ڕۆحمان بکات. مودەڕیس ئەو میراتەی سـەدەی نۆزدەیەمی گواسـتەوە کە جەختی لەسـەر مرۆڤبوونی کورد دەکردەوە، نەک لەسـەر ئەو بنەمایەی کە ئەو مرۆڤە مرۆڤێکی (ئیشکەر) و (شەڕکەر) و (بەرهەمهێن)ـە، بەڵکو وەکئـەوەی مرۆڤێکـی (داهێنەر)، (خەیاڵکـەرەوە) و خاوەن (ڕۆح) و خـاوەن (باتنیەت)ـە، کە تا دەهات ئەم ڕەهەندەی کەسـایەتی کورد لەبەر دەم هێرشـەکانی دوژمن و دواکەوتوویی ناوخۆیی کۆمەڵگای کوردی و ئایدیۆلۆژیا باوەکانی سەردەم و خێرایی گۆڕانکارییەکاندا، نەدەما و ڕووداوەکان لە مرۆڤی ئێمە مرۆیەکی شەڕانی و توندوتیژ و بەرژەوەندپەرسـتیان دروسـتدەکرد، کە هەمـوو ئەمانەش بەرەو دەستەپاچەیی و نەزانی و نامۆبوونیان دەبردین.
مودەڕیـس بەوکارانـەی و لـە پەیوەنـدی بـە ڕۆحـی فەردیانـەی مرۆڤی کـوردەوە، پتر ڕۆڵـی (دەروونشـیکار) و (فەریادڕەس)ێکی بینیـوە تا (ڕاڤەکارێک)، ئەمەش بـەو مانایەی کە ڕاڤەکردنەکانی ئەو هەمیشـە بێلایەنانە نین و لەپشـت هەوڵدانەکانی ئەوەوە بۆ گەیاندن و ڕزگارکردنـی مانـای گوتارەکانی شـیعری کلاسـیکی کوردی لە بەندیخانەی سەردەمەکەی خۆیان، هەوڵدانێکیش هەیە بۆ ڕزگارکردنی سەردەمی ڕاڤەکردن لە بەندیخانەی تێگەیشتنە تاکڕەهەندەکانی خۆی.
ئەمەیـە هۆکاری ئـەوەی کە وادەکات مودەڕیس بۆ هەر وشـەیەک چەندیـن مانـا و بـۆ هەر مانایـەک چەندین ئەگەر و بـۆ هەر بەیتێ مانای تایبەت و گشتی و لەبەردەم هەر قەسیدەیەکیشدا، تەفسیرێکی دوورودرێـژ بخاتـە ڕوو. بـەم پێیـەش (مەعنەویـەت) و ڕەهەندی (ڕۆحیی) ناو قەسـیدەکان لەگەڵ (عەقلانیەت) و ڕەهەندی (زانسـتی) شـێوازی ڕاڤەکردنـەکان بەیەک دەگەن و (ئیجاز) و (ئیسـتیعارە)ی

شـیعری بەناو شـیکردنەوەی دوورودرێژ و ڕووندا، ڕێگای خۆیان بۆ سەردەمی ئێمە دەگرنە بەر. (ڕواڵەت) و (قووڵایی) بەیەکتر دەگەن و ئالەم ڕێگەیەشـەوە ئەوەی (نائاشـکرایە)، ئاشکرا دەبێت و ئەوەی (تەمومژاوییە)، ڕووندەبێتەوە و ئەوەی زۆر تایبەت و (سـۆفیانە) و (عاریفانە) و (ئایینیانەیە) دەبێتە زۆر (مرۆڤانە) و (ئاسایی) و (گشتی) و بۆ هەمووان قابیلی تێگەیشتن.

کاتێ بەناو ڕاڤەکردنەکانی مودەڕیسـدا دەچینە ناو جیهانبینی نالی و مەحوییەوە، تەسـلیمی ئەو جیهانبینیە نابیـن، بەڵکو بەهۆیەوە زیاتر لـە دنیای مرۆڤانەی خۆمان تێدەگەین و پتر بە قووڵایی مرۆڤبوونی خۆمانـدا ڕۆدەچین و لەو ڕۆچوونە قووڵانـە تێدەگەین کە ئەو دوو شاعیرە نەمرە بەهۆیانەوە بوونە ئەو دوو شاعیرەی کە هەتا ئێستاش هەسـت بە پێویسـتی و ئامادەییان بکەین. وەلێ لەبیرمان بێت، زۆر دەگمەنـن ئەو کەسـانەی بەبـێ ڕاڤەکردنەکانـی مودەڕیس دەتوانن ڕایەڵێـک لـە نێوان خۆیـان و ئەو شـاعیرانەدا دروسـتبکەن. ڕەنگە تاکەکەسـێ لەسەدەی بیسـتەمدا توانیبێتی ئەمکارە بکات، (گۆران)ی شـاعیر بووبێت کە دواجار بەهۆی ئەو بلیمەتییە تایبەتیەی خۆیەوە ئاراستەی شیعری کوردیشی گۆڕی..

ئێمـە کاتـێ باسـی کەسـایەتیەکانی سـەدەی بیسـتەممان دەکەین، بەزۆری باسـی کەسـایەتی و ڕابەرە سیاسییەکانمان دەکەین، بەڵام ئێمە لە هەمان سەدەشـدا بووینە خاوەنی چەندین ناوی درەخشـان کە تایبەتمەندی کەلتووری و مەعنەوی خۆیانیان هەیە. ئەگەر بمەوێ ناوی دوو کەس لەوانە بهێنم کە لە بنیاتنانی کەسایەتی مرۆڤی کوردا جێدەسـتیان دیارە، (باڵدار) و (مودەڕیس) لە پێشـەوەی هەمووانن. یەکەمیـان بەهـۆی (ئەلـف و بێ)کەیـەوە، (ئادەم ئاسـا) شـتەکانی بـۆ ناولێنایـن و پێیگوتیـن: منداڵیـی یەکەمیـن نیشـتیمانی مرۆڤە.

دووەمیشیان تێیگەیاندین کە میللەتێک با لەڕووی سیاسی و مێژوویی و مەتەریاڵیشەوە زۆر دەوڵەمەند بێت، بەڵام بەبێ ئاوڕدانەوە لە سەرچاوەی میراتە ڕۆحی و مەعنەوی و باتنیەکانی، ناتوانێت خۆی لە دەستەپاچەیی و نەزانی و نامۆبوون ڕزگار بکات. ئەو دەستەپاچەیی و نەزانی و نامۆبوونەیش کە لە داهاتوودا چاوەڕێمان دەکات، بەتایبەتی بۆ نەوەی نوێ، زۆر زیاترە لەوەی لە ڕابردوودا بەربینی گرتبووین. کەواتە ئێمە لە داهاتوودا پێویستییەکی زۆر زیاترمان بە کارەکانی مودەڕیس دەبێت، لەچاو ئەوەی لەسەردەمی ژیانی خۆیدا هەستمان پێکرد. مەرگی جەستەیی ئەو لەوەدا ئازار بەخشە کە لەگەڵ خۆیدا بەشێ لەو پاکژی و شێوازی مرۆڤبوونەیشی بردەوە، کە ئەو ڕاڤەکارە گەورەیە بەهۆیەوە کوردبوونی خۆی بەرجەستە دەکرد. بۆیە بێڕێزی بەرامبەر بە ئەو لەوەدا نییە کە وەکو کەسایەتییەک لەبیرمان بچێتەوە و فیستیڤاڵی بۆ ڕێک نەخرێ، چونکە لەمجۆرە بێڕێزییەمان زۆر پێکرد، بەتایبەتی لەماوەی ئەو پازدەساڵەی ڕابردوودا زۆر بۆنە و خاڵی وەرچەرخان هەبوون کە دەشیا ئەو مرۆڤە بەشداریی پێکرابا و لەڕووی ڕەمزییەوە بیروڕای وەرگیرابا. ئەوەی مەترسیدارە ئەوەیە لەمەودوا بەڕەسمی و لەئاستێکی فراوانی پەروەردەیی و زانستیدا هیچ نەکرێ بۆ ئەوەی نەوەی نوێی سەدەی بیست و یەکەم، لە گرنگیی کارەکانی ئەم ڕاڤەکارە مەزنە سەبارەت بە ژیانی خۆیان ئاگادار بکرێنەوە. بێگومان ئەرکی هەرە زۆر لەم بوارەدا دەکەوێتە ئەستۆی زانکۆکان و هەردوو وەزارەتی پەروەردە و ڕۆشنبیری. دەشکرێ ئەو هەنگاوە، وەک هەر هەنگاوێکی دیکەی بوێرانە، هەر نەوەی نوێ بۆخۆی بێنێت و لەناو خێرایی و ساردوسڕی و بەرژەوەندگەرایی و ڕواڵەتپەرستی ژیانی خۆیەوە، کاتێ بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی مودەڕیسی مامۆستا بکاتە هاوسەفەری

خۆی و پێکەوە بەناو بەرهەم و بەتایبەتی وردەکاریی شیعری کلاسیکە مەزنەکانی کورددا پیاسەیەک بکات. دڵنیام هەرکەسێ ئەمکارە بکات، تێگەیشتنێکی دی لەسەر خۆی و دەوروبەر و یەزدان بەدەستدەهێنێ. چونکە ڕێنماییەکانی ئەو مرۆڤە شیعرناس و هۆشمەندە، بەڕاستی درەوشانەوەیەکی هەمیشەیین لەناو هەر ژیانێکدا کە تاریکەسەلاتی درۆ، بەرژەوەندپەرستی و خۆپەرستی و وەڕسبوون، هەڕەشەی داپۆشینی لێبکات.

باشە مرۆڤ لە سەردەمێکی زۆر خەستی سیاسیانەی چارەنووس نادیاری وەک ئێستادا، کەمێ لە خەمی ڕۆحی خۆیشیدا بێت. لەبەر هیچ نا، تەنیا لەبەر ئەوەی نەکا تێکشکانێکی سیاسیی دیکە چاوەڕوانیمان بکات! بێگومان لەو کاتەشدا ماڵی شیعر بۆ هەموان کراوەیە!

هەولێر

٢٠٠٥/٩/٨



میراتی لێبووردەیی:

## د. ئەوڕەحمانی قاسملوو

مـن دەمەوێت لـەم دەرفەتەدا کەمێ باسـی دەسـتەواژەیەک بکەم، کە لەلایەکەوە دەروازەیەکی نوێمان لەسـەر هزری سیاسـی کورد لە سـەدەی بیسـتەمدا بۆ دەکاتـەوە و لەلایەکیتریشـەوە، ڕێگامان بۆ خۆشـدەکات بە چاوێکی ئەمڕۆییتر لە کەسـایەتی و فەلسـەفەی سیاسـی کەسـێکی وەک د. قاسـملوو بنۆڕین. ئەو دەستەواژەیەش بریتیە لە میراتی لێبووردەیی لە کایەی سیاسـیدا و پێویسـتیی ئێمە بەم میراتە و ستایشـکردنی ئەو کەسـانەی لەو بوارەدا جێدەستیان دیارە.

لێبووردەیـی وەک پراکتیـک و وەک بنەمـا، نـەک تەنیا بەشـێکە لە کەلتووری دیموکراتیک و دیموکراتیزەکردنی کەسایەتی تاک، بەڵکو یەکێکیشـە لە ئاراستە و بنەما گرنگەکانی سیاسەتی مۆدێرن، کە لە پرۆسەی ئیدارەکردنی ئێستا و بەدەستهێنانی داهاتوودا، پێویستییەکی زۆرمان پێیەتی. ئەمە جگە لەوەی ڕێگایەکی دروسـت و ئەقلانیە بۆ

پەروەردەکردنی کەسایەتی تاک و بەرهەمهێنانی گوتاری سیاسی هاوچەرخ.

بەشێوەیەکی گشتی، کاتێ تەماشای ڕەوتی سیاسەت و شێوەگرتنی حیزبی سیاسی کوردی لە سەدەی بیستەمدا دەکەین، دەبینین کە دروستبوون و پێکهاتەی ئەم ڕەوت و پارتە سیاسیانە لە کۆمەڵگای کوردیدا، وەڵامدانەوەی ئەو گوشار و ستەمکاریە زۆرە بوون کە لەلایەن هێزەکانی ناوچە و حکومەتە شۆڤێنیەکانی دەوروبەرەوە، خراوەتە سەر کۆمەڵگای کوردی. بۆیە سرووشتی گوتار و پێکهاتەی بزووتنەوە سیاسیەکانی ئێمە سرووشتێکی پەرچەکرداریانە بووە.

لە ڕوانگەی دەروونناسیی سیاسییەوە، گوتارێکی سیاسی، یان حیزبێکی سیاسی، کە لە ژێر گوشاری هێزە ستەمکاریەکاندا پەیدا دەبێ، بەپێی ڕادەی ئەو گوشار و زۆرەی دێتە سەری، ڕەفتاری نەرم، یان توندوتیژاوی دەنوێنێ. واتە بۆ تێگەیشتن لەو سایکۆلۆژیا سیاسیەی لە ڕێگەی بزووتنەوە سیاسیەکانەوە بەناو کۆمەڵگادا بڵاو دەبێتەوە، بۆ تێگەیشتن لە جۆرەکانی بەرهەمهێنانی وێنا لەسەر ئەوانیتر، بۆ تێگەیشتن لە چۆنێتی بەرجەستەکردنی دۆست و دوژمن، یار و نەیار، هەروەها بۆ تێگەیشتنی خۆمان لە خۆمان، پێویستە بزانین سەرچاوەی گووشارەکە، چیە و چۆنە و چەندەیە و ئەو میکانیزمانە چۆن دەخولقێنێ، کە گرووپێک، یان نەتەوەیەک و حیزبێک، لە ڕێگەیانەوە بەرگریی لە خۆی دەکات.

لەم ڕوانگەیەوە، بەرز و نزمییەک، یان نەرمی و توندوتیژی، پەلامار و کشانەوە، شەڕی چەکداری و دانوستان و گفتوگۆ، تەنانەت بەستنی هاوپەیمانی لەگەڵ دژدا بۆتە خەسڵەتی بزوتنەوە سیاسیەکانی ئێمە. بە مانایەکی تر، هیچ وەختێ بزووتنەوە سیاسیەکانی ئێمە، نەیانتوانیوە بۆخۆیان ئەو ستراتیژە دابڕێژن کە دەیانەوێ لە ڕێگەیەوە مامەڵە

لەگەڵ دوژمن بکەن، یان ڕووبەڕووی ببنەوە. بەڵکو ئەوە سرووشتی دووژمن و حکومەتەکانی ناوچەبوون، کە جۆری پەرچەکردارەکانی کوردیان لە ئاست خۆیاندا دەستنیشان کردووە و هەڵگرتنی دروشم و گوتاری سیاسیی دەستنیشانکراویان بەسەردا سەپاندوون. بۆ نموونە ترس لەوەی بە جوداخواز لەقەڵەم نەدرێین، خۆمان کردووە بە یەکپارچەخواز و لە جیاتی مافی سەربەخۆیی باسی ئۆتۆنۆمی و لە بری قسەکردن و دروستکردنی ناسنامەی نەتەوایەتی، پەنامان بردووە بۆ ناسنامەی تۆپۆگۆافی و جوگرافیایی.

لە ڕوانگەی بڕواهێنان بە لێبووردەییەوە، ئەم خاڵە بە قازانجی کوردەکان کەوتۆتەوە، چونکە ئیحتیمالی پێکهاتن، دانوستان، مفاوەزات، ڕێککەوتن و بەدەستهێنانی بڕی کەمی مافەکان، هەمیشە ڕێگربوون لەبەردەم بڕیاردانێکی ڕەها بۆ بەردەوامیدان بە نواندنی پەرچەکرداری توندڕەوی و شەڕکردن لە پێناوی شەڕکردن خۆیدا و سووربوونی ڕەها لەسەر مافەکان. بە مانایەکی تر، ئەو سایکۆلۆژیا شەڕانیەی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، لە شوێنەکانی وەک کامبۆدیا، سۆڤیەت، کوبا و لە کۆتایی سەدەی بیستەمیشدا لە شوێنەکانی وەک ڕواندە و سۆمالیا و سێربیا، دروستبوو، بە درێژایی ئەو سەدەیە لەلای کوردەکان دروستنەبوو. ئەگەرچی ئەو گوشارە دڕندەیەی لەلایەن حکومەتەکانی وەک ئێران، تورکیا، سوریا و بەتایبەتیش عێراقەوە، دەکرایە سەریان زۆرجاران چەندین بەرامبەر شەڕانیتر بوو لەوەی لە جێیەکانیتری جیهان دەخرایە سەر گەلان و گرووپە ئەتنیکیەکان.

بەمجۆرەش دەتوانین بەڵگە بۆ ئەوە بهێنینەوە، کە لێبووردەیی و پرانسیپی لێبووردن، ئیحتیات خستن، تێداهێشتنەوە بۆ ڕۆژی خۆی، مانەوە لە بەرەی بەرگریکردندا، خۆپاراستن لە شێوازەکانی

شۆڕشگێڕێتی ئیفراتی، دووربینی و پووشووخواردنەوە، تەحەممولکردن، دانبەخۆداگرتن، لە سیاسەتی ئێمەدا ڕەهەندێکی نەخوێنراوە و نەبینراوی خەباتی ڕزگاریخوازی و مرۆیی کوردەکانە. ئەمە میراتێکە زۆر کەمی لەبارەوە دەزانین، چونکە ڕۆژگارێکی کە تێپەڕمان کردووە، ستایشی توندوتیژی و زەبروزەنگی کردووە، زیاتر لەوەی ستایشی پەروەردەی لێبووردەیی و گوتاری لێبووردەیی لە ناوچەکەدا بکات. پێویستە ئەم میراتە بناسرێ، چوارچێوەیەکەی دەستنیشان بکرێ و خەسڵەتەکانی پێناسە بکرێن، بۆ ئەوەی نەوەکانی داهاتوو، بتوانن تیۆریزەی بکەن و بەهۆیەوە سیمای شێوێنراوی چالاکیی سیاسی کوردەکان، لە جیهانی گلۆباڵدا ڕاستبکەنەوە. ئەمە جگە لەوەی یارمەتیمان دەدات، دوای ساڵانێکی زۆر تێوەگلانمان لە توندوتیژی و زەبروزەنگی بێ ئامانج، لە شەڕە ناوخۆیی و براکوژییە بێماناکان، کە زۆریشیان لەسەر گوتراوە، کەمێ بڕوا بە خۆمان بهێنینەوە و لە ڕێگەی هێنانەوەدەری کەلتووری سیاسی لێبووردەییمان لە گەرووی مێژوو، کەمێ متمانەمان بەخۆمان زیاتر بکەین. ئەمەش دۆخێکی ئاساییە و میللەتانی تریش پێیدا تێپەڕبوون، بۆ نموونە وڵات و گەلی ئەڵمانیا لە پاش تەسلیمبوونێکی درێژخایەن بە نازییەکان و بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە، لە هەوڵی ڕاستکردنەوەی ئەو بەشە لە مێژووەکەیدا بووە، کە بۆی بۆتە میراتێکی ڕەش. ئێمە دەمانەوێ لەم بۆنەیەدا، میراتی سپی ناو مێژووی سیاسیمان بەسەر بکەینەوە.

لەنێو کەسایەتیە کوردەکانی سەدەی بیستەمدا، ناوی چوارکەسایەتی دەهێنم، کە دەکرێ بە گەڕانەوە سەر بەرهەم و گوتە و بە توێژینەوە لە کەسایەتیان، پێکهاتەیەک لەو میراتە بەرهەم بهێنینەوە، کە ناوم ناوە، میراتی لێبووردەیی. لەو چوار کەسایەتیە سیانیان سیاسین و

یەکێکیان نوسەر و بیرمەندە. ئەمانە بە بۆچوونی من، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، لە بیرکردنەوە و چالاکیی و خەباتیاندا، زیاتر لەوانیتر، پرانسیپ و کردەی لێبووردوانەیان لەبەر چاو بووە و کاریان بۆ کردووە.
یەکەمیان ڕابەری شۆڕشی ئاگری داخ، (ئیحسان نووری پاشا)یە، کە تەنانەت ئەو دەمەی سێرە لە سەربازە تورکەکان دەگرێتەوە، ڕەهەندی مرۆییانەی ئەوانی لەبیرە و لە زەیینی خۆیدا ئەوە دەهێنێتەوە پێشچاوی، ئەگەر ئەم سەربازانە ئێستا لەناو ماڵ و منداڵی خۆیاندا بوونایە، نەدەبوونە قوربانی شەڕێک، کە دەبوو دەسەڵاتداری توورک خۆی بیکات، نەک ئەم ڕەشو ڕووتانە بکاتە قوربانی. هەر بۆیەشە ژەنراڵ نووری پاشا، بڕیار دەدات کاتێ سەربازە توورکەکان بە دیل دەگیرێن، دوای بینینیان بەرەڵلای وڵاتی خۆیان بکاتەوە، بەو مەرجەی جارێکی دیکە خزمەت بە مەرامەکانی دەسەڵات لەدژی کوردان نەکەنەوە. ئیحسان نووری پاشا لە خەباتەکەیدا نشوستیی هێنا، بەڵام بڕوای بە پرانسیپی لێبووردەیی لەق نەبوو. ئەو تا دەمی مردن، بە ڕقەوە نەژیا، تەنانەت بۆ یەک ساتەوەخت چەوسانەوەی نەتەوایەتی خۆی تێکەڵ بەو پەیوەندییە نەکرد، کە لەگەڵ خاتوو (یاشار توکتامش جبرانی)ی بە ڕەگەز توورکی هاوسەریدا، هەیبوو.
کەسایەتی دووەم، نووسەرێکی دانسقەیە بەناوی (ڕەشید نەجیب). ڕەشید نەجیب، ڕۆشنگەرێکی سەردەمی خۆیەتی و لە بەشداریکردنیدا بۆ بڵاوکردنەوەی گیانی لێبووردەیی و ستایشکردنی کەسایەتیەکانی وەک (گاندی) درێخی نەکردووە. ڕەشید نەجیب، لە کۆتایی بیستەکانەوە بۆ سەرەتای چلەکانی سەدەی بیستەم، سیمایەکی ڕەخنەگرە، مرۆڤێکی منەوەر و مەدەنی، بیرمەند و نووسەرە، کە

دەیەوێت باشــی و عەدالەت و ناتوندوتیژی لــە کۆمەڵگاکەی خۆیدا دەســتەبەر بـکات. ئەم مرۆڤە مەزنــە، تەنانەت پێشــنیاری ئەوە بۆ گەنجانی وڵات دەکات، کە لە پشــووەکاندا، ســەردانی سرووشــتی نیشــتیمانەکەیان بکــەن، تاکو لە هەرجــۆرە بارگرژییەکی دەروونی بــەدوور بــن. ئەو لــە مەرگــی (گانــدی)دا، دەنووســێ مرۆڤایەتی کەســایەتیەکی گەورەی لەدەستدا و ستاییشــی خەباتی ئەم ڕابەرە مەزنە دەکات. ڕەشید نەجیب، ماوەیەکی زۆر لە بەغدا ژیاوە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە.

کەســایەتی ســێیەم، دیسانەوە کەســایەتییەکی سیاســی وەک مەلا مســتەفای بارزانە. ئەم مرۆڤە، کە ڕۆشنبیرانی ئەمڕۆ لەبەر ئەوەی تۆمەتی ستایشکردنی ئەم مرۆڤەیان بەرنەکەوێ، کەمتر باسی دەکەن، لە گەرمترین ڕووداوە سیاســیەکانی سەدەی بیستەمی کوردستاندا ژیا و خەباتی کرد. زۆرترین هاووڵاتیانی کوردی پەیوەســتکردەوە بــە خەباتەکەیــەوە و هێزێکــی کۆمەڵایەتی و ســەربازیی گەورەی پێکهێنا. بەڵام بۆ یەک ساتەوەخت غرووری هێز، نەیگرت. ئەو لەگەڵ دڕندەترین، توندوتیژترین ڕژێم ڕووبەڕوو بۆوە، زۆرترین گوشارە سیاســی و دیپلۆماتیەکانی خرایەســەر، چەندجارێک بووە ئامانجی تیرۆریســتان، نزیکترین دۆســتەکانی پشــتیان تێکرد و نشوستیان پێهێنــا و ئــاوارە بوو. بەڵام هیچکامێ لەم گوشــارانە لــە ڕەفتار و بیرکردنەوەدا ئەویان لە ڕاســتەڕێی خەباتێک لانــەدا، کە تەنیا بایی ئەوەندە توندوتیژ بێت، کە پرانســیپی بەرگــری لە خۆکردن ڕێگەی پێدەدات. ئەگەرچی لە باوەڕی ئایینزایی بۆماوەیی ئەودا، لێبووردەیی بەرامبەر بە سرووشــت نەرێتێکــی پیرۆز بووە، بەڵام ئەو دەرکێکی لۆکاڵیانەی تایبەتیشی لەسەر پێکەوەژیان و تەبایی لە نێوان گەلان و نەتەوەکاندا هەبوو. مەلا مســتەفاش وەک ئیحسان نووری و ڕەشید

نەجیب لە ئاوارەیی و بە نەخۆشی سەری نایەوە.
دکتۆر عەبدولڕەحمانی قاسملوو، کەسایەتی سیاسی ناودار یەکێکی تـرە لە میراتسـاز و بەرهەمهێنەرانی میراتی لێبووردەیی سیاسـی کوردستان. بگرە لەوەش زیاتر، یەکێکە لەو کەسانەی پەی بەم میراتە بردووە و بۆخۆیشی زیادەی خستۆتە سەر و لە گرنگیی سیاسیانەی مافی جیاوازی و پرانسـیپی لێبووردەیی تێگەیشتووە. ئەم مرۆڤەش ئەگەرچـی ماوەیەکی بـاش ڕابەرایەتی حیزبێکی سیاسـی چەکدار و بزوتنەوەیەکـی سیاسـیی دیموکراتخوازانەی کـردووە، بەڵام لە پێکهاتەی ڕۆشنبیریی سیاسی و پراکتیکی خەباتکارانەیدا، بڕوابوون بە لێبووردەیی یەکێکە لە بنەما هەرە سەرەکیەکانی بیرکردنەوەی.
بەشـێوەیەکی گشـتی چەنـد سـەرچاوەیەکمان لەبەردەسـتان کە بەهۆیانـەوە دەتوانیـن بەڵگەی ئـەوە بهێنینەوە بۆ بەشـداریکردنی د. قاسـملوو لـە بەرهەمهێنانی کەلتوور و میراتـی لێبووردەیی، کە بـە خێرایی ئاماژەیان پێدەدەم تا کەسـانیتر توێژینەوەیان لەبارەوە بکەن.
سەرچاوەی یەکەم بریتیە لە وتار و ئاخاوتنە سیاسی و حیزبیەکانی بۆ خەڵک و پێشمەرگە. ئەو لەو وتار و ئاخاوتنانەیدا، بەبێ ئەوەی بە شێوەیەکی تیۆری باسی جیاوازی و لێبووردەیی و پێکەوە هەڵکردن بـکات، لـە میانەی هاندانی خەڵـک و پەروەردەکردنی پێشـمەرگەدا باسی گرنگیی قەبووڵکردنی ئەوانیتری کردووە. باسی ئاشتیخوازی و ڕێزگرتنـی لە بنەماکانی دیموکراسـیەت کـردووە، کە دابینکەری ڕێـز و لەبەرچاوگرتنی مافی ژیانی ئەوانیتریشـە. د. قاسـملوو، بە وریاییەکی ئایندەبینانەوە قسـە لەسەر جۆری دووژمن و نەیارەکان و دۆسـتە کاتی و سـتراتیژییەکانی گەلی کورد دەکات و لە گرنگیی بزووتنەوەی دیپلۆماسیەت و دۆزینەوەی دۆستەکانی نەتەوەی کورد،

دەدوێ. هەروەها لە چەندین شـوێن، داوەت لە خەڵکی کوردسـتان دەکات، کـە خەباتـی ئاشـتیخوازی لەسـەر بنەمـای قەبووڵکردنی جیاوازییەوە، سـەرکەوتن بەدەسـت دەهێنێـت و گرنگترین بەڵگەی ئەوەیـە کـە تەنیا ئەوانـەی بیروڕایان لە بیـروڕای خۆمان دەچێت، دۆستمان نین، بەڵکو ئەوانەش مافی بیروڕای خۆیان هەیە کە هەمان بیروڕاکانی ئێمە و ئامانجە نەتەوەییەکانی کوردیان نیە. سنووری د. قاسملوو، سەبارەت بە لێبووردەیی سیاسی بریتە لە زەبرو زەنگ و توندوتیژی. ئەو بە ئاشـکرا دەڵێ: هەتا ئەو کاتەی کەسـێک لە دژی میللەتەکەمان دەسـتی بۆ چەک و زەبرو زەنگی سیاسی نەبردووە، ئێمە تەحەممولی دەکەین.

سەرچاوەی دووەم: بریتیە لەو پێشەکییەی بۆ تاریک و ڕوونی هێمنی موکریانی نووسـیوە. لە خوێندنەوەیەکی سـەرپێیانەدا، وا دەزانرێ نووسـینی ئەم پێشـەکیە بریتەیە لە مەسـەلەیەکی ئایدیۆلۆژی، کە ڕابەری حیزب دەیەوێ شـاعیرێک بۆ گەل دەستنیشان بکات. بەڵام لە وردبوونەوەیەکی هێمنانـەدا، بۆمان دەردەکەوێ ئەو بنەمایانەی د. قاسملوو سەبارەت بە شیعر و ئەدەبی هێمنی موکریانی، قسەیان لێـوە دەکات، جۆرێکـی دیکـەی هەمان ئـەو بنەما و پرانسـیپانەن کـە لە سیاسـەت و حیزبایەتیدا بڕوای پێیان هەبووە. د. قاسـملوو، ڕۆشـنبیریی لێبووردەخوازانـەی خۆی ناچەپێنـێ، ئەگەرچی کاتی نووسینی ئەو پێشەکیە، سەردەمێکی جیاوازتر و ڕووبەڕووبوونەوەی توندوتیژانەتـرە لەگـەڵ خەباتی گەلی کورد. وەلێ د. قاسـملوو لەو کاتەشـدا ئەو پرانسیپانە لە شیعری هێمندا دەدۆزێتەوە، کە بۆخۆی بڕوای پێیانە و هیمن ستاییش دەکات، کە توانیویەتی لەناو مێژوویەکی دڕندەدا، کە توندوتیژی و سـتەمکاری بەسەر کوردەکاندا دەبارێنێ، باسـی پێکەوەژیانی کـورد و ئازەربایجانی و گیانـی برایەتی بکات

و خەباتی گەلانیتری ئێران لە دژی ستەمکاری و چەوساندنەوەی نەتەوایەتی بنرخێنێ. ئەو هێمن بە شاعیرێکی مرۆڤویست ناو دەبات، چونکە بۆخۆشی سەر بە هەمان نەریت بوو لە سیاسەتدا.
سەرچاوەی سێیەم ڕەهەندی ئەکادیمیانەی نووسینەکانی دەگرێتەوە، بەتایبەتیش کتێبی (کوردستان و کورد)ەکەی. د. قاسملوو لەم بەرهەمەیدا، کە بە زمانی بێگانە نووسیویەتی، ئەگەرچی لایەنگیریی خۆی بۆ کوردەکان ناشارێتەوە، بەڵام ئەم لایەنگیرییەی نە لەسەر حسابی ناشیرینکردنی وێنەی گەلانیتری ناوچەکەیە و نە لەسەر حسابی لادانە لە پرنسیپەکانی نووسینی زانستی بە شێوەیەکی ئۆبجەکتیڤ و بابەتیانە.
لەمەش زیاتر، د. قاسملوو بۆ دیتنەوەی سەرچاوەی زانیاری و کەرەستەی بڕواپێکراو لەسەر ئەو بابەتانەی لە کتێبەکەیدا باسیان دەکات، جگە لەوەی گەلێک سەرچاوەی بەکارهێناوە کە تیایاندا وێنەی کوردەکان وێنەیەکی شیاو نیە و بگرە شێوێنراویشە. یاخود نووسەرەکانیان نیەتپاک نین و بگرە لە ژێر فەرمانی ئایدۆلۆجیای خەڵکانیتریشدا لەسەر کوردیان نووسیوە و واقیعی دیموگرافی و سیاسی و مێژووییان شێواندووە، ئاواش د. قاسملوو زۆرجار پەنای بۆ ئەو سەرچاوەو ئامار و سەرژمێریانەش بردووە، کە دەوڵەتانی ناوچە لەو وڵاتانەی کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە، بۆ شێواندنی جوگرافیا، مێژوو و ژمارەی کوردەکان و سەرچاوەکانی سامانی نەتەوایەتی کوردستان بڵاویان کردوونەتەوە.
بەمجۆرەش د. قاسملوو، بۆ ئەوەی وێنایەکی کوردیانە پێشکەش بە خوێنەرە بیانیەکانی بکات، نەهاتووە بیروڕاو بۆچوونی دوژمن و نەیارەکانی نەتەوەی کورد سانسۆر بکات. هەر بۆیەشە لەو کتێبەیدا چەندە مافی بەخۆی داوە وەکو کوردێک لەسەر کوردستان

و کـوردەکان بـدوێ، ئەوەنـدەش مافـی ئـەوەی بە نەیـار و بگرە دوژمنەکانی کوردیش داوە کە بیروڕایان لەوێدا ئامادەیی هەبێت.
هەموو ئەمە سـەرچاوەکەی لە بڕوابوون بە بنەمای لێبووردەییەوە هاتـووە، تەنانـەت لێبووردەیی تا ئەو شـوێنەی کـە دوژمن بتوانێ خۆی لە وێنەی فریشتەی ئاشتیدا پیشانی د. قاسملوو بدات و کۆتایی بـە ژیانی بهێنێ. هەر بۆیەشـە دەتوانین د. قاسـملوو بە شـەهیدی لێبووردەی ناوبەرین. بڕوابوون بە پرانسیپەکانی لێبووردەیی ئەویان کـردە قوربانی و کۆتاییان بە ژیانی هێنا، بەڵام ئەمە بە مانای ئەوە نیە، کە ئەو پرانسـیپانەی ئەو بڕوای پێیان هەبوو لە کایەی سیاسی و ژیانی نەتەوەییماندا کارایان نەماوە. مەترسـی لەوەدایە ئەوانەی لەناو ئەم کایەیەدا کار دەکەن نە ئاگایان لەم میراتە بێت و نە بڕوایان پێی هەبێت. چونکە ئەمەیان بە مانای مەرگی هەمیشەیی د. قاسملوو و کۆتایهاتنیەتی بە بیروڕاکانی. هیوادارم هەمیشە کەسانێکی دڵسۆز لەنەوەی ئێسـتا و داهاتوو، هەبن، کە بگەڕێنەوە سەر ئەم میراتە بە نرخە.

٢٠٠٩/٧/٤

هەولێر، پیرزین



# مێژوو: لە یەکپارچەخوازییەوە بۆ خاڵی هاوبەش

## پرۆفیسۆر د. موحسین محەمەد حسین

ساڵی دوو هەزار، کاتێ چوارمانگ بوو بەتەواوی گەڕابوومەوە کوردستان، بۆ یەکەمجار لە باخچەکانی کۆلێژی ئاداب سەرنجی ڕاکێشام. مرۆڤێک لە عەتر و خاوێنی و گەنجایەتی، پڕ لە وزە و هێمنی، بەڵام هەر زوو زانیم ئەگەر قوتابی خۆی بوبێت و سڵاوی لێبکەیت، وەڵامەکەی کەمێ باوکانە بوو: «چۆنی بابی من؟» و ئەم وەڵامەی بۆ هەردوو ڕەگەز بەکار دەهێنا، خۆ ئەگەر سەرەتای ناسین، یان هەر نەتناسیبایە وەڵامەکە بە زمانێکی خۆمانەتر بوو: «چۆنی کاکی من!». من یەکەمجار بۆخۆم ڕامگرت و خۆمم پێناساند، کەچی وەڵامەکەی بۆ منیش پاش کەمێ ڕامان ئەوەی یەکەمیان بوو: «چۆنی بابی من؟» و یەکسەریش فەرمووی «دەتناسم، لە ڕێگەی نوسینەکانتەوە».

من ئەو دەم لە ناو و پێگە و پسپۆڕیی هەموو کەسم دەپرسی. لە وڵاتێکی بە کەلتوور تەقلیدیدا، ناو و پێگەی کەسێک زۆر شتت لەسەر

کەسایەتیەکەی پیدەڵێن. هەندێ جار بۆت دەردەکەوێ کە کەسێک لە پشت ناوەکەیەوە خۆی شاردۆتەوە و ناوەکەی پەردەیەکە بۆ شاردنەوەی کەسەکە، بەڵام لە خۆیدا ئەوە نیە کە دەیەوێ هەبێت. پێگە و دەسەڵاتیش زۆرجار پەیوەندییان بە لێهاتوویی کەسایەتی مرۆڤەکەوە نیە، هێندەی ئەوەی پەیوەندییان بەو هەلومەرجانەوە هەیە کە مرۆڤێک لە «پڕێک دەکەنە کوڕێک». ئەمە دەربڕینێکی زۆر کوردیانەیە، کە هەم تەعبیر لە کاریگەریی ڕێکەوت (صدفە) دەکات لە مێژووی ژیانی کەسێک و نەتەوە و گرووپێکدا و هەم تەعبیریش لەو پەیوەندییە دەکات کە لەم جۆرە کۆمەڵگا تەقلیدیانەدا، لە نێوان نێرایەتی (ژکوریە) و مێژوودا هەیە: ڕێکەوتەکانی ناو مێژوو، هەل و فرسەت دەدەنە نێرینە تاکو ببێتە کوڕێک، یان هەل دەدەنە کوڕەکان تا ببنە پیاو. بەمجۆرەش، کۆمەڵگای تەقلیدی مێژووی کوڕەکانی خۆی بۆ گرنگترە تاکو لە پڕێک ببنە کوڕێک. نەک کچێک، یان مرۆڤێک، یان هاووڵاتیەک و هتد. چاوەڕوانیی ئێمەی کورد لە مێژوو، چ وەک گێڕانەوە و چ وەک بەرهەمهێنان، چ بە مانای گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، چ بە مانای دروستکردنی داهاتوو، چاوەڕوانییەکی نێرانەیە. ئەو ئەگەرچی کوڕی ناو ئەم مێژووەیە، بەڵام هەرگیز لە «پڕێک نەبۆتە کوڕێک». کوڕبوون بۆ ئەو، نە تاجێک بووە بیکاتە سەری و نە جێبەجێکردنی ئەرکێک لە ئاستی کۆمەڵگای تەقلیدیدا تا بچێتە ڕیزی کوڕانی مێژووەوە. ئەو لە دەروازەیەکی ترەوە، دەچێتە ناو مێژووەوە، خۆی مێژووی خۆی دروستدەکات..

پێیان گوتم: دکتۆر موحسین محەمەد هیچ پێگەیەکی ئیداریی نیە و بۆ هیچ پێگەیەکیش هەوڵ نادات، بەڵام پسپۆڕییەکەی مێژووە بە پلەی پرۆفیسۆر. پاشانیش کە لەگەڵیدا کەوتمە گفتوگۆوە، زوو تێگەیشتم کە پڕە لە سنگفراوانی و ئاوەدانی. جوانترین شت لەو

پیاوەدا بەدیم کرد توانای ئەوە بۆ فراوانکردنی بازنەی زانینەکانی خۆی، بۆ جێهێشتنی کایەی پسپۆڕی و گەڕان بەدوای مەعریفەدا. لەم ڕوانگەیەوە بوو کە نوسیم: ئەو مرۆڤێکە پڕە لە گەنجایەتی و لە وزە. بە پێچەوانەی زۆرینەی ئەوانەی پلە و بڕوانامە و پسپۆڕییەک بەدەست دەهێنن و ئیتر ماڵئاوایی لە زانست و گەڕانی مەعریفی دەکەن و بگرە لەگەڵ زانست دەکەونە جەنگەوە، ئەم پیاوە نە هێشتی پسپۆڕییەکەی نابینای بکات، نە ڕێگەی دا بڕوانامەکەی بۆی ببێتە قەبری مەرگ، نە زانستەکەشی کردە دەروازەیەک بۆ شەڕکردن و لووتبەرزی لەئاست جیهانی دەوروبەریدا. ئەو، زانست و ژیانی ئاشتکردەوە و بازنەی پسپۆڕییەکەی بەرین کرد و بەجۆرێ کاری لە مەعریفەی مێژوودا کرد، کە مرۆڤ وا بزانێ جۆگەلەیەک لە قوتابخانەی (ئانالأ)ی فەرەنسی گەیشتۆتە کوردستان.

لە کتێبی (هەولێر لە سەردەمی ئەتابەگیەکان)دا، کە ماستەرنامەکەیەتی، گەڕانەوەی بەردەوامی بۆ چین و توێژەکان، بەسەرکردنەوەی بیروڕایان و جۆرەکانی سزا و پاداشت و هەروەها بەسەرکردنەوەی گرووپە کۆمەڵایەتیەکان، لە دەسەڵاتدار و کەمدەسەڵاتیانەوە بگرە، تا زۆرینە و کەمینە و ڕیزپەڕیان، بەڵگەی ئەم قسەیەن. لە کتێبەکەیدا لەسەر سوپای سەلاحەدینی ئەیوبی، کە نامەی دکتۆراکەیەتی، بە ئێستاتیکای ڕۆماننووسێکی پشوودرێژەوە، لە تەکنیکی گێڕانەوەی مێژوویی، فیلمێکی سینەمایی بەرهەم دەهێنێ و نزیکترین پەیوەندییەکانی نێوان گرتەی سینەمایی و تۆماری مێژوو دەدۆزێتەوە. هەموو ئەمەش لە بۆتەی ڕستەی پوخت و مانادار و بەدوور لە چاوبەستی ئایدیۆلۆژیانە. من کاتێ ئەو کتێبەم دەخوێندەوە و دەگەیشتمە سەر وەسفی شمشێر و قەڵغان و چەک و تفاقی سوپای سەلاحەدین، دیمەنێک لە جەنگی

ڕووبەڕووم دەهاتەوە پێشچاو کە سوپایەک لە پیاوانی بڕواداری دەکردە قوربانی. ئەمە ئەو جۆرە جەنگانەبوون کە شەڕکردن هەرچەندە لە دوورەوە، لە دوو پنتی دەسەلاتەوە، لە کەنیسە یان مزگەوتەوە بڕیاری لەسەر دەدرا، بەلام لە مەیدانی شەڕدا تاکە مرۆیەکانی دەستەویەخەی یەکتر دەکردەوە. دانسقەیی ئەمجۆرە شەڕانە لە بەشداریی تاکەکەسیانەی شەڕکەردا بوو لە گۆڕەپانی جەنگدا. شەڕێکی ئۆرگینالیانە، شەڕێک کە بە زۆرترین ماوە کەمترین قوربانی دەخواست و دەکرێ بڵێین بەو هۆیەوە کە تەکنەلۆژیایەکی سەرەتایی تیادا بەکار دەهات، شەڕێکی «مرۆییانەتر» بوو لەو شەڕانەی لە دنیای مۆدێرندا، لەدوورەوە کۆنترۆڵ دەکرێن و لە ئان و ساتدا هەزاران قوربانی لە مرۆڤ و گیانەوەرانیتر دەکەنە سووتەمەنی و جیهانێک لە وێرانی بەجێدەهێلن.

هەلبژاردنی مێژوونووسەکەمان، بۆ بابەتی تێز و نووسراوەکانی، لە ئۆریگینالیەت و دانسقەیی کەسایەتی خۆیەوە سەرچاوەیان گرتووە و پەیوەندییەکی پتەویشی هەیە بەو پرانسیپە هیومانیستانەوە کە لە بیروڕاکانی و فەلسەفەی ژیانیدا ئامادەییان هەیە. ئەم، بە پێچەوانەی ئەو مێژوونووسانەوەیە، کە جگە لە ستایلی گێڕانەوەی سادە، جگە لە دووبارەکردنەوەی ساردوسڕی ئەوەی لە سەرچاوە و کەشکۆلەکاندا هاتووە، هیچیتر ناخەنە سەر مێژوو. بەپێی ئەم ڕەوتە باوەی نوسینەوەی مێژوو، لەدواجاردا، مێژوو وەکئەوەی لە پانتایی زۆرینەی زانکۆکانی کوردستان و عێراقیشدا دەخوێندرێ، هێندەی حەکایەتێکی لێدەمێنێتەوە، کە هەر دایکێک بۆ خەولیخستنی منداڵەکەی پێویستە بیزانێت. ئەم تێگەیشتنە لە ئەرکی مێژوو و لە ستایلی نووسینەوەی مێژوو، لەلای پسپۆڕەکەمان، نەک هەر ڕەتدەکرێتەوە، بەلکو شوێنی خۆی بە تەواوی چۆڵدەکات بۆ

ئەرکێکــی تری مێژوو کە بریتیە لە بێدارکردنەوە و دروســتکردنی ناسنامە بەهۆی گێڕانەوە مێژووییەکانەوە.
لێرەشــەوە، مێـژوو لەلای ئــەم مرۆڤە هەر تەنیا بڕێکــی کاتیانە و زنجیرەیــەک ڕووداو نیە، کە لە ڕابــردوودا ڕوویانداوە تا بمانەوێ بە نووســینەوەیان چەندایەتی زانیاریەکانمان لەسەر زەمەنێک زیاد بکەین، کە ئیتر زۆر لێی دوورکەوتوینەتەوە. بەڵکو مێژوو چالاکییەکی مرۆییە کە دەبێت بەهۆی دووبارە بەرهەمهێنانەوەیانەوە، چۆنایەتی مەعریفەمــان لەســەر ڕابــردوو و لەبــارەی ئێستاشــەوە بگۆڕین.
لێرەشــەوە، لــە کارەکانی دکتۆر موحســیندا، چەنــدە گێڕەرەوە بۆ شــتێک لە ڕابردوودا دەگەڕێت، ئەوەنــدەش بەهۆی گەڕانەوەیەکی ســەردیانەوە بۆ ئــەو ڕابــردووە، دەیەوێ گفتوگۆ لەگەڵ ئێســتادا بــکات، یان دەرگای لە خۆ تێگەیشــتنی ئێســتامان زیاتر بەســەردا بکاتەوە. ئەم دیدە بۆ مێژوو، بەتایبەتی لەو کتێبەیدا بەرجەستە بوە، کە تیایدا هەردوو چەمکی «لۆمەکردنی سەلاحەدین و لێپێچینەوە لە خۆمان» دەکاتە سەنتەری قسەکانی. ئێستا و ڕابردوو ڕووبەڕووی یەکتر دەکاتەوە، بەبێ ئەوەی بیەوێ بەناوی حەقیەقەتی ڕابردووەوە بدوێ، یان بەتەنیا حوکم بەسەر ئێستادا بدات.
دکتــۆر موحســین مرۆڤێکی بێ کینەیە، ئەمەش ســیفەتێکی باشــە بۆ پســپۆڕێکی مێژوو لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاســتدا کە پڕە لە کینەی بەرهەمهێنــراو، لە وێناکردنی هەڵەی میللەتان بۆ یەکتر. ئەو کوڕی ناوچەیەکە، مێژووەکەی پڕە لە ناعەدالەتی و غەدر، پڕە لە شێواندنی مێــژووی میللەتــان لــە پێناوی جوانپیشــاندانی مێژووی پادشــا و دەســەڵاتداراندا. پڕە لە غەدری نەتەوە سەردەســتەکان لە ئاســت نەتەوە ســتەملێکراوەکان. ژیاری ئەم ناوچەیە ئەگەرچی وەک ژیار و شارســتانیەتێکی هاوبەش دەســتیپێکردووە و هەر لەبەرئەوەش

بە دایکی شارستانیەتەکان ناوی ڕۆیشتووە، کەچی زۆر کەمن ئەو مێژوونووسانەی ناوچەکە، لە باسکردنی مێژووی گەلان و گرووپە مرۆییەکاندا، خاڵە هاوبەشەکانمان بیر بخەنەوە. مێژوونووسە ئەوروپاییەکانیش کاتێ باسی ئەم ناوچەیە دەکەن، لە سایەی نەبوونی زانیاریی ورد و لێکۆڵینەوەی مەیدانی و دووریيان لە خەڵکی ناوچەکەوە، ئەوەندە جیاوازیی شارستانیەتەکان و دەستە مرۆییەکانی ئەم ناوچەیە وەک یەک و هاوشێوە پیشاندەدەن، کە وا بزانرێ هیچ جیاوازییەک لە ئارادا نیە. بەمجۆرەش ئێمە بوینەتە قوربانیی دوو ڕەوتی مێژوونووسیی لە بارەی ناوچەکەوە: ڕەوتێکیان جیاکەرەوەیە (separator)و وێنەی ناوچەکە بەجۆرێ پیشاندەدات کە وا بزانرێ ئیرادەی جوداخوازی و لێکدابڕان ژیانی گەلانی ناوچەکە بە ڕێوە دەبات. ڕەوتێکیشیان ئەوەندە توێنەرەوەیە (assimilator)، کە وابزانرێ لە نێوان گەلان و کەلتووری ناوچەکەدا هیچ جیاوازییەک نیە و هەموویان هەمان شتن. هەردوو ئەم ڕەوتە لە ژێر کاریگەریی دوو ئایدیۆلۆژیای سیاسیدا دروستبوون. یەکێکیان دەرهاویشتەی قۆناغی کۆلۆنیالیزم و سەفەری گەڕیدە و هاوپەیمانە لۆکاڵیەکانیانە لەم ناوچەیەدا، کە پاشان بوونە دەوڵەتی ستەمکار و یەکپارچەخواز. یەکپارچەخوازی جۆرێکە لە سیاسەتی ستەمکاریانە کە هەر جۆرە جیاوازییەک بە دژی خۆی لێکدەداتەوە. ئەمە سرووشتی ڕژێمی پاشایەتی ئێرانی پەهلەوی و بەعسی سوونەی عێراق بوو. ئەمەش سرووشتی توندڕەوە ئیسلامیستەکان و ڕەگەزپەرستە مۆدێرنەکانی عێراقی دوای بەعسە. لە هەردوو ئەم ڕەوتەدا جێگەی جیاوازی و هەمەڕەنگی نابێتەوە. ئیرادەی تواندنەوە و ئیرادەی جیاکردنەوە، هەردووکیان یەک سەرچاوەی ئایدیۆلۆژیان هەیە: یەکپارچەخوازی و فەندەمەنتالیزم.

یەکپارچەخوازی سیمایەکی سەرەکی و بنەڕەتی ئەو جۆرە مێژوونووسیەشە کە لەم ناوچەیەدا پەیڕەو دەکرێت. لە عێراقی بەعسدا، هەڵبژاردەی سوونەمەزهەبی بەعسیی دەسەڵاتدار، مێژوویان بە جۆرێ دەنووسییەوە، وەکئەوەی بۆخۆیان میراتگری مێژووی کورد و ئاشووری و بابلی و کلدانی، مێژووی مسوڵمان، مەسیحی، کاکەیی و یەزیدیەکان بن. ئەوان کوردەکانی وان و بەدلیس و دیاربەکریشیان وەک تیرەیەکی عەشایەری عەرەب تەماشا دەکرد. لە ئەبوو یەقزانەوە تا سەدام حسێن، ڕەوتێکی مێژوونووسیی بە عەرەبکردنی کوردەکان ئامادەیە، کە خۆ ڕزگارکردن لێی کارێکی ئاسان نیە. سیاسەتی یەکپارچەخوازی بەعسییەکان زۆرینەی زانستەکانی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، بەڵام باجی گەورە بەر بواری مێژوو کەوت و زۆرینەی مێژوونووسەکانیشی قووتدا. ئەمڕۆ بەرهەمی ئەوانە کەس نایخوێنێتەوە، مەگەر بۆ زیادکردنی لیستی ڕیسواییەکانی بەعس نەبێت. بە بڕوای من، وێڕای هەر ڕەخنەیەک لە سیاسەتەکانی پاش بەعس، هێشتا کەسیان وەک بەعسیەکان خۆیان ڕیسوا نەکردووە. هەرکامیشیان بیەوێت ئەزموونی بەعس دووبارە بکاتەوە، لەوان خراپتری بەسەر دێت. لە ناو بەعسدایە، کە مێژوونووسیی ئەم ناوچەیە بۆخۆی وەک کایەیەکی گومان لێکراو دەناسێنێ و بایی ئەوەش لە زانست دوور دەکەوێتەوە و متمانەی خۆی دەدۆڕێنێ.

با ڕستەکەی پێشووترم لەبارەی پرۆفیسۆر موحسینەوە دووبارە بکەمەوە: ئەم مێژوونووسە مرۆڤێکی بێ کینەیە. هەبوونی ئەو مێژوونووسانەی بەبێ کینە مامەڵە لەگەڵ کات و ڕابردوودا دەکەن، گەرانتێکە بۆ بڕواهێنانمان بە حەقیقەتی مێژوویی و بەوەی کە مێژوو دەتوانێت لە ڕاستەقینەی ڕووداوەکان نزیکمان بخاتەوە بۆ

ئەوەی حوکمی هەڵەیان لەبارەوە نەدەین. بوونی مێژوونووسانێک، لەناوچەیەکـی گـرژی وەک وڵاتی ئێمەدا، کە لە نێوان دیسـپلین و ویژدانـی مێژووییدا بەدوای تەئویلی ڕاسـتیدا دەگەڕێن، نیشـانەی تەسـلیم نەبوونی مێژوونووسـە بە دەسـەڵات و بەڵگەیەکی پتەوە بـۆ متمانەمان بە گوتاری مێژوویـی. هەرچەندە ژمارەی ئەمجۆرە مێژوونووسـانەش زیاتر بێت، ئەوەندەش زیاتر نەتەوەکان دەتوانن دۆسـتانە و لێبووردووانە پێکەوە بژیـن و بە هاوکاریکردنی یەکتر و پشـتگیریی یەکتـر، کینـە و حوکمـی هەڵـە لەبـارەی یەکترەوە توڕهەڵدەن.

لە بواری مێژوونووسـیدا وشەی بێگوناهی هەمان مانای نیە کە لە فیلمی هیندیدا هەیەتـی. بێگوناهی لە فیلمی هیندیدا پەیوەندیی هەیە بەو قەدەرەوە کە برایەک و برایەک لە یەکتر دەکات. پاشان لە میانەی تێپەڕینـی کات و ڕووداوەکاندا، ئەودەمەی بۆ یەکتر دەگەڕێن و لە ڕێکەوتێکـی مێژوویـدا بوونەتە دووژمنی یەکتر، یـان کەوتوونەتە دووبـەرەی دوژمـن بـە یەکترەوە. مێژوونووسـەکان کەسـانێکی بێگوناە نین لە دەسـتبردنیان بۆ نوسـینەوەی ڕووداوەکان. ئەوان لـە ڕوانگەیەکی تایبەت و بەپێی چاوەڕوانیەکی تایبەت لە مێژوو و بەپێی تێگەیشـتنێکی تایبەتیش لە کات، ئەو شتە دەکەنە مێژوو، کە لەبەرژەوەندیی خۆیاندایە و ئەوان بە مێژووی دەزانن و دەیانەوێ ئێمـە وەک ڕاسـتەقینەی مێژوویی متمانـەی پێبکەین. بەمجۆرەش، مێژوو لە کاتی نووسـینەوەیدا دروسـتدەکرێ و بەرهەم دەهێنرێ. بزوتنەوەی شێخ مەحمودی حەفید لە ڕوانگەی جوتیارێکی هاوکاتی شـێخەوە، بەجۆرێکە و لە ڕوانگەی لایەنگرانیەوە مێژوویەکی هەیە و لە بەڵگەنامەکانی حکومەتی بەریتانیادا بەشـێوەیەکی ترە. ئەوەی مێژوونـووس وەک مێـژوو لەسـەر ئـەو قۆناغە دەینووسـێتەوە،

هەڵبژاردنێک و بەرهەمهێنانەوەیەکی تایبەت بەخۆیەتی.
ئەحمەد خواجە، لە یاداشتەکانیدا ئەو بەشە لە ڕووداوەکانی ئەو قۆناغە هەڵدەبژێرێ کە بەلای خۆیەوە تەعبیرن لە مێژوویبوونیان. محەمەد ڕەسووڵ هاوار و دکتۆر کەمال مەزهەر، خوێندنەوەی خۆیان لەسەر بنەمای تێگەیشتن و بەپێی چاوەڕوانیتر لە مێژوو، دادەڕێژن و وەک مێژووی هەمان کەسایەتی و هەمان قۆناغ، بەرجەستەی دەکەن. ساڵی ٢٠٠٣، کاتێ بەڕێگاوەبووم بۆ زانکۆی سلێمانی، لەسەر ڕێگای خەلەکان، پیاوێکی زۆر بەتەمەن دەستی لێڕاگرتم و گوتی تاکو تاسلوجەم دەبەی؟ منیش بەڕێزەوە دەرگاکەم بۆ کردەوە و هەر زوو وەک کۆنە مەیتەرەوانی شێخ مەحموودی حەفید، خۆی پێناساندم. ئەم پیاوە، زۆر قسەی پێبوو، زۆر ڕۆژگاری دیتبوو، لە نزیکیشەوە شێخ مەحمودی دەناسی. ئایا بە چ پێوەرێک قسەکانی ئەو بەشێک نین لە مێژوو؟ ئەگەر بەشێکن لە مێژوو، بۆچی لە مێژووە ڕەسمییەکاندا نایانخوێنینەوە؟ لەبەر ئەوەی مێژوونووسەکان دواجار مێژوو لە ڕوانگەی تایبەتی خۆیانەوە بەرهەم دەهێننەوە و دەینووسنەوە و دروستیدەکەن. وەکو چۆن ئەم پیاوەش مێژووی سەردەمی شێخ مەحموودی حەفیدی لە ڕوانگەی خۆیەوە و بەپێی ئەزموونی خۆی و بە پێی تێگەیشتنێکی تایبەت لە ڕووداوەکان، دەگێڕایەوە. لەبەر ئەوە چەمکی بێبەری بوون، یان بێگوناهی مێژوونووس شتێک نیە بتوانین بەڵگەی ئەقڵانی بۆ بهێنینەوە. مێژوونووس ناتوانێ سنووری هەستەوەری خۆی، ڕوانگەی خۆی، ئینتیمای خۆی و زمانی نەتەوەیی خۆی ڕەتبکات. ئەو لە چوارچێوەی ئەو سنوورانەدا گوتاری خۆی بەرهەم دەهێنێ بەو نیازەی وەک حەقیقەتی مێژوویی لێی وەربگیرێ. کەمن ئەو مێژوونووسانەی ڕیسکی ئەوە دەکەن و بیر لە شکاندن و

فراوانکردنی ئەو سنوورانە دەکەنەوە کە تیایدا بەندن. هەر بۆیەشە مێژوونووسەکان بە زۆری بیر لە نووسینەوەی ئەو بەشە لە مێژوو دەکەنەوە کە پەیوەندیی بە کەلتوور و نەتەوەی خۆیانەوە هەیە. ئێمە مێژووی ئەویتر بە دەگمەن دەنووسینەوە، ئەویترناسی لە بواری مێژوودا بۆ ئێمە نەبۆتە ئیشکالیەت و وەک دەستکەوتێک تەماشای ناکەین. مێژووی عەرەب و ئیسلام، مێژووی توورکەکان و فارسەکان، مێژووی ئێمە و ئەرمەنەکان، ئێمە و جولەکە، ئێمە و هۆستاکان (کە بەپێچەوانەی حەزی خۆیانەوە، پێیان دەڵێین: قەرەج، یان دۆم)، لە هەژارترین کایەکانی توێژینەوەی بەشەکانی مێژوون لە زانکۆکانی ئێمەدا. ئێمە نەمانتوانیوە ئەوانیتر لەناو زمانی نەتەوەیی خۆمان و لە چوارچێوەی هەستەوەری و ئەقڵانیەتی تایبەتی خۆماندا بخوێنینەوە. غیابی ئەوانیتر لە ناو گوتاری مێژوونووسیی ئێمەدا، تێگەیشتنی ئێمەی لە خۆمان و لە ئەوانیتریش هەژار کردووە. پێویستە کۆی باسەکانی کتێبی (سوپای سەلاحەدین)ـەکەی پرۆفیسۆر موحسین لەم ڕوانگەیەوە بخوێنینەوە. ئەو دەیەوێت بەشێ لە ئێمە لەناو زمانی ئەویتردا بەرجەستە بکاتەوە. ئەو لەناو زمانی ئەویتردا بۆ خۆی دەگەڕێت، بەڵام بەسەر شتی هاوبەشدا دەکەوێت. شتە هاوبەشەکان خاڵی بە هێزی نێوان ئێمە و ئەوانیترن. تەنیا لە عەودالبوونماندا بەدوای خاڵە هاوبەشەکانماندا، دەتوانین لەگەڵ ئەویتر بچینە ناوەندی گفتوگۆوە و خۆمان لە هەردوو ڕەوتە فەندەمەنتالیستیەکەی نووسینەوەی مێژوو ڕزگار بکەین. داهاتووی مێژوو وەک زانستێک و شارستانیەتەکان وەک بەرهەمی چالاکی و زەحمەتی تێکۆشانەکانی مرۆڤ، لە دیتنەوەی یەکتردایە لە ڕوانگەی هاوبەشییەوە، نەک لە ڕوانگەی یەکپارچەخوازییەوە. دکتۆر موحسین، لە ڕوانگەی داهاتووەوە مێژوو دەنووسێتەوە،

ئـــەو ڕۆحێکی بێدارکەرەوەیە نەک تەنیا بەرامبەر بەوەی ڕابردووە، بەڵکو لە ئاست ئەوەشدا کە چاوەڕێمان دەکات.

٢٠٠٩/٦/٢٤

کوردستان، پیرزین



# کاتێ حەقیەقت دەبێتە ڕاز
## (ڕازی تەنیایی)

**ئەحمەد هەردی**

کاتێ بۆ یەکەمجار بینیم قاتێکی ڕەش و کراسێکی سپی لەبەراو ڕیشێکی تازە تاشراو، بە جووتێ چاویلکەی گەورەوە کە تازە دیاربوو خاوێن کرابوونەوە. لە دەرگاکەدا چاوەڕێی دەکردم و بزەیەکی لەسەر لێوان و من دەستیم ماچکرد و هەرگیز لەو دەستماچکردنەی پەشیمان نەبوومەوە و ئەویش میهرەبانانە فەرمووی کردم بۆ ژوورەوە، بەناو دالانێکی بەرتەسکدا لە پێشمەوە ڕۆیشت و عەترێکی بۆنخۆشی لەدوای خۆیەوە بەجێدەهێشت و من لە جوانی سەردەستەی کراسەکەی ورد دەبوومەوە، کە لەژێر قۆڵی چاکەتەکەیەوە سپی سپی دیار بوو. پیاوێکی خنجیلە، ورد و پاک وخاوێن و پەپوولەیی، لەسەر خۆ و میهرەبان، دەتگوت دەیەوێ بۆ هەمیشە لە گۆشەگیریدا بژی تاکو خۆی لە پیسیی سەردەمەکەی بپارێزێ..

ئەوە یەکەمین دیداری من بوو لەگەڵ پیاوێکدا کە ساڵەها لەوەپێش

هەوڵیدا بوو شیعری نایاب بە زمانێ بنووسێ کە تا ئەوکاتە خۆی نەدابوو بەدەست شاعیرانەوە، تا بەوێنەی هەردی شیعری پێبنووسن. لەگەڵ هەردیدا شیعرێ لەناو زمانی ئێمەدا لەداییکدەبێ، کە دووبارە بوونەوەی لەسەر دەستی شاعیرانی دیکە مەحاڵ و لەگەڵ کۆچی هەردیدا، مرۆڤێک جێماندەهێڵێ کە بێنمونە بوو.
دوو تایبەتمەندیی لە هەردیدا هەیە کە یەکێکیان پەیوەستە بە شیعرەوە و ئەویدیکەشیان پەیوەستە بە خودی خۆیەوە وەک کەسایەتییەک. تایبەتمەندیی یەکەمیان ئەوەیە کە هەردی تا ئەوکاتە شیعری نووسی کە ویستی بنووسێ و ئیتر دەستیهەڵگرت. ئەو دەیتوانی پتر بنووسێ، ئەو بەردەوام وەک شاعیرێکی هەستەوەر بیریدەکردەوە، ئەو شاعیرانە بیرەوەرییەکانی خۆی دەگێڕانەوە، بەڵام ئەو بڕیاریدابوو چیدی شیعر نەنووسێ. ئەم بڕیارە چەندە پەیوەندیی هەبوو بە سیاسەتەوە کە هەردی بردبووە ناو هەزاربەهەزارەکانی خۆیەوە و چەندەش پەیوەندیی هەبوو بەو سنوورانەوە کە هۆشمەندیی ڕەخنەگرانەی ئەو سەبارەت بە سنعەتی شاعیرانە و سەلیقەی شیعریی لەبەردەمیدا قووتیاندەکردنەوە و ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی کە ئەو سڵبکاتەوە لە شیعر نووسین، ئەوەندەش زیاتر پەیوەندیی هەبوو بە ڕێزگرتنی هەردییەوە لە زمانی کوردی. هەردی قەتاوقەت نەیویست لە شیعر، (موڵکایەتی تایبەت) دروستبکات و بەهۆی ئەو چەپکە شیعرەی پێشتر نووسیبوونی و لە میانەی ساڵەکانیشدا چەند دانەیەکیتری بۆ زیادکردن و ئەوانی پێشووی تەواوکردن و بۆ ئەو ناوبانگێکی زۆریان بەدەستهێنابوو، نەیدەویست ببێتە ملۆزمێکی دیکەی ناو بواری شیعری بە کوردی نووسراو. ئەو هەرگیز بەوجۆرە بیری لە زمانی کوردی نەکردەوە کە زمانێکە دەتوانێ بەئارەزووی خۆی

مەسرەفی بکات و لاپەڕەکانی پێپڕکاتەوە، زمانی کوردی بۆ هەردی زمانێکی هاوبەش بوو، کە ئەو نەیدەویست بەشدارییەکی ناشایستە بکات لە مەسرەفکردنی ئەو زمانەدا. لەڕاستیدا بێدەنگیی هەردی لەو ڕێزە زۆرەیەوە هاتبوو کە ئەو هەیبوو لە ئاست زمانی کوردەکاندا، زمانێ کە هەردی دەیزانی دوا سەنگەری ئەوانە بۆ ئەوەی بوونی خۆیانی لەسەرەوە بسەلمێنن. شت نەبوو پەیوەندیی بە مرۆڤ و بە کوردەکانەوە هەبێت و ئەو نەیخوێنێتەوە، سەرەتا کاتێ دەمبینی لەکاتی خوێندنەوەی کتێب و گۆڤار و هەفتەنامە و تەنانەت بڵاوکراوە و بەیاننامەکانیشدا، لەزۆر شوێندا خەت بەژێر نووسینەکاندا دەهێنێ، لە نهێنی ئەو کارەی تێنەدەگیشتم، بەتایبەتی کاتێ لە دوای ئەو بە دزییەوە چاوێکم بەسەردا دەخشاندن و دەمویست بزانم ئایا ئەو خەتبەژێرداهێنانە پەیوەندیی هەیە بە ناوەڕۆکەکەیانەوە، یان شتێکیترەوە؟ ماوەیەکی زۆری ویست تاکو تێبگەم هەردی لە سەنگەرێکدا شەڕ لەگەڵ مەسرەفکەرانی زماندا دەکات، چونکە ئەو بڕوای وابوو میللەتێ لە ناوەوەی خۆیەوە دانەڕزێ، هیچ دووژمن و پیلانێک پێی ناوێرن و یەکەمین داڕزانیش لە زمانەوە دەستپێدەکات. هەردی کاتێ قسەی لەسەر ناحەزانی کورد دەکرد، هەرگیز قسەی ناشایستەی لە دەم نەدەهاتنە دەرەوە، بەڵام پێیوابوو کە ئەوان زیرەکانە خەریکی شێواندن و لەبیربردنەوەی زمانەکەمانن. هەردی لە هەموو شتێکدا زۆر گوێی نەدابایە، لە مەسەلەی زماندا هەڵەی بەسەردا تێنەدەپەڕی و هەرگیز ڕێگەی بەخۆی نەدەدا زمان مەسرەف بکات، ئەگەر نەتوانێ داهێنانی پێبکات، هەردی لە زماندا پێرفێکشیۆنیست بوو. زمان لەلای ئەو هەرگیز زمانی تاکەکەسی نەبوو، بەڵکو زمانی هاوبەشی نەتەوەیەک بوو، کە ئامادە نەبوو بەشداربێت لە بێحوورمەتی پێکردنیدا. لە ئاست ئەم هەڵوێستەی

هەردیدا، کە لەبنەمادا بەرگریکردنی ئەو بوو لە شوناسی نەتەوەیی، پێویستە بە خۆماندا بچینەوە..
تایبەتمەندیی دووەمی هەردی پەیوەندیی بە کەسایەتیی ئەوەوە هەیە. کەسایەتی ئەو لەناو کارەسات و ڕووداوی گەورەدا، لەنێوان دوورخستنەوەکان و ئاوەرەییەکان و زیندان و خۆشاردن و ڕاکەڕاکدا، فۆرمی خۆی وەرگرتبوو. هەردی خەڵکی ناسیبوو، زەمەنەکەی ناسیبوو، ناحەزانیشی باش دەناسین. ئەو دەیزانی هەمیشە پلانێک لە ئارادایە، کەسانێک هەن سڵ لە خیانەتکردن ناکەنەوە و دووژمنانێکیش کە دەیانەوێ لە خشتەمان بەرن و ئەزموونگەلێکیش لە پشت سەرمانەوە کە بەهیچ شێوەیەک سوودمان لێوەرنەگرتوون و لێیانەوە فێر نەبووین. هەردی میللەتی خۆی خۆشدەویست، بەڵام هەمیشە ڕازیی نەبوو: ئەو شتانەی پەیوەندییان بەم گەلەوە هەبوو و هەردیان دەگریاند زۆرتر بوون لەو شتانەی هەردییان دەهێنایە پێکەنین. ئەو بەراووردکارانە لە مێژووی دەڕوانی و هەمیشە میللەتی خۆی بەراوورد دەکرد بە میللەتانی دیکە و لەچاو زۆریی قوورباانییەکانی خۆمان و کەمیی دەستکەوتەکاندا، پەژارە دایدەگرت. ئەو پێیوابوو پیلانێکی مێژوویی هەیە بۆ لەناوبردنی میللەتی کورد و غەفڵەتێکی گەورەی سیاسیە کوردەکانیشی لەئاست ئەو پیلانەدا هەستپێدەکرد. من نازانم هەردی ئەو بیروڕایانەی خۆی نووسین، یان نا، بەڵام هەموو ئەمانە وایان لە هەردی کردبوو، تا قسەیەک بدرکێنێ، چەندینجار بیری لێبکاتەوە، تا هەنگاوێ بنێ، چەندینجار هەڵوێستە بکات و تاکو بڕیارێک بدات، چەندینجار گومانکارانە بەخۆیدا بچێتەوە. ئەو نەیدەویست تەسلیم بە زەمەن ببێ و لەکەدار ببێ و کارێ بکات و شتێ بڵێ و بنووسێ کە خزمەت بە پلانی دووژمن و ناحەزان بکات و بەزەرەری کورد

تــەواو ببێ. ئەو دەیوســت هەمیشــە وەک ســپێتی قــۆڵ و یەخەی کراســەکەی بێگەرد بێت، خودایە چەندە ئەو هەردییە پەپوولە بوو! دەبێ چەندە پەپوولەیەک بەهێز بێ تا بەرگەی ئەو هەموو ڕەشەبای ســەردەمە بگرێ، کە هەردی لە سەفەری تەمەنەکەیدا سنگی خۆی وەبەر نابوو؟؟ خودایە قەدری هەموو ئەو پەپوولانەی بە عەشــقی مۆمەوە خۆیان سووتاند لەلایەک و نازی ئەم پەپوولەیەی ئێمە کە بە عەشقی مرۆڤەوە لەلایەکی تر، کە دڵنیام لەهەر شوێنێکدا داینێی، بــە قسەخۆش و گێڕانەوەی بەســەرهات و جاروباریــش ئاوازی گەرووە ناســکەکەی و بزەکەی ســەر لێوی، ئاوەدانترو ڕووناکتری دەکاتەوە..

هەردی لە ڕۆحدا شــەماڵێ بوو، ڕوویکردبا هەرشوێنێ بۆنی هاتن و بۆ هەرکوێ ڕۆیشتبا عەبیری ماڵئاوایی جێدەهێشت. ئەو هەمیشە شــوێنی دیار بوو، جێدەســتی و شــتەکانی: قەڵەمێ، عەینەکەکەی، دەفتــەری ســەرنجەکانی و ئــەو کتێــب و گۆڤــار و ڕۆژنامانــەی دەیخوێندنەوە، لەوێدا بوون. بچووکترین نامەی پێگەیشتبا پشتگوێی نەدەخست و درەنگ یان زوو وەڵامی دەدایەوە. ئەخلاقێکی ئەوەندە بەرزی هەبوو هەرگیز بە خراپە باســی کەســی نەدەکرد، ڕقی لەو کەســانە هەڵنەگرتبوو کە بۆ بەرژەوەندیی خۆیان خراپەیان لەگەڵ کردبوو و هەردی باجەکەی بە ژیانی خۆی دابوو. ئەو لەم دواییەدا شــتەکان و دیمەنەکانــی درەنــگ بیــر دەکەوتنەوە، بــەڵام لەدوای بیرکەوتنەوەیــان ئەوەندە بە ئەمانەت و وردییەوە وەســفیدەکردن، وەکئــەوەی بیەوێ هیــچ بوارێ بــۆ بەهەڵە لێکحاڵیبــوون نەمێنێ. توانای کەســەکانی بەکــەم نەدەگرت و ڕێزی لــە هەوڵدانیان دەنا، بەڵام پێیدەچوو تاکو ئیعتیرافیان پێبکات. بە هەوڵەکانی نەوەی نوێ هەندێ جار خۆشــحاڵ و هەندێ جاریکەش نائومێد، بەڵام هەرگیز

پشتی لەو نەوەیە نەکرد کە ئەو تا گەڕانەوەشی بۆ کوردستان هەر لە ڕێگای نامە و هەواڵ و ڕۆژنامەکانەوە پەیگیریی چالاکییەکانیان بوو. شیعری گەنجترین شاعیرەکان و بەرهەمی هزری و وتارەکانیانی دەخوێندنەوە، ستایشی دەکردن و جاری وایش هەبوو لە ئاست وتار و نووسینێکدا هەڵوەستەی دەکرد و دەیپرسی: ئەمە کێیە؟ دەبوو تێگەیشتبای کە بەدڵی نییە و خەمی دەخوارد.

هەردی وەک هەموو ئەوانەی نەوەی خۆی، هۆگرێکی بەردەوامی ڕادیۆ بوو. ڕادیۆ ئەو میدیایە بوو کە چ لە خێرایی و چ لە گوتنی ڕاستیی هەواڵەکاندا لەگەڵ دنیای نەوەی هەردیدا دەگونجا. ئەوان نەوەیەک بوون بەهەموو شێوەیەک سانسۆر کرابوون و ڕادیۆ ئەو میدیایە بوو کە زۆر جار لەسەر کورد حەقیقەتە سانسۆرکراوەکانی بڵاو دەکردنەوە، بەتایبەتی ڕادوێی لەندەنی عەرەبی و زۆرجاریش کە لە خوێندنەوەی هەواڵەکان دەبۆوە و گۆرانییەکی عەبدولوەهاب، یان عەبدولحەلیمی دەخستە سەر، هەردی لێدەگەڕا گۆرانییەکە تەواو بێ و لەو نێوانەشدا هەڵدەستا حەپەکانی دەخوارد و پەمپی هەناسەکەی هەڵدەمژی. لەو هاتووچوونەشدا بۆی هەبوو بە دوو پەنجە چەناگەت بگرێ و لێت بپرسێ، ئێ کاکەگیان چۆنیت؟ یاخود دەستت بگرێ و نووسراوێکت بداتە دەست و داوات لێبکات بیخوێنیتەوە و ڕای خۆتی پێبڵێت! هەردی بەخۆیی و ڕادیۆ و سەرقاڵییەکانییەوە، کاتێ بە دوای شتێکدا دەگەڕا، ئاوەدانییەک بوو، جموجووڵێک بوو، بوونەوەرێک بوو دەستی لە ژیان نەدەبۆوە، بەیادی ئەو دیمەنانەوە، ئێستاش دەنگی کاتژمێرەکەی بیگبن لە گوێمدا دەزرنگێتەوە..

هەردی ساتەوەختی تایبەت بەخۆی هەبوون، کە تیایدا تێفکرین و خەیاڵکردنەوە لە شتێک، لە کەسێ یان ڕووداوێک چەندین کاتژمێر

ئەویان مات دەکرد. کاتێ ماتبوونی هەردیم دێتەوە پێشچاو، کاتێ لەودیو شووشەی چاویلکەکەیەوە، فرمێسکەکانی دەبینمەوە کە ئیتر لەبەر شەوقی پەنجەرەکەدا بریسکەیان دەهات، ترسێکی سەیر دامدەگرێ لەوەی کە چیدی ئەم نەتەوەیە مرۆڤێکی دیکەی ئەوەندە ڕاستگۆ و هەستیار بەخۆیەوە نەبینێتەوە. ماتبوونەکانی هەردی لە لێخووردبوونەوەی یەزدانێ دەچوون کە نەیدەزانی بەدەست زەمەنی دڕندە و مەخلووقە شەڕانییەکانەوە چی بکات..
بەبڕوای من، میراتی هەردی هەر تەنیا لە بواری شیعری و ڕەخنەکاریی شیعر و بەرهەمی دیکەی نووسراویدا نییە، ئەو نموونەی مرۆڤێکمان دەخاتە بەردەست کە لە میانەی ژیانی خۆیدا عیززەتی نەفس و دانبەخۆداگرتن و ئەخلاقی وەفادارانەی لەسەروو هەموو شتێکەوە دانابوو. ئەو هەرگیز نەبۆخۆی و نە بۆ نەوەکانی نەیدەویست سوود لە ناوبانگەکەی وەربگیرێ و بەکار بهێنرێ بۆ بەرژەوەندیی تایبەت. نەیدەویست هیچ کەسێ سێبەری بەسەردا بکات و نەیشیدەویست دەستی یارمەتیدان بەڕووی هیچکەسێکەوە بنێ. ئەو شەماڵێ بوو تا نەهاتبا هەستت بە بوونی نەدەکرد، تا دڵی خۆی بۆ نەکردبایەتەوە، نەتدەزانی ژیان چ ئەزموونگەلێکی لە هەگبەی تەمەنی کورتی مرۆڤدا شاردۆتەوە. من بەهەردیدا زانیم، گەورەیی مرۆڤ لە ناخیدایە، نەک لە ناوبانگ و قەبارە و ڕەنگیدا. ئاخر ئەو دەنکە زەنگیانەیە بوو فێری کردم لە هەموو سەردەمێکدا ڕاستی هەیە، بەڵام لە هەموو سەردەمێکدا حەقیقەت ناگوترێ و ڕێ بە دەربڕینی نادرێ. هەمیشە لە هەردیدا نەگوتراوێک هەبوو، نەگوتراوێک خۆی نەدەدا بەدەست دەربڕینەوە، بۆیە هەمیشە حەقیقەت دەبووە ڕاز، (ڕازیی تەنیایی)!
هەتا مرۆڤ بمێنێ ئەو ڕازە و ئەو حەقیقەتە دەمێنێ، بۆیە

ماڵئاواییکردن لە ڕۆحێ کە هەڵگری ڕاز و حەقیەقەت بوو، هیچ مانایەکی نییە. کاکە هەردی شاعیر و باوک، هیوادارم لەم سەفەرەدا خودا حەقی هەموو ئەو ناخۆشیانەت بۆ بکاتەوە، کە زەمەنی کوردایەتی تۆی لێ بێبەشکردن. بڕۆ و ئێمەش لە دواتەوە لەگەڵ بۆنکردن بە عەترە بۆنخۆشەکەتەوە، تەماشای بێگەردیی تەمەن و خەبات و هەستەکانت دەکەین، کە وەک یەخە و سەردەستی کراسەکەت، سپیی سپیی دەچنەوە...

هەولێر
٢٠٠٦ /١١/١

یەکەمجارەکان کە گوێبیستی ناوەکەی بووم، لە ڕێگەی هەندێک وتارییەوە بوو کە وەرگێڕدرابوونە سەر زمانی کوردی. ئەو بە زمانی عەرەبی دەنوسێت و لە ڕیزی سەلیم بەرەکاتدا، یەکێکە لە ڕێزلێگیراوترین ئەو کەسایەتییە کوردانەی کە نەک هەر دەنگێکی ناسراوە، بەڵکو ئەکادیمییەکی دیاری ناو ڕۆشنبیران و بیرمەندانی عەرەبە کە بەشدارییەکی بەرچاوی هەیە لە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنیریی دیموکراسی و هزری ڕەخنەییدا. بەڵام ئەو بەدبەختییەکی زگماکی لەگەڵە کە کوردە و لە کوردە جیدی و دڵسۆزەکانیشە، نەک بازرگان و چەتەکان.

پاش ئەوەی لە ڕێگەی ناوەکەیەوە ناسیم، تەلەفۆن و ئیمەیڵەکەیم پەیدا کرد و ئیتر پەیوەندییەکەمان چووە ئاستێکی تر و تا دەهات پێویستیی هەرێمی کوردستان و زانکۆ و بەتایبەتیش بەشی فەلسەفەم، بەو مرۆڤە، زیاتر بۆ دەردەکەوت. لەو کاتەدا ئەو لە

کێشەیەکی گەورەدابوو، پاسپۆرتەکەی خرابووە ژێر چاودێرییەوە و نەیدەتوانی سەفەر بکات. منیش نازانم بە چ ئەقڵێکەوە لە ڕیزیی ئەو کەسـانەدا بووم، کە سوور بووین لەسەر ئەوەی پێویستە ئەو بێتە هەرێمی کوردســتان. سەبارەت، بە خۆم ئەوەندە هەبوو کەسانێکی ترم دەناســین لە دەڤەری ئــەو، کە لێرە توانیبوویان لە پســپۆڕیی خۆیاندا کار و پۆست وەربگرن و ژیانێک بۆخۆیان دابین بکەن، بەبێ ئەوەی وەک ئەم، دەست لە کۆی بەرژەوەندییەکانیان هەڵبگرن و بە عەشــقی ئەزموونی هەرێمی کوردستان و کوردایەتییەوە، هاوسەر و منداڵەکانــی جێبهێڵێ و لە یەکەم هەلدا کە پاســەپۆرتەکەی چنگ دەکەوێتەوە، بێت بەرەو بەهەشتی وادەپێدراو.
هەوڵەکانــی مــن بۆ بانگهێشــتکردنی و دەســتکردنی بــە دەوام لە بەشــەکەمان تا ئێستاش بە ئەنجام نەگەیشــتوون. لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژێــک لــە ســلێمانییەوە، تەلەفۆنێکــم بۆهات و یەکســەر گوتی: «ڕێبوار هاتم و لێرەم». ئەم دەنگ و هەواڵە هەم دڵیان خۆشکردم و هەم ترساندمیان. دڵم خۆش بوو بەوەی کە یەکێک لە کەسایەتییە جیدییەکانی بواری فیکر و فەلسەفە، کە تەنیا بەرهەمەکانی شایەتی ئەم قســەیەن، هاتۆتە هەرێمی کوردستان و ئیتر لێرە شوێنپەنجەی خۆی بەســەر تەوێڵی ســەردەمێکەوە بەجێدەهێڵێــت، کە لە هەموو شــتێکدا دەوڵەمەنــد و لــە فیکر و فەلســەفەدا، دەســتبڵاو و لات و هــەژار. ئــەوەش کــە زیاتر دڵــی خۆشــکردم ئــەو ئاگاداربوونەی ســەرۆکی حکومەتــی هەرێم، بەرهەم ســاڵح، بوو لــە هاتنەکەی و گوایە پشــتگیریی تــەواوی لــە دامەزراندن و هێشــتنەوەی دکتۆر سەربەســت نەبی لە هەرێمی کوردســتاندا. ئەوەش کە ترســاندمی و گومانێکــی زۆری دەخســتە دڵمەوە، ئەو ئەزمــوون و یادوەرییە تاڵ و ناخۆشــانەمە لەگەڵ سیاســیە کوردەکانی لــە نمونەی وەک

سەرۆکی حکومەتی هەرێم و هەڤاڵانی و ئەو بێهەڵوێستیی و فەرامۆشکارییە زۆرەیان لە ئاست بیرمەند و ئەهلی فیکر و فەلسەفە و ئەکادیمییەکاندا. ئەمە جگە لە بیرکەوتنەوەی ئەو هەموو باوەشگرتنەوە و خەندە هەمیشەییە زۆرانەیان لە ئاست بازرگان و ڕەمزەکانی پارە و سامانداا. سەربەست نەبێ، سەرۆکی حکومەتی لە دیوەخانەکەی خۆیدا لە هەولێر بینی، کە هەر نەیدەناسی و هێشتاش ئەم سەرۆکی حکومەتە نەیزانیوە کە لەگەڵ چ وزەیەکی فیکیریی کوردیانەدا دانیشتووە. ئەم سەرۆکی حکومەتە لە خەوێکی دۆگمایی ئەوەندە قووڵدایە کە سەدان فەیلەسووفی وەک (هیوم)یش ببینێ، ناتوانێ هەڵوێستێکی کانتیانەی هەبێت و ئەمەش میرات و خەسڵەت و نیشانەیەکە بە نێوچەوانی گشت سیاسییە کوردەکانەوە لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا، کە بێئاگاییان لە فیکر و فەلسەفە، لۆگۆی ناسینەوەیانە بۆ خەڵکانێک کە ئاگاداری ئەلف و بێی فیکر و فەلسەفە بن. جارێ کابینەی شەشەم و سەرۆکی کابینەکەی ئەوەندە نائومێدکەر و کەمتەرخەمە لەئاست بواری هزردا، کە هەر دەقیقەیەک چاوەڕێی ئەوەی لێدەکرێت، لە خوتبەیەکی بزنزمانیانەیدا بفەرمووێ: «ئێمە پێویستیمان بە فەلسەفە نییە».

بۆچی ئەم پیاوە وای لێهات؟ چییە وا دەکات کە خوێندەوارترین ئەکادیمی و سیاسیی کورد، ڕایبگەیەنێ ئێمە پێویستیمان بە فیکر و فەلسەفە نییە و ئەم ڕێگرانەی بەردەم فەلسەفە کە لە حکومەت و حیزب و سیاسەتەدا ژمارەیان زۆرە، چ بەدیلێکی تر بۆ فیکر و فەلسەفە پێشکەش بە کۆمەڵگای کوردستان دەکەن جگە لە بەدیلی مۆدێلە بزنزمانییەکانیان، کە تەنیا لە سایەی ئەمانەدا فیکر دەگاتە پەراوێزترین دۆخی مانەوەی خۆی؟ ئەم سەرۆکی حکومەتە، ئەم خاوەن کەلتوورە نەبیلەی ئێمە، کە بوون و نەبوونی وەکو

یەکتــری لێهاتــووە، کە ئەمەریکیــەکان قوورمیشــی نەکەن، هیچی پێناکرێت، کە دەتوانێ دەســتی عەزیز وەیســی بگرێ لە حەفلەدا و ناتوانــێ بچووکترین بودجە بۆ گۆڤارێکی فەلســەفی تەرخان بکات، بۆ ئاوای لێهات؟ بۆچی سیاســییەکانی ئێمە یان لەشــاخەوە دێنەوە و توندوتیژییەکەیــان تێکــەڵ بە یاســا و ژیانی خەڵــک دەکەن، یان لێمان دەبنە بزنزمان و هاوکار و دەســتیار و قوورمیشکراوی ئەو ئەمەریکیە بێ کولتوورانەی کە بە ڕێگادا ڕۆیشتینیشیان عەسکەریانە و نامرۆڤانەیە؟

من تێناگەم ئەم سەرۆک حکومەتە کە ناتوانێ یەک مامۆستای کوردی لــە زانکــۆدا دابمەزرێنێ و ماڵــی وێران نەکات، بۆچی بانگهێشــتی دەکات و کەچی لێرە پێی دەڵێن: ناتوانین داتبمەزرێنین لەبەر ئەوەی تۆ سوورییت، نەک عێراقی؟ ئایا ئەمە ئەقڵییەتی چەتەگەریی نیە؟ ڕۆژێــک بۆ سەربەســت نەبیم نووســی: «حکومەتی ئێمــە توانای دامەزراندنی تۆی نیە، بەڵام توانامان هەیە لە ژێرزەمینی ئەو هوتێلەی تیایدا نیشــتەجێ کراویت، بتنێژین». ســێ مانگ بەســەر هاتنی ئەم پیاوەدا بۆ بەهەشــتەکەی هەرێمی کوردســتان تێپەڕ دەبێت، دوێنێ شەو تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی: «یازدەجاران تەلەفۆنی برادەرێکم کــردووە وەڵامی نەداومەتەوە، لە کاتێکدا من لێرە میوانم. ئایا ئەمە ڕەفتارێکی شارستانیانەیە؟»پاشــان بە دڵگەرمییەوە بەردەوام بوو: «ئەگەر لە ســەدا یەکــی ئەو تەنازولاتانــەی لێرەکردوومن بەناوی نەتەوەدۆســتییەوە بۆ برا کوردەکانم، بۆ بەشــار ئەسەدم کردبان، ئەو پەڕی حورمەتی لێدەگرتم».

من هەر لەســەرەتاوە دەمزانی سەربەســت نەبی نــا ئومێد دەکەن، دەمزانــی کەمەکــێ پــارەی بۆ هات و چــۆ و ماڵدانان بۆ ســەرف دەکەن، تا دواجار پێمان بڵێن: «ئێمە درێغیمان نەکردووە و پارەمان

داوەتێ، بە خوا..»
چەتەیەتی جۆرەها شێوەی هەیە: یەکێکیان ئەوەیانە کە بیستومانە و بینومانــە: تۆ بەڕێگایەکدا دەڕۆیت و خەڵکانێک کە وەکو خۆت و بەزمانی خۆت دەدوێن، لە پەنایەکدا ڕاتدەگرن و ڕووتت دەکەنەوە. جەمیل ســائیب (لــە خەوما)ی لە بارودۆخێکی وەکئەوەی ئێســتای ئێمــەدا نوســیی بۆ ئەوەی پیشــانمان بــدات هەمیشــە چەتەکان لە ســایەی کەسەکاندا ڕوتماندەکەنەوە. بەڵام چەتەگەریی ئێستا تەواو گۆڕانیی بەسەردا هاتووە و خودی کەسەکان دێن و لەسەر ماڵ و ژیان و کاری خۆت هەڵتدەکەنن و ڕیشەکێشت دەکەن و بانگهێشتت دەکــەن و بە کوردییەکەی، ڕووتتدەکەنــەوە و پێتدەڵێن: «وەرە بۆ هەرێم، هەرێم پێویســتیی پێتانە». بەڵام، ئێســتا کــە تۆ هاتویت بۆ هەرێم: پێتدەگوترێ: «تۆ ســووریيت، بۆیە ناتوانین داتبمەزرێنین». یا سەربەســت و یا نەبێ: ئێســتا ناتوانم بڵێم: بگەڕێوە، ناشــتوانم بڵێــم: بمێنــەوە. بەمجــۆرەش تۆ ئیتر، نــەک هاونیشــتیمانی، بەڵکو بێنیشــتیمانییەکیت لــە تاراوگــەدا. بەڵام پەیمانــت دەدەمێ، ئێمەش لەمــەودوا و لە هەڵبژاردنەکانی داهاتــوودا دەنگ بۆ هیچ چەتەیەک نادەین بە ناوی کوردســتانیبوونەوە، بەڵکو دەنگ بۆ عێراق دەدەین و داوا دەکەیــن عێراق بگەڕێتەوە بــۆ ئەوەی بێبەش نەبین لە تۆ و لە فەلسەفە.



دەستێک لە سیاسەتی کوردیدا:

**نەوشیروان مستەفا**

کاتێـک تەماشـای جلوبەرگـە سـادە و پشـتێنە هەمیشـە کەمـێ هەڵوەشـاوە سـلێمانییەکەی و کراسـە ئوتوو نەکراوەکانی دەکەم، یەکسـەر بـۆ ئەوە دەچم کە ئەم پیاوە یەکێکـە لەو پیاوانەی وڵاتی ئێمـە کـە بەدەسـت نەبێت پـارووی نانـی پێناخورێـت. ئەگەرچی هیچکاتیش نەمبیستووە لە پیاوە زۆرخۆرەکان بێت، لەگەڵ ئەوەشدا کـە ماوەیەکی زۆر لەگەڵ مام جەلالدا هاوڕێ و هاوخەبات بووە و مامەمەش بە سفرەپڕی ناسراوە، کەچی نەوشیروان مستەفا لەمەدا هیـچ کاریگەرییەکی لەوەوە وەرنەگرتـووە. من بە تەواوەتی نازانم ئەم مرۆڤە لە خەڵوەتی ژیانی خۆیدا و لەگەڵ ماڵ و منداڵیی خۆی، بە دەسـت پاروەنانەکانی دەخوات، یان بە کەوچک و چەتاڵ، بەڵام دەزانم لە بەکارهێنانی ئەودا بۆ دەست، هەمیشە شتێکی خۆماڵیانە، خاکیانە و ساکار هەیە، کە سرووشتی مرۆڤی لۆکاڵیی لە پەیوەندیی بەو شوێن و خاک و دەوروبەرەوە دەستنیشان دەکات کە لەسەری

دەژی. ئەو لە ماوەی ئەو چل ساڵەی ڕابردوودا ئەوەی بە دەستی خۆی ئەنجامی نەدابێت، نەیکردووە. ئەوەش کە بەدەستی خۆی ئەنجامیدابێت، جیاواز بووە لەوەی ئەوانیتر ئەنجامیان داوە و ئەمەش ئاشکرای دەکات کە ئەو مرۆڤێکی دەگمەن و دانسقەی ناو سیاسەت و مێژووی ئێمەیە، کە وا دەکات من لە ناخی ناخەوە خۆشەویستییەکم بۆی هەبێت.

کاتێ لە ماڵی خۆماندا، لەناو کەشوهەوای ماڵەئاغایەکی نیشتیمانپەروەری بە کەلتوور عەشایەردا چاوم کردەوە، نەوشیروان مستەفا پێش من لەوێ بوو. ئەو وەک ناوێک و وەک کەسایەتییەک، کە هەر جارەی لە مەجلیسەکاندا باسی دەکرا، ئامادەیی هەبوو. جارێ دەکرایە ئەهریمەن و جارێ بە فریشتە و زۆرجاریش وەک مرۆڤێکی ئازا و پیاوێک، کە لە مەرگ ناترسێت، باسیدەکرا. یەکەمجاریش کە بینیم و لە نزیکەوە سڵاوم لێکرد و تەوقەمان کرد، لە شاری لەندەن و لەسەر جادە بوو، کاتێ ئەو لەگەڵ خانمەکەیدا و من لەگەڵ ڕێبوار سەعیدی هاوڕێم، پیاسەمان دەکرد. لەو بینینەوە یەکسەر ئەم پیاوەم خۆشویست، بەڵام کۆی ئەو وەسفانەی لەسەری بیستبوومن کاریگەریی باش و خراپیان لەسەر من دانابوو. من نەمدەتوانی بە بینینی یەکجاریی ئەو، لەبەرامبەر کەلتوورێکدا ڕاوەستم، کە وێنەیەکی تری بۆ دروستکردبوو. ئەرێ بەڕاست، مرۆڤ لەسەر شەقامێکی لەندەن، چی لە سیاسیی و پێشمەرگەیەکی کورد، کە ناکۆکیی لەگەڵ حیزبەکەی پەڕاندبوویە ئەوێ، تێدەگات؟ من تەنیا سادەیی و توندوتیژی و بوێرییم لە کەسایەتی پێشمەرگانەی ئەودا بینی، کە خاڵیی نەبوو لە نائومێدی و بەخۆداڕۆچوون.

دواجار کتێبەکانیم خوێندنەوە و حینجەم کردن. لە جارێک زیاتریش.

لـە کتێبەکانیدا بەشـێکی تری کەسـایەتی ئەوم بـۆ دەرکەوت و تا دەهات وەڵامی پرسـیارەکەمم بۆ ڕوونتر دەبۆوە. دەسـتی ئەو لە بەرهەمەکانیشـیدا ئامادەیی هەیە، وەک دەسـتێک کە دەنووسێت و من دەمەوێت لەو دەسـتانەی تێبگەم چونکە دەزانم کاراکتەری ئەو لە کارەکانیدا بە ڕوونیی دیارە، بەڵام ئایا دەستی ئەو چی لە مێژوو دەوێـت و چۆن دەینووسـێتەوە؟ ئەو لە دوو خاڵدا شوێندەسـتیی خۆی بە مێژووەوە جێدەهێڵێت:

یەکـەم: دۆزینـەوەی ئـەو هـۆکارە دەرەکیانـەی کـە کاریگەریی ڕاستەوخۆیان لەسەر مەسەلەی کورد، لە پێش و لە میانەی سەدەی بیسـتەمدا جێهێشتووە و قەدەریی مرۆڤیی کوردیان بە ئاڵۆزییەکی بێوێنە گەیاندووە، کە بۆ دەربازبوون لەو ئاڵۆزییە کورد پێویستیی بـە هووشـیارییەکی مێژوویی پتـەو هەیە تا بتوانێ چارەنووسـی خۆی لە تەونی ئەو داوانە ڕزگار بکات، کە ناسـیۆنالیزمی شۆڤێنی ناوچـەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاسـت و هاوپەیمانەکانی لە کۆلۆنیالیزم و دەسەڵاتی ئایینی و شۆڤێنیزمی تورک و فارس و عەرەب ڕزگار بـکات. لەم بەشـەی پەیامـە مێژووییەکەی ئـەودا، خوێنەر گەلێک وانـەی گرنگ لە مێـژووەوە فێر دەبێت، کە دەسـتێوەدەر بوون لە واقیعیـی کوردسـتاندا. ئەمە ڕەهەنـدی بابەتیانـەی بیرکردنەوەی نەوشـیروان مسـتەفایە، کە بەشـێ لە خۆشەویسـتی من بۆ خۆی بەلای کەسایەتییەکەیدا پەلکێش دەکات و وام لێدەکات لە دەرەوەی ئەو وێنە کەلتوورییەی بۆی دروستبووە، لە دەرەوەی ئەو قسانەی لە مەجلیسـی عەشایەریدا لەسەری دەکران، ڕێزێکی زۆری لێبگرم. ئەمە ئەو ڕێچکەیەی بیری نەوشیروان مستەفایە، کە پێموایە جێگەی ئیرەیـی نەیارەکانـی و هەر سیاسـییەکی تری کـوردە، کە ناتوانن وەک ئەو، لە ڕەهەندی تیۆریکدا بۆ وەڵامی کێشە و نشوستییەکانی

نەتەوەی کورد بگەڕێن. نەوشیروان ئەم سەفەرە بەناو غەدرەکانی مێـژوودا دەکات و هەوارگـە گووشـارهێنەر و نامرۆڤییەکانـی ناسـیۆنالیزمی ناوچەکە لە دژایەتییاندا بۆ مەسەلەی کورد، بەسەر دەکاتەوە، بەڵام بۆخۆی بۆ ساتەوەختێکیش لە پاڵ پاساوهێنانەوەی بۆ مافەکانی گەلی کورد، بەرگی شۆڤێنیزم و ڕقبوونەوە لە ئەوانیتر بەبـەردا ناکات. ئـەو مێژووەی بەم ئاراسـتەیەدا دەینووسـێتەوە، مێژوویەکە جێی بڕوا و متمانە.
ئـەو خاڵـەی دیکەی ئەم پیـاوە لە مێـژووی دەوێت، هیـچ نییە لە دۆزینـەوەی هاندەر و هۆکارە ناوەکییەکانی کۆمەڵگا و سیاسـەتی کوردیی بۆ مانەوەی لە بازنەی تراژیدیا و دواکەوتوویی و ناکۆکیدا. لەم گەڕانەیدا، نەوشـیروان مسـتەفا وێڕای هـەر هۆکارێکی دیکە، کـە وەک هۆکاری دواکەوتوویـی کۆمەڵگای کوردی و مانەوەی لە بازنەی توندوتیژیدا، دەستنیشـانی دەکات، چنینیی عەشایەرییانە و خێڵەکیانەی کۆمەڵگای کورد لە بیر ناکات. لەبەر ئەوەش کە بەشێکی زۆری دەرگیرییەکانی حیزبەکەی پێشووی ئەو لە ڕابردوودا، لەگەڵ پارتیدا بووە، ئەوە ئەم نووسـەرە سیاسییە زۆرینەی بۆچوونەکانی خۆی لەسـەر ئەو بناغەیەوە داڕشتوون، کە بنەماڵەی بارزانی یەکێ لـەو هۆکارانـەن کۆمەڵـگای کوردییان لە ڕووی سیاسـییەوە، دوا خسـتووە لەوەی بە مەرامی خۆی بگات. ئەم بۆچوونە لە مێژوودا بە بۆچوونێکی شەخسی و سەبجەکتیفانە دەژمێردرێ و وێڕای هەر بەڵگەیەکی سـایکۆلۆژیش لەمبارەیەوە، لۆژیـک پێماندەڵێت، ناکرێ تاکە یەک هۆکار، ئەویش لەسـەر ئاستی سـایکۆلۆژی، ببێتە هۆی گۆڕین و تێکدان و ڕێگرییکردن لەو ڕەوتەی بۆی هەیە کۆمەڵگایەک و نەتەوەیـەک بیگرێتـە بەر. بۆیە ئەگەرچی ڕەهەنـدە بابەتییەکەی تێڕوانینی نەوشـیروان مستەفا وەک کردار و چالاکییەکی هزریی و

مێژوویــی جێی خۆی دەکاتەوە، کەچی ڕەهەندە ســەبجەکتیڤەکەی وەک پەرچەکردارێــک خۆی بەدیار دەخــات و خاوەنەکەی دەخاتە هەڵەوە.

مــن لەناوەندیی ئــەم دوو ڕەهەنــدەی بیرکردنەوەی ئــەم پیاوەدا، ڕەهەندیــی ســێیەمیش دەبینم، کە خەمخۆریــی و بیرکردنەوەیەتی بــۆ کۆمەڵگای کوردی و هەوڵدانــی جیدییەتی بۆ ڕزگارکردنی ئەم کۆمەڵگایە لەو کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و ئابووریانەی تێیکەوتــووە. بیرکردنەوەی لە دامەزراندنــی بزووتنەی گۆڕان ئەم ڕەهەندی ســێیەمە تەواو دەکات. ئەگەرچــی ئەو بۆچوونەش هەیە کە نەشــیروان مســتەفا لە ئەنجامی قەبووڵنەکردنی ئەو ئاشــتیی و هاوپەیمانییەتییــەی لــە نێــوان پارتی و یەکێتیدا دروســتبووە و بە ســووربوونیەتی لەسەر بۆچوونە خودگەرا و ســەبجەکتیڤانەکەی لەســەر پارتی و بنەماڵەی بارزانی، کە هەم لە یەکێتی جیابۆتەوە و هەم بزووتنەوەی گۆڕانی پێکهێناوە، وەلێ من کاتێ گوێمدەگرت لە وتــارە ڕادیۆییەکانی و ئەو پەیامانەی لە کەناڵەکانی گۆڕانەوە بڵاو دەکرانەوە، نەغمەیەکــی گاندیانەم گوێ لێدەبوو، کە ڕێگەم پێنادات بە تەواوی لەگەڵ ئەو لێکدانەوەیەدا هاوبیر بم. خۆ ئەگەر کەرووی ئەو بۆچوونە ناوچەگەرایانەیەش لە هزریی سیاســی و حیزبیانەی ئەم مرۆڤەدا مابێت، پێویستە داوەتی بکەین کە پێویستە خۆی لەهەر جۆرە حوکمێکی پێشینە و کورتکردنەوەیەکی سەبجەکتیڤانەی مێژوو، ڕزگار بکات و بچێتە ناوەندی هەر هاوپەیمانێتییەکی مێژووییەوە کە چ بەرژەوەندیی و چ واقیعی کوردســتان بەسەر پارتی و یەکێتی و ڕەوتی سیاســیی ئەم هەرێمەیدا سەپاندووە، چونکە ناکرێت مرۆڤ گاندیانە بیر بکاتەوە و کاتێ قسەش بێتە سەر تەبایی نێوان یەکێتی و پارتی و بنەماڵەی بارزانی، نالێبووردەیی تەنگ بە لێبووردەییمان

هەڵچنیٚ.

دوای دیدارە کورتخایەنەکەی لەندەنم لەڵ ئەم پیاوەدا، لە سلێمانیش چەند جارێک لە ماڵەکەی خۆی، بینیمەوە. ئەوە سەردەمێک بوو کە زۆرینەی هاوتەمەنەکانی ئەو بێوەفایی خۆیان لە ئاست هاوسەری یەکەمیاندا پیشاندابوو، بەلاّم ئەو بەردەوام وەفادارانە لەگەڵ هاوسەرەکەی مایەوە. دیسانەوە سادە و خاکەڕا، وەکخۆی، بەلاّم ئەمجارەیان ئەو نائومێدییە هاوشانەی بە ژیانی تاراوگەیی، ببووە نیگایەکی پڵنگئاسا کە لەو گردەوە دەیڕوانی. ئەم ڕوانینە دواجار بزووتنەوەی گۆڕانی لێکەوتەوە، بزووتنەوەیەک کە درێژکراوەی دەستەکانی ئەوە و تەکانێکی گەورەی دا بە دیدیی سیاسی وڵاتی ئێمە بەرەو خۆنوێکردنەوە و مۆدێرنیزەبوون: هەر ڕەنگدانەوەی ئەو دەستانەش بوون بۆ یەکەمجار بە مێزەکانی پەرلەمانیاندا سرەواند. بەلاّم ئەم گۆڕانە هێشتاکەش پێویستی بە چەکە مۆدێرنەکەی فیکری سیاسیی هەیە: بە تۆلێرانس و قەبووڵکردنی ئەوانیتر لە واقیعی ئێستادا، بەبیٚ بەستنەوەیان بە ڕابردوویانەوە، چونکە هیچکەس و لایەن و شتێک نییە، ڕابردووی خۆی بە دوایەوە نەبێت.

لەبەر ئەوە داوا لەم پیاوە سادەیە دەکەم کە داڕێژەری سیاسەتی نوێی کوردییە، بەو دەستانەی خۆی، کە نمونەی دەستیی کارا و ئیشکەرن، دەست بۆ هەر دەستێک درێژ بکات، کە گەرمیی تەوقەکردن تیایدا، ئاشتیی کۆمەلاّیەتی و تەبایی سیاسی بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

٢٠١٠/١٠/٧



مرۆڤە بیرکۆتیەکە:

## عەبدوڵا پەشێوی شاعیر

لە منداڵییەکی زووەوە پەشێوم هەر بەو وێنەیەیدا دەناسییەوە کە لەسەر بەرگی کۆمەڵە شیعری (شەو نییە خەونتان پێوە نەبینم)، چاپکرابوو. نازانم ئەو هەرگیز چەپ بووە، یان نا، بەڵام ئەم جۆرە پۆرترێتانە لە مێژووی چەپدا و بەتایبەتی لە شەست و حەفتاکانی سەدەی پێشوودا باو بوون و پتر نەرێتێکی گیڤارایی بە بیری مرۆڤ دەهێننەوە. وێنەکە کەسایەتی پەشێو وەک مرۆڤێکی خەباتکار، خەمخۆر و ئازار لە کۆڵ، کە ئەو ئازار و خەمانە بۆ خودی خۆی نین و خەم و ئازاری نیشتیمانن، دەناسێنێ. بەڵام نیگای پەشێو لە چوارچێوەی وێنەکە چۆتە دەرەوە و بۆ ئاسۆیەکی دوور دەڕوانێت: نیگایەکی ئایدیۆلۆجی، کە پێماندەڵێت ئەم خەم و ئازار و کۆژانە کۆتایی پێدێت و ڕۆژی کامەرانی و ئاسۆی خەبات ڕوونە. ئومێد کۆتایی بە نائومێدی و داهاتوو کۆتایی بە واقیع دەهێنێ و ئێمە دەچینە ئەو ڕۆژگارەوە کە هەموومان خەونی پێوە دەبینین.

ئەم خەونە، خەونی نەوەکانی پێش پەشێویش بوو، هێمن و قانع و بێکەسیش هەر بەوجۆرە خەونیان دەبینی بە ئازادیی نیشتیمانەوە. لەبەر ئەوە پەشێو لەناو نەریتێکی شیعریی و هزریی ڕەسەنەوە خەونی دەبینی و خەباتی بۆ دەکرد. هەڵبەت هیچکەس گومانی لە کەسێتی خەباتکارانەی پەشێو نیە، بەڵام سەبارەت بە مانەوەی پەشێو وەک مرۆڤێکی ئومێدەوار، پێویستە قسەی تر بکەین.

بە بڕوای من ئیتر ماوەیەکی زۆر زۆرە پەشێو لە ڕووی سیاسیی و ئایدیۆلۆژییەوە، مرۆڤ و شاعیرە ئومێدەوارەکەی جاران نەماوە. بڕواش ناکەم تازە ئەو لەو تەمەن و ئەزموونەدا نەخۆی و نە کەسمان هەڵخەڵەتێنێ و بۆ ئەوەی قوڵپی گریانی ناخی خۆی ڕابگرێ و ورەی ئێمە نەڕووخێنێ، بێت و باس لە خەونی ئومێدەوارانە بکات. پەشێو، تا ئەو کاتە خەونی دەبینی کە بەعس وڵاتی داگیر کردبوو، کە دەیتوانی باس لە جەلاد و قوربانیی بکات و کە دەیویست دادی کورد لەدەست بێدادیی داگیرکەران بگەیەنێتە گەلان. بەڵام لە دوای ڕاپەڕینەوە، بەتایبەتیش لە دوای جەولەی یەکەمی شەڕی گشتیی کوردەکان، شەڕی هەمووان لەگەڵ هەمووان، پەشێو لەو خەونە دێرینەی بەئاگا هاتەوە و بگرە ڕاپەڕی و تووشی شۆک و خرۆشانێکی ناخەکی هات کە هەندێ جار نیشانەکانی فیگرتنێکی شیعری بە بیرکردنەوە و بەرهەمەکانییەوە دەردەکەوێ. بەڵام ئەو هەرگیز ئەم تووڕەبوونەی خۆی نەشاردەوە و هەرگیز تووڕەییە ناخەکییەکانی خۆی لە دەفرێکی دیپلۆماسیانەدا نەپێچانەوە تا بیانکاتە قوربانیی زمانێکی شیعریی ماسک لەسەر و ناڕاشکاو، یان شێوەیەکی خوازەئاسا و میتافۆریانە بکات بە بەری زمانەکەیدا. ئەو دەرگای لەسەر ئاوەڵایی و ڕاشکاوی کردەوە و لێگەڕا تووڕەیی و خرۆشانەکانی هاژە بکەن و شیعرەکانی لێوڕێژکەن لە

خۆشەویستی و ئینتیما و دەروەستیی بۆ نیشتیمان و مرۆڤەکان و لە ڕق و داشۆرینی سیاسییەکان. ئەو لە شیعرەکانیدا شتێکی نەگوت و دوایی پێمان بڵێ: مەبەستم ئەوەیە و ئەوە بوو. ئەو دووڕوویی شیعریی و ڕیای شاعیرانەی بەجێهێشت و وەکخۆی، وەک کوڕە (بێرکۆت)یەکەی جاران، هاتە قسە و بەمەش زۆربەی ئەو خۆبەشاعیرزانانەی بەجێهێشت کە لە چوارچێوەی سەرەتاتکێ و گەمەی زمانەوە، هەم خۆیان و هەم خەڵکیان دەخەڵەتاند و لە دەسەڵاتیشدا پۆستیان وەردەگرت. پەشێو، هاوکات بە دەرگا کردنەوە لەسەر وزە ناخەکییە مرۆییەکەی خۆی، دەرگای لەسەر هەرجۆرە درۆکردنێکیش بەناوی شیعرەوە، داخست: ئەو لە زمانی ڕۆژانەوە نەچوو بۆ ناو زمانی شیعر، بەڵکو لە زمانی شیعری باوەوە، لە شەرمنیی شیعرییەوە، هاتەوە بۆ ناو گوزارە ڕاشکاوەکانی زمانی قسەکردن و گوزارەکانی توڕەیی. بەجۆرێ کە جاری واهەیە پەشێوم لە شێوەی مرۆڤێکدا دێتەوە پێشچاو کە لەسەر شەقامێک، دەستەویەخەی مێژوویەکی بێمانا بووە کە بەناوی شۆڕش و ئازادیخوازییەوە، دەیان مشەخۆری سیاسی و گەورەبازرگان و دڕندەی بەسەر کۆمەڵگاوە کردۆتە خاوەن. پەشێو هیچ کێشەیەکی تایبەتی لەگەڵ بکەرانی ئەم دەوروزەمانەیە(١) نییە، هیچ ململانێی لەگەڵ سیاسی و بازرگان و هاوچەشنەکانیاندا نییە. بەڵکو ئەو نەفرەت لە مێژوویەک دەکات کە لە جیاتی دەرهاویشتنی ئازادی، کۆیلەیەتی و لەجیاتی مرۆڤی قارەمان پیاوی ترسنۆک و خۆفرۆشی هێناوەتە بەرهەم. هیچ شتێک پەشێوی هێندەی شەڕی ناوخۆ، کە ئەو پێیدەڵێ: شەڕی خۆکووژی، ئازار نەدا. شەڕی ناوخۆ لە شیعری پەشێودا، بووە دروستکەری شیعرێکی تووڕە، تفکردنە میتافۆر و گەڕانەوە بۆ زمانی ڕاشکاویی و زمانی مەبەست.

ئێمەو مانان کاتێ ئەو شیعرانەی پەشێومان بەرگوێ دەکەوتن، یان دەمانخوێندنەوە و دەمانزانی ئەو لە دوورەوە تەماشـــای نیشتیمان دەکات، دڵگــران دەبووین لە ئامادەیی هزرێکی توورە و ناشایســتە بە جیهانی شیعری باو، دەترســـاین لەوەی نەتەوەپەرستیی پەشێو و هەڵوێستەکانی بەرامبەر سیاسییەکان و واقیع، وێنەی شاعیرێکی خۆ لەبیرکردوو، یان هاندەری ڕق و کینە و خرۆشاندنی جەماوەر، بە پەشێو ببەخشن. بەڵام کاتێ ئەو نیشتیمانەی پەشێو لە تاراوگەوە تەماشـــای دەکات، لـــە نزیکـــەوە دەبینێـــت، کاتـــێ لـــەو کاراکتەرانە تێدەگەیت و دەیانناســـیت کە وڵاتیان بەو دەردە بردووە، کە پەشێو لە ئاســـتیدا هاوار بکات، تێدەگەیت نیشتیمان لە دووریی ئەو نییە و ئەو لە نیشتیمانەوە دوور نییە. ئەو وڵاتی بردووە بۆ ئەوێ.

من دەزانم نیشـــتیمان پێویســـتیی بە پەشێوە، دەشـــزانم گوندەکەی ئەو بیرکۆت، کە پەشـــێو بە جیهانی ناســـاند، بەعس ڕاینەگواســـت، بەڵام لەژێر هەڕەشەی ماستەر پلاندایە و کەسیش لە بیری ئەوەدا نییە، لەســـەر شـــەرەفی ئەم شـــاعیرە دەســـت لە ڕۆحی ئەو گوندە هەڵبگرێت.

ئایا بە پەشـــێو بڵێین بگەڕێوە نیشـــتیمان؟ ئایا لە نیشـــتیماندا کەس پێویستیی بە پەشێو هەیە؟ بۆ پرسیاریی یەکەم هیچ وەڵامێکم نیە و جارێ بیری لێدەکەمەوە، بەڵام بۆ وەڵامی پرسیاری دووەم، دڵنیام. بۆ یەکەمجار لە شـــاری کۆپنهاگن لە فیســـتیڤاڵێکی شیعریدا ناسیم. زۆریـــش هانیدام شـــیعری کورت بنووســـم. جارێکیـــش لە کۆلێژی ئەدەبیات شـــیعری خوێندەوە و لە شەوێکیشدا لە هەولێر و ئەماڵی یەکێ لە خزمەکانی، دەردەدڵێکی زۆرمان کرد. ئەو چیدی پەشێوی ســـەر وێنەی یەکەم کۆمەڵە شیعرییەکەی نەمابوو. سەر و ڕیش و ســـمێڵ بەفری تەمەن و ماندوویی ڕۆحیان لێنیشتبوو. وەلێ پەشێو

لــە هزرین و بیروڕادا بێســنوور ڕەوان و ڕوون، بێســنووریش بە پێچەوانەی شیعرە سیاسییەکانییەوە، هێمن و لەسەر خۆ و بە ئەدەب و گەورە. بیری دەکەم. بە ڕاستیی بیری ئەو مرۆڤە هەولێرییە پاک و گەورەیە دەکەم، کە ئیتر نیشــتیمان و زێدی خۆی بۆ هەمیشە لە دەست داوە و ڕەنگە هەرگیز نەگەڕێتەوە ناومان.

لەسەرەتاوە سەرم سووڕما لەوەی کە پارتی و ئەوانەی بارزانییان خۆشدەوێت، پەرچەکردارێکی کەمێ توندیان بەرامبەر توێژەرێکی گەنج، کە بۆخۆی کوردە، پیشاندا. مەبەستم (عرفان قانعی فەرد) ـە. ئەم پەرچەکردارە دەکرێ وەک دڵنیا نەبوون و متمانە نەکردن بە ڕۆڵی مەلا مستەفای بارزان لەسیاسەتی سەدەی بیستەمی کوردستاندا، لێکبدرێتەوە، چونکە لەو وتارانەی بۆ بەرگریکردن لەو پیاوە مێژووییە نووسران، شتی بێمانایان زۆر تێدابوو، کە لەگەڵ بیروڕا مرۆڤدۆستی و ئارامخوازی و لێبووردەییەکانی بارزانیدا نەدەگونجان و توندڕەوی و وەسف و پیاهەڵدان لەو وتارانەدا شەپۆلی دەدا.

من لە دژی ئەم جۆرە بەرگریکردنەم لەهەر کەسایەتییەک، کە بۆخۆی میراتێکی پێچەوانەی ئەوەی بەجێهێشتووە. ئەگەر ئێمە توندڕەوانە و بە تووڕەیی و هەڕەشە بەرگریی لە کەسایەتی بارزانی

بکەین، ئەمە بۆخۆی بەڵگەیە لەسەر نەگەیشتنی ئەو میراتەی ئەو بە ئێمە و ونبوونی بارزانیی ڕاستەقینە لەناو کۆمەڵێ دروشم و وەسف و مەرایی و پیاهەڵداندا، کە هیچ سوودێک بە تێگەیشتن لە کەسایەتییەکەیَ ناگەیەنن و نەوەی پاشەڕۆژیش هەڵوێستی لە ئاستدا ناکەن و ئەمەش بە مانای ئەوەیە کە ئێمە لەسەر ئەو نەهجە، کە تێیدا گوایە دەمانەوێ بارزانیی وەک (کەسایەتییەکی نەمر) بناسێنین، دێین دەیکوژین و لە بیری نەوەکانی پاشەڕۆژی دەبەینەوە.

من لەم بۆچوونەمدا ڕووی دەمم بە پلەی یەکەم لە بنەماڵەی بارزانیی خۆیانە لە هەڵوێستیاندا بەرامبەر بە مەلا مستەفا، چونکە ئەوان هاندەر و داینەمۆ و پشتیوانیکەری بارزانییەکن، کە لەناو ڕستەی ئینشایی بێمانا، لە تەعبیری درۆزنانە و مەراییکەرانەدا، یان لەناو کۆمەڵێ ڕستەی پێشتر بڕیار لەسەردراوی ناو ڕاگەیاندنی پارتیدا خنکێنراوە. ئەم بارزانییەی بەوجۆرە لە موناسەبە و بۆنە سیاسییەکاندا باسی دەکرێ و وێنەکەی لە هەموو فەرمانگەکان هەیە، هیچکات ئەو بارزانییە نیە کە وەک قارەمانێکی کلاسیکی، میراتێکی مرۆیی و ئەخلاقی و سیاسی بۆ جێهێشتووین. بەڵام بارزانی ناو ڕاگەیاندنەکان و مەدح و سەنا و بۆنە سیاسییەکان، ڕێگرێکی هەرە گەورەیە لەبەردەم ئەوەی بتوانرێ قسە لەسەر بارزانیی مێژوویی بکرێ و لە ڕوانگەی پەروەردەیی، ئەخلاقی، کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە، میراتەکەی شرۆڤە بکرێ و بگەیەنرێ بە نەوەی ئێستا و پاشەڕۆژ. بارزانیی سەر لاپەڕە زەردەکان و ناو وتارە پڕ بریقە و باقەکان زوو دەمرێ و لە بیر دەچێتەوە، بەڵام ئەو بارزانییەی کە سەرچاوەی میراتێکی فیکری و ئەخلاقی و سیاسی و پەروەردەییە، تا ئێستا کاری لەسەر نەکراوە و ئەگەر ئێمە لەم

ئاستەدا کارمان لەسەر میراتیی کەسایەتییە سیاسییەکانمان بکردایە، ئێستا ئەوەندە بە یەکدوو قسەی مێژوونووسێک، یان گۆڤارێک، کە با هەر نیەتێکی تریشیان هەبێت، هەراسان نەدەبووین.
ئەو هەراسانییە، بەرەنجامی نەناسینی ئەو نەریتەیە کە ئێمە کارمان لەسەر نەکردووە، بنەماڵەی بارزانی هاندەری نەبوون و ئەرشیفی ئەم پیاوەیان نەخستۆتە بەردەست توێژەران و هەروەها پارتیش وەک حیزبێک، لەڕاگەیاندن و مەراسیمە تایبەتیەکانی خۆیدا هەرگیز بەلای ناساندنی کەسایەتی واقیعیانەی بارزانیدا نەچوون. بۆ ئەوەی بارزانیی لەدەست ئەم بۆچوونە کۆن و تەقلیدی و پیرۆزگەرایە بستێنینەوە، پێویستە پێش هەموو شتێک کۆی وێنەکانی لەناو فەرمانگەکاندا داگرین و ئیتر مامەڵە لەگەڵ بارزانیدا نەکرێ وەکئەوەی کە بچووکمان کردۆتەوە بۆ سەر ئاستی وێنەیەک. دووەم: پێویستە بارزانی لەو کوشتارگای وەسف و پیاهەڵدانەی پارتی و دەزگاکانی و ئۆرگانەکانی، بۆیان دامەزراندووە، ڕزگار بکرێ و هاوچەرخانەتر لەگەڵ بەرهەم و پەیامی ئەم کەسایەتییەدا مامەڵە بکرێ و بەرهەم بهێنرێتەوە. ئەمەش لەو ڕوانگەیەوە کە بەرهەم و پەیامی ئەم کەسایەتیە نە بەنووسراو، نە بەگوتراو لە سەردەمی ژیانی خۆیدا تەواو نەبووە. بارزانی وەک هەر کەسایەتییەکی مێژوویی کە سەردەمەکەی ئەرکێکی نەتەوەیی گەورەی خستۆتە سەرشان، بە چەند شێواز و زمان و پراکتیک، تەعبیری لە خواست و ویستەکانی خۆی کردووە. بۆ نمونە کۆنفسیۆس لە مێژووی چیندا کەسایەتییەکی بەرجەستەیە، بەڵام ئەوەی ڕێبازی کۆنفسیۆسیزمە و هێزی دەوڵەمەندی ئەم مرۆڤەی پێوە دەناسرێتەوە، بریتیە لە چەندین تەئویل و تەفسیری جیاواز، کە پاشتر لە لایەن لایەنگر و پەیڕەوکارانییەوە بەرهەمهاتن و پلەی ئەویان گەیاندە پێگەی

پەیامبـــەری. ژیان و ئەزمـــوون و ئەوەی پێیدەگوترێ (ڕێبازی مەلا مســـتەفای بارزان)یش پێویســـتیی بە بەرهەمهێنانـــەوە هەیە، دیارە نـــە پارتی دیموکراتِ بێلایەنانە و نـــە خودی بنەماڵەی بارزانیش بە تەنیـــا دەتوانن میراتی ئەزموونی خەباتی بارزانی بەرهەم بهێننەوە. کاریگەریی کەســـایەتی بارزانییش هەر زوو ئەم دوو جوگرافیایەی بەزاند و لەسەراپای کوردستان و ناوچەکە و جیهاندا شوێندەستی خۆی بەجێهێشت.

بەرهەمهێنانـــەوەی بێلایەنانـــەی ئەزموونی بارزانـــی گرنگە، چونکە دەمانەوێت ئەم کەســـایەتییە تەعبیر بێت لە خواســـتی نەتەوەیەک و ســـێمبوولی خەباتێـــک. خۆ ئەگەر بارزانی هـــەر بەتەنیا هی پارتییە ئـــەوە لێگەڕێن پارتی چۆن بەرهەمـــی دەهێنێتەوە، ئازاد بێت. بەڵام ئەگەر خواستەکە ئەوە بێت بارزانی ڕەمزیی نەتەوەیی بێت، پێویستە پارتی بۆچوونەکانی خۆی لە نووســـینەوەی مێـــژووی ئەم پیاوەدا نەســـەپێنێت و کەســـایەتییەکەی لـــە قاڵب نەدات. بـــەڵام بە بەڵگەوە ڕێبگـــرێ لـــە شـــێواندنی مێژووەکـــەی. لەلایەکیترەوە، دڵســـۆزانی خەباتی نەتەوەیی کورد و ئەمەگدارانی مســـتەفا بارزانی، پێویســـتە لەگـــەڵ بنەماڵـــەی بارزانی ڕاســـتگۆ و ڕاشـــکاو بن و ڕاســـتەوخۆ پێیـــان بڵێـــن کە نووســـینەوەی قۆناغێک لە مێژوو، یـــان ئەزموونی کەســـایەتییەکی وەک مـــەلا مســـتەفا، نە کاری یەک کەســـە و نە لە یـــەک ڕوانگـــەوە بە تەنیا مافی خۆی دەدرێتـــێ و نە هیچ میتۆدێکی نووســـینەوەی مێژووش هەیە لە ڕوانگەیەکی تاکڕەهەندانەوە و بە بڕیاری پێشـــینەوە بتوانێ مێژووی کەســـایەتییەک بنووسێتەوە، کە دەمانەوێت سێمبوولی نەتەوەیی میللەتێک بێت.

بـــە مانایەکی تـــر: نە هیچکاتێک ئـــەو مێژووەی بنەماڵـــەی بارزانی بۆخۆیان لەســـەر مەلا مســـتەفای نەمر دەینووســـنەوە، باشترین و

باوەڕپێکراوترین مێژووی ئەو کەسایەتیە دەبێت و نە ئەزموونی ئەو کەسایەتییەش بە تەنیا لە یەک ڕوانگەوە دەنووسرێتەوە. ئەمەش لەبەر ئەوەی بەشێکی زۆری ئەو مێژووە، مێژوویەکی زارەکیی و دەماودەمە لە سینەی ئەو کەسانەدا کە ڕۆژگارانێک لە نزیکەوە ئەم پیاوەیان بینیوە و شارەزای هەڵسوکەوتە مرۆییەکانی بوون:

مەلا مستەفای ناو سینە و یادوەری خەڵک زۆر زیندووتر و جوانتر و فرە ڕەهەندتر و مرۆڤترە، وەک لەو مەلامستەفایەی کە لە چوارچێوەی یەک کتێب و ڕیوایەتی مێژووی فەرمیدا دەیبینینەوە. من بۆیە ئەم قسانەم کرد، چونکە وەک بینیمان لە زۆرینەی هەرەزۆری ئەو وتارانەدا کە لە بەرپەرچدانەوەی گوتەکانی ئاغای (قانعی فەرد)دا بڵاو کرانەوە، بەوەی بەڕێز مام جەلالیشەوە، لەگەڵ ناوەڕۆکی پەیامی بارزانی (وەک ڕەمزیی نەتەوەیی) و ئاراستە مرۆیی و لێبووردەییەکەیدا وێک نەدەهاتنەوە و ئەگەر ئەو بۆخۆی بمابایە و بەرگریی لە خۆی بکردایە لە ئاست ئەو قسانەدا، خۆی لە قەرەی هەڕەشە و تیرۆرکردنی کەسایەتی ڕەخنەگرەکانی نەدەدا و ئەخلاقە بەرزەکەی جگە لە وەڵامێکی هوشیارانە هیچی دیکەی لێبەرهەم نەدەهات، کە دەبوو بە دەرس بۆ نەیارەکانی و دەبووە حیکمەت بۆ دۆستەکانی.

لەگەڵ ئەوەشدا من هەرگیز لایەنگریی لە گواستنەوەی قسەکانی قانعی فەرد ناکەم، ئەگەرچی وەک ئەو گوتویەتی: ئەوانە ڕای خۆی نین و بیروڕای کەسانی تر و بەڵگەنامەکانن. ئەگەر ئەمەش ڕاست بێت، ئەوە نەدەبوو ئەو وەکو کەسێک لە بواری مێژوونووسیدا کار دەکات، بەبێ خوێندنەوەی ڕەخنەگرانە، گوتراوی ناو دۆکیۆمەنتەکان و قسەی کەسانی تر بگوێزێتەوە، وەکئەوەی کە ئەو قسە و گوتراوانە ڕاستەقینەن. ئەگەر ئەو بیروڕایانە هی خۆی نین و هی کەسانی

تـرن، ئایا ئەو لە کاتی گواسـتنەوەیاندا لە کوێدا وێسـتاوە؟ بۆچی پرسـی تر لە سەرچاوەکان و گومان ناخاتە سەر بنەوانەکەیان، کە سـەرچاوەن لەلایەن هێز و وڵاتانێکەوە بەرهەمهاتوون، لانیکەم لە سەدەی بیسـتەمدا قسەی باش و هەڵوێسـتی گونجاویان لەبارەی خەباتی نەتەوەیی و ئازادیخوازانەی کوردەکانەوە نەبووە.
گللەییـەک کە دەکرێ لە کەسـانی وەک قانعی فەرد بکرێ ئەوە نیە کـە نابێت مێژوو بە جیاواز لەوەی نووسـراوەتەوە، بنوسـرێتەوە، بـەڵام گللەییەکـە لەوەدایە کـە ئایا ئامانج لە نووسـینەوەی مێژوو بە شـێوەی جیـاواز چییە؟ خزمـەت بەکێ دەکات؟ پاشـان بۆچی دۆکیۆمەنتەکان هەڵگری ڕاستین، لە کاتێکدا کە ئەو دۆکیۆمەنتانەی ئـەو بـۆ سـوکایەتیپێکردن بە کەسـایەتی قـازی محەمـەد و مەلا مسـتەفا پەنای بۆ بـردوون، جگەلەوەی لـە ڕووی جوگرافیاییەوە دوورن لەو جوگرافیایەی ئەم دوو کەسایەتییەی تێدا ژیاون، ئاواش بەرهەمێنەرانـی ئـەو دۆکیۆمەنتانە لە ڕووی ئایینـی و کەلتووری و کۆمەڵایەتییـەوە لـە قـازی محەمـەد و بارزانـی زۆر جیاواز و بگرە ناکۆکیش بوون. باشـە بۆچی کاتێ دۆکیۆمەنتێک ئەو هەموو فیلتەرانەی تێدابێت، لە لایەن کەسـانێکەوە نووسـرابێت کە ئایینیان جیاواز، کەلتووریان جیاواز و چێژیان جیاواز و کۆمەڵگایان جیاواز بێـت لـە هی دوو کەسـایەتییەکەی لەمەڕ خۆمان، هێشـتا هەڵگری ڕاستی بێت لەسەر ئەم دوو مرۆڤە؟
قانعی فـەرد لە پشتگوێخسـتنی ئـەم پرسـیارانەدا کەمتەرخەمیی کردووە و لە بڕواهێنانیشـیدا بـەو دۆکیۆمەنتانە هەر لەبەر ئەوەی خۆرئاواییـەکان نووسـیویانن، ڕەهەندێکـی لاوازی بیرکردنەوەی خۆیمان بۆ ئاشـکرا دەکات. هەر لەم کەمتەرخەمییەشیدایە کە باکی نییە بەوەی کە بەو قسـانەی، دڵی هەزاران کەسـی ئەم وڵاتەی لە

خۆی ڕەنجاند، کە هێشتاش کەسایەتی قازی و بارزانی بە دوو تێکۆشەری میللەتێک دەزانن، کە دەرهاویشتەی مێژوویەکی خوێناوییە.
من لەگەڵ ئەوەدام کە ئەو دوو مرۆڤەی کوردستان، خوداسیفەت و بێکەم و کوڕیی نەبوون، ئەوانە مرۆڤی ئەفسانەیی نەبوون و مرۆڤی مێژوویی بوون، بەڵام هەستدەکەم و بیردەکەمەوە، کە هیچ پاساوێکی ئەقڵانی و ویژدانیی نییە بۆ بێڕێزیکردن بە خەبات و ئەزموون و کەسایەتییان. هیچ کارێکی زانستی و ئەکادیمیش نییە مێژوو بەکار بهێنرێ بۆ شکاندنی گەورەیی نەتەوەیی میللەتێک، کە لانیکەم لە سەدەی بیستەمدا زۆرترین خەبات و قوربانیی لە پێناوی کەرامەتی مرۆیی خۆیدا بەخشیوە. خۆ ئەگەر ئەمە نییەتی ئاغای قانعی فەرد بێت، بە بڕوای من ئەو ئازادە، وەلێ ئەگەر ئەو زانکۆیەی بەڕێز قانعی فەرد بڕوانامەی لەسەر ئەمجۆرە لێکدانەوانە بۆ مێژوو لێوەردەگرێ، هەمان هەڵوێستی گریمانەکراوی قوتابییەکەیان هەبوو، ئەوە پێویستە سەر لەنوێ بیر لەم کێشەیە بکرێتەوە و لە دادگایەکی نێو دەوڵەتیدا سکاڵای یاسایی لەسەر زانکۆکە و قوتابییەکەی تۆمار بکرێت.
قسەی کۆتایی من ئەوەیە کە نابێت قەبووڵی بکەین، هیچ کەس و لایەنێک لە ژێر پەردەی زانست و بە پاساوی نوسینەوەی سەر لەنوێی مێژوو، سوکایەتی بە سیمبوولە نەتەوەییەکانی نەتەوەیەک بکات. ئەگەر ئەمڕۆ گوتمان با چاو لە کەسایەتی قازی محەمەد و بارزانی بپۆشین، سبەی کەسایەتیە ئایینی، کۆمەڵایەتی، ڕۆحانی و ئەدەبی و شیعرییەکانیشمان بەبەرچاومانەوە مایە پووچ دەکرێن و دەبێت ئەوەش قەبووڵ بکەین.



# پیاوێ لە جێی هەمووان و لەکەسیش ناچێت!

**عەبدوڵا ئۆجالان**

لە ئێستادا زەحمەتە بیروڕای خۆمان لەسەر کەسایەتی ئۆجالان یەکالا بکەینەوە، بەبێ ئەوەی خۆمان لەو بەشەی هەستمان ڕزگار بکەین کە ئۆجالان پەیوەستدەکاتەوە بە کێشەی ڕەوای کوردەوە. هەروەها بێمانایە چاو لەو تایبەتمەندییە باش و خراپانەش بپۆشین کە پێکەوە کەسایەتی ئۆجالان تەواو دەکەن. لەبەر ئەوە، کاتێ نەوەکانی داهاتوو دەگەڕێنەوە سەر ئۆجالان، دەتوانن باشتر و بابەتیانەتر قسە لەسەر ئۆجالان بکەن، وەک لەنەوەی ئێستا و ئێمە. لەگەڵ ئەوەشدا من بۆخۆم ئۆجالان بەمجۆرە دەبینم، کە دەمەوێت لێرەدا باسی بکەم.

ئێمەی کورد لە بواری هزری سیاسی و نووسینی و مێژووییدا، لەسەر ئاستی سەرکردە سیاسییەکان، خاوەن نەریتێکی ئەوتۆی دەوڵەمەند نین و هەمیشە گومان هەیە لەوەی ئایا ئەو سەرکردە کوردانەی نووسیویانە، بۆخۆیان نوسیویانە، یان کەسانیتر بۆیان نووسیون؟

ئەم گومانکردنە لەســەر بنەمایەکی بەدگومانانەوە دروستنەبووە و لە حاڵی حازریشــدا زۆرن ئەو کەســانەی لە بواری سیاســەتدا کار دەکەن و دەنووسن و نووسینەکانیان هی خۆیان نیە. بگرە زۆریشن ئەو کەسانەی پۆستیَ جیاوازیان هەیە و بەرهەمیان بەناوەوە بۆ بڵاو دەکرێتەوە و کەچی نە پێش وەرگرتنی ئەو پۆســتە نووســەر بوون و نەپاش جێهێشتنیشی وەک نووسەر دەمێننەوە. مێژووی سیاسیی خۆرهەڵات و دەرباری پاشا و میر و دەسەڵاتداران هیچکات خاڵیی نەبووە لە باش کاتب و میرزابنووس و تۆمارکەرانی ڕووداوەکان و ئەمانەش بەشی هەرەزۆریان دەستەندەخۆری پاشا و دەسەڵاتداران بوون. لەبەر ئەوە، هەرچەندە ئۆجالان ئێستا لە دەسەڵاتدا نیە، بەڵام هێزی تایبەت بەخۆی هەیە و دەکرێ مەزەندە و گومانی ئەوە بکرێ کە لە پشت نووســینەکانییەوە، کەسانیتریش هەبن. لەگەڵ ئەوەشدا کە تا چەندە ئەم گومانە ڕاست و هەڵەیە، من بۆخۆم هیچ گومانێکم لــەوەدا نییە کە ئۆجالان قورســاییەکی هزریی تایبەت بەخۆی هەیە و بەرهەمەکانی لە بواری سیاسەت و مێژووی شارستانییەتەکان و مێژووی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاســت، بەڵگەی ئەم قســەیەن. لە هەرکامێک لەو بەرهەمانەیدا دیدێکی وردی شرۆڤەکاری و ڕەخنەیی ئەوتۆ ئامادەیی هەیە، کە ناکرێت چاوی لێبپۆشــین. ئەو بەهۆی ئەم پرۆژانەیەوە، شــیکردنەوەیەکی ورد و قــووڵ بۆدۆخی ناوچەکە لە ئێستا و ڕابردوویدا دەکات و بەشێوەیەکی بنچینەیی وەڵامی زۆرێک لە پرســیارەکانی هەنووکە، لە ڕابردوویەکــی دوورەوە دەردەهێنێ و دیمەنێکــی پێکەوەگونجــاوی مێــژووی ناوچەکەت بۆ دەکێشــێ، کە ئاشــکرای دەکات ئەم مرۆڤە ئاســتێکی بەرزی لە تێگەیشــتن و شــیکردنەوە و ڕەخنــەکاری و مەنهەجیــی هەیە، کــە نابێت بەهۆی ئەو وێنە سیاســییەوە کە بۆی دروستبووە چێژی خوێندنەوەی ئەو

بەرهەمە فیکریانەی لەکیس خۆمان بدەین.
مـن چەپبـوون بـە داینەمـۆی هەمـوو بزوتنـەوە و کارەکتەرێکی گۆڕانخـواز و بەرگریکـەر دەزانم، بەڵام مـن چەپبوونی حیزبیانەی ئۆجالانم خۆشـناوێت و خۆشنەویستووە، هەستدەکەم چەپبوون لە ئەودا سەرچاوەی بەشێکی زۆری ئەو توندوتیژییە ڕیشەییە بووە، کە لە ئۆجالانی سەرەتا و پارتی کرێکاراندا هەبوو. هەروەها بنەمای هەرجـۆرە ھاندەرێکی تاکەکەسـی و بەکۆمەڵیی بۆ دروسـتکردنی ناسنامە، بەو تینە دەزانم کە لە ناسینی خود و نەتەوەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵام کاتێ نەتەوەخوازیی دەبێتە نەتەوەپەرستی و ئەمەش ڕێگا خۆشـدەکات، کـە ئێمە لە پێناوی خەبات بـۆ نەتەوەی خۆمان و شوناسـی خۆمان، ڕێگە بەخۆمان بدەین ناسـنامە و کارەکتەری نەتەوەکانی تر بشێوێنین، ئیتر من حەزم لە نەتەوەپەرستی نامێنێت. بەهەمان شـێوەش حەزم لە نەتەوەپەرسـتی و فۆرمێکی شۆڤێنیزم و هیـچ ڕەهەندێکی دیکەی خۆویسـتانە و خۆبەسـەنتەرکردنەکانی ئۆجـالان نییە، کە بۆی هەیـە لە لابەلای بیروڕا سـەرەتاییەکانی و قۆناغـی یەکەمـی نووسـینەکانییەوە، دەریانبهێنین. مەبەسـتم لەو نوسینانەیەتی کە پێش دەستگیرکردنەکەی نوسیونی.
ئەو بەشەشم لە بۆچوونەکانی ئۆجالانی حیزبی، لە کەسایەتی (ئاپۆ) خۆشـناوێت، کە دەتوانین بڵێین بۆچوونـی تووڕە و لوتبەرزانەن و بەهۆیانەوە ئۆجالان و حیزبەکەی کەوتنە ناو پێکدادان و شەڕ لەگەڵ لایەنە سیاسییە کوردستانییەکانی ترەوە. ئۆجالانَ یەکەم سەرکردەی کوردیش نییە کە باجی تورەیی و خۆبەگەورەزانیی خۆی بدات، ئێمە لەسـەرەتای سەدەی بیستەمدا یەکێ لە بزووتنەوە هەرە گرنگەکانی خۆمـان کردۆتـە قوربانیی تورەیـی و هەڵەشـەی ڕابەرەکەی و لە پاشانیشدا مێژوو بەجۆرێ ئەم هۆکاری تێکشکانەی بۆ شاردوینەتەوە

و بەپەراوێزی خستووە، کە وابزانین هەمیشە هۆکاری فەشەلەکانی ئێمە ئەوانیتر بوون، نەک خودی خۆمان و سەرکردەکانمان. هەڵەی سەرکردە و گفتی سەرکردە و درۆی سەرکردە، هێندەی گەورەیی و خەبات و سەرکردەیی و ڕەمزییەتەکەی گەورەن و نابێت چاویان لێبپۆشرێت، چونکە هەڵەی هەر سەرکردەیەک هەڵەیە بە کێش و قورسایی خۆی و جیاوازە لە هەڵە و درۆی مرۆڤێکی ئاسایی کە لە کۆمەڵگادا دەژی.

وێڕای ئەمانە، من ئۆجالانی ڕەخنەگرم خۆشدەوێت، ئۆجالانی دووەم و نووسەری کتێبە فیکرییەکان. بەتایبەتی کە بوێریی ئەوەی هەیە تیری ڕەخنە ئاراستەی خۆی بکات و خوێندنەوەیەکی واقیعیانە بۆ هەڵەکانی خۆی لە بۆچوون و کرداردا دەکات. ئۆجالان لە ڕەخنە لە خۆگرتندا، کە ئەمەیان نەریتێکی چەپیانەیە، نەک کوردیانە و خۆرهەلاتیانە، سەرمەشق و نمونەیەکی جوانی سیاسەتکارێکی کوردمان دەخاتە پێشچاو کە شایانی گوێلێگرتن و لێتێگەیشتن و گرنگیپێدانە. ئەو ڕەخنانەی ئۆجالان لە خودی خۆی و پارتی کرێکارانی دەگرێت، ڕەخنەی ڕواڵەتی و هاکەزایی نین تاکو بەهۆیانەوە نیگامان لەسەر ئەو بابەتانە بگوێزێتەوە، کە پێویستە بە جیدیی ڕەخنەیان لێبگیرێت. ئەو ڕەخنەی چاوبەستکردن ناگرێت، وەکئەوەی هەندێک لە سیاسییەکانی هەرێمی کوردستان دەیگرن، ڕەخنەی ئۆجالان لە بڕوابوونییەوە بە هێزیی ڕەخنەگرتن و توانای ڕەخنەگرتنەوە، هاتووە، نەک بەکارهێنانی دروشمی ڕەخنەگرتن بەبێ چوونە ناو گەمەی ڕەخنە و ئەنجامەکانی ڕەخنەگرتنەوە. بەڕاستیی ڕەخنەکانی ئەو ڕەخنەن لەو کەموکوڕییە هزری، ڕێکخراوەیی و ستراتیژیانەی کە تێیانکەوتووە. ڕەخنەن لە بۆچوونە داخراوەکانی و ڕەخنەن لە توندوتیژیی ڕێکخراوەیی و ئەو پشتگوێخستنانەی کە چەندین کوشتار

و پێشێلکارییان لێکەوتۆتەوە و پاشتریش زەمینەیان خۆشکرد تاکو لایەنگەلێک بتوانن لایەنگیریی لە ڕژێمی تورکیا بکەن تا بتوانێت بە ئاسانی پەکەکە و ئۆجالان وەک «تیرۆریست» ناوبەرێت.

ئۆجالانی نووسەر و دەستبەسەریشم خۆشدەوێ و لەوێشەوە بیروڕام لەسەر زیندان پۆزەتیڤانەیە کاتێ دەتوانێ ببێتە هۆکاری تەقینەوەی بیروڕاو توانای سیاسەتکارێک و گۆڕینی بۆ بیرمەندێکی نمونەیی. لێرەدا هاوشێوەییەک لە نێوان ئۆجالان و زۆرینەی ئەوانەی کە زیندان و ئەشکەوتەکانیان کردن بە شوێنی داهێنان. لەم خاڵەدا زۆرترین لێکچوونێک لە نێوان ئەنتۆنیۆ گرامشی و ئۆجالاندا دەبینم، کە هەردووکیان لە قوتابخانەی زیندانەوە، بوونە خاوەنی بەرهەمگەلێکی ئەوتۆ کە هزریی سیاسی هاوچەرخ ناتوانێت چاویان لێبپۆشێت.

ئۆجالان لەوێشەوە بۆمن جێگای ڕێز و ستاییشە کە دوایین قارەمانی سیاسییە کە ئیتر لە کۆمەڵگادا ناژی و هیچ لێکچوونێکی لەگەڵ کاراکتەرە سیاسییە کوردە هاوچەرخەکانماندا نیە. ئەو بەربەریەتی مۆدێرنی لە فۆرمە تورکییەکەیدا خستە ژێر تاقیکردنەوەیەکی جیدییەوە، دووڕوویی زۆرێک لە حکومەتەکانی دنیای، لە پێش هەموویانەوە ئەمەریکا، لە ئاست کێشەی کوردەکاندا ئاشکرا کرد و دۆستە ڕاستەقینەکانی ئەم گەلەی بەدەنگهێنان. ئێستاش بوونی ئەو لە زیندانا بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر داکۆکیکردنی نەتەوەی کورد لە کەرامەتی خۆی. بەمانایەک لە ماناکان، ئۆجالانَ لە بری پاراستنی کەرامەتی یەکبەیەکمان لە زیندانایە. نازانم ئەگەر ئەو ڕزگار ببێت، چ کاریگەرییەکی لەسەر دۆخی کورد لە جیهان و کوردستانی گەورەدا دەبێت، جاری وا هەیە بیردەکەمەوە: ئۆجالان لە زیندانا داهێنەر تر و جوانتر و کاریگەربەخشترە. من لەگەڵ مانەوەی نیم لەوێدا،

بەتایبەتی کە ماهییەتی زیندانبان شــەڕانییەت و شــۆڤێنییەتە، بەڵام دەشترســم ئەو لە ئازادیی و ســەربەخۆییدا، هەمان نائومێدیمان بۆ بهێنێ کە بە دەست زۆرینەی سەرکردە کوردە هاوچەرخەکانمانەوە تووشی بووین. هیچیان پیاوی ئومێد و داهاتوو نین. لەگەڵ ئەوەشدا نامەوێت ئەوەندە ساکاربین و ساڵەکانی کۆتایی حوکمیان بژمێرین، ئەگەرچــی ئەمانیش لەو دیو یاســای مێژووەوە نین. تەمەنیان درێژ بێــت و لەبیریان نەچێت کە هاوڕێ و هاوخوێن و هاوکێشــەیەکیان ئەوەتا لە بەندیخانەدا..

هەرچەندە ئەو مامۆستا گەورەیە بەردەوام لە کۆتایی نووسینەکانی و پێشەکی کتێبەکانیدا و لەگەڵ تۆمارکردنی ڕێکەوتی نوسینەکەی، شوێنەکەی دەباتەوە «قەڵادزێ»و وای دەخاتە مێشک و خەیاڵمانەوە، کە ئەو تەنیا لەو شارە پڕ لە جوانیی و قوربانییەدا بیر دەکاتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا هەموو کوردەکان بەهرەمەندن لە کارەکانی. بەم مانایەش ئەو هەرچەند دەیەوێت پابەندێتی خۆی بە ناوچەیەکی دیاریکراوەوە بسەلمێنێ، کەچی خزمەتێکی نەتەوەیی گەورە دەکات بە هاوزمانەکانی لە سەرانسەری جیهاندا. حەمید عەزیز پیاوێکە چۆتەوە سەر سرووشتی گوڵەباخ، گەر نەزانیت چۆن لێی نزیکدەبیتەوە و چۆن بۆنی بکەیت، دڕک بە دەستا ئەچێ و نائومێد دەبیت. ئەو دوایین نەوەی ئەو ڕۆشنبیرە گەورانەیە کە لە سولالەی بابانییەکانەوە بۆ ئێمە ماونەتەوە و بەم پیاوە پڕ لە وزە و چالاکەدا دیارە کە (نالی)ی شاعیر لە وەسفیدا بۆ (بابان) و

حکومەت و شارستانییەتیان بە هەڵەدا نەچووە. من هەرگیز قوتابیی نەبووم و لە پۆلەکانیدا دانەنیشتووم، ئەگەریش ئەو شانسەم هەبایە دڵنیام لە وانەکانیدا نمرەی دەرچوونم نەدەهێنا، ئەمەش لە تەمبەڵیمەوە نا، بەڵکو لەو چاوەڕوانییە زۆرانەی ئەو لە قوتابییەکانی هەیەتی و لە دڵسۆزییەوە بۆ فەلسەفە. خۆ ئەگەر هیچ مەرجێکی بۆ دانەنایت و لێتگەڕا بە ئارەزووی خۆت، بڵێی و بئاخڤی، بزانە کە هیچ چاوەڕوانییەکی لێت نییە.

بەڕاستیی ئەو خەڵکی کوێیە؟ دەزانم لە قەڵادزێ لە دایکبووە و سلێمانیانە پەروەردە بووە و لە بەغدا خوێندویەتی و بە ئەڵمانی بیر دەکاتەوە. ئەو پڕە لەو ناکۆکانەی بەردەوام پێکەوە دەژین و پێکەوە مشتومڕیانە، ئەو لەو تێکەڵەیە دەچێت، کە هیراکلیتۆسی فەیلەسووفی پێش سوکراتی بۆ سەلماندنی گۆڕانی بەردەوام باسی دەکات و لە ڕێگەیەوە فرەیی و هەمەچەشنەیی لە جیهاندا لەگەڵ یەکایەتیی بووندا ئاشت و هاوسەنگ دەکاتەوە. ئەو لە خۆشاو دەچێت، کاتێ کە تەنیا بۆ خۆیەتی و لە دۆخی نیشتندایە لە بنی دەفرێکدا. ئەو بۆخۆی شوناسێکە، یەکایەتی و کەسایەتییەکی دەگمەنە کاتێکیش تێکەڵی هەڵدەدەیت و دەیهەژێنی و دەیدوێنی، تێدەگەیت ئەم یەکایەتی و کەسایەتییە پێکهاتەیەکە لە چەندین ڕەهەند و ئەزموونی کەڵەکەبووی جیاواز، کە هەر یەکەیان تام و ڕەنگی خۆی هەیە. لە خواردندا بێ ئەندازە تەڕخۆر و بە سەلیقە، تەنانەت کاتێ بیەوێ باسی جۆرێک خواردنت بۆ بکات، کە ڕۆژگارێ (دایکی دانا) بۆی لێناوە، جگە لەوەی دایکی دانات خۆشدەوێت، ئاواش حەز دەکەیت دەمودەست بڕۆیت و ئەو خواردنە تاقیبکەیتەوە. لە جلوبەرگیشدا مرۆڤێکی پۆشتە و پەرداخ و پاکوتەمیز. کەم ڕۆژ هەیە ڕیشی نەتاشیبێ و بەدەگمەنیش بینیومە عەتری لەخۆی نەدابێت. بەڵام ئەو لە عەتردا هەستێکی

تایبەتـی هەیە، بەدوای مۆدیل و ناوبانـگ و گرانەکانیاندا ناگەڕێت، بەڵکو بەدوای بۆن و بەرامەی ڕەسـەندا عەوداڵە. ئەمە سرووشتیی ئەویشـە لـە ئافرەت و فەلسەفەشـدا، مـن ناوێرم باسـی یەکەمیان بکـەم، بـەلام دەزانم مۆدێلە فەلسـەفییەکان سـەرنجی ڕاناکێشـن، هێندەی ئەوەی وێسـتگە فەلسـەفییە ڕەگوڕیشـەدارە ڕەسـەنەکان ئەویـان سـەرقاڵکردووە. ڕۆژێک لە بەشـی فەلسـەفە ئاماژەی بۆ پۆسـتکارتێکی ژاک دێریدای فەیلەسـووفی فەرەنسیی کرد و گوتی: «کێ لەمە تێدەگات؟!». هەموو دامانە قاقای پێکەنین. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بۆ فەلسەفە دەژی و تەمەنێکی زۆری لەو بوارەدا سەرفکردووە، بەلام ئەگەر ئەم قسـەیە وەها تێبگەین، جگە لە فەلسـەفە هیچیتری نەکـردووە، بەهەڵـەدا چووین. جگـە لە دیوە تیۆرییەکـەی، جگە لە وردەکارییـەکان و گەڕانەوەی بۆ لایەنە بەشـەکییەکانی فەلسـەفە، یان بیروهزری فەیلەسووفەکان لە بچووکترین پێکهاتەیاندا، چ لەلای یۆنانـی و چ لـە ئەوروپایی و چ فەیلەسـووفانی مسـوڵمان، ئاواش لـە ژیانـی کردەکیدا وریـا و چاودێرکەر و وردەکارە. بە ناسـین و وردبوونـەوە و چاودێریکردنی مامۆسـتا حەمید عەزیز، دەزانیت و تێدەگەیت بۆچی خەڵکی شـاری (کینزبێـرگ)، کاتژمێرەکانی خۆیان لەسـەر کاتـی پیاسـەکانی (کانـت)ی فەیلەسـووفی ئەڵمانـی کۆک دەکردن. ئەمیش ڕۆحێکی کانتیانەی تێدایە، بەلام بڕوای بە ڕەهەندە شـاعیرانەکەی کانت نیە. ئێمە بە ئـەودا دەزانین کەی مووچە دێت، کەی پشـوو دەستپێدەکات، کەی پێویسـتە فۆڕمێ دەرسگوتارەکان پڕ بکەینەوە، کەی کەباب بخۆین، کەی بیر لە سـەرووپێ بکەینەوە، کـەی قوتابییەکان بەجێماندەهێڵـن و کەی بە کۆمەڵیی لێدەدەن و چ ڕۆژێکی هەینی دەکەوێتە پێش و پاش پشووەکانەوە.

دیوێکـی تـری ئـەم مامۆسـتایە وەفادارییەتـی بۆ ئەو کەسـانەی

ڕۆژگارێـک وشـەیەک و بیرۆکەیەکـی جوانیـان فێرکـردووە. ئەو بۆخۆی کاتێ باسـی فیکر و فەلسـەفە دەکات، ناڵێ بیرۆکەی جوان، بەڵکو دەڵێ: زانسـتی و ڕاست، کاتێ لە لایەنە زانستییەکەی هزرێک دڵنیـا بۆوە، ئەمجا باسـی جوانییەکەیشـی دەکات. ئەوانەی فێریان کـردووە لـە نەتەوەی جیـاوازن، هەر لە کوردەکانەوە تا مامۆسـتا عەرەبەکان و ئەڵمانییەکان. پاشان کتێبەکان و سەرچاوە ڕەسەنەکان ئەویان بە سـەدان بیرۆکـەی ورد پڕکردووە، بەجۆرێ دەتوانێت لە ماوەیەکی زۆر کورتدا گەشـتێکی لە پێشفەلسەفەوە، لەلای بووداوە بـۆ دۆڵی نیل و لەوێشـەوە بۆ لای فەیلەسـووفە یۆنانی و پاشـان فەیلەسـووفە مسووڵمانەکان لەگەڵ دەسـتپێبکەیت و بە فەلسەفەی مەسـیحاییدا بەرەو سـەدەکانی ناوەڕاست و فەلسـەفەی مۆدێرندا بیهێنێ بەبێ ئەوەی وشەیەکی هەڵە، یان گوزارەیەکی هەڵەی لە دەم بێتـە دەرەوە. ئەم پیاوە کورتەیەک و چڕبوونەوەیەکی فەلسـەفییە، کە دەبێت بزانیت چۆن قسـەی پێبدرکێنیت. ئەو لە کاتی قسەکردندا و لەناو ڕسـتە بەناویەکداچووەکانیدا، سەرچاوەی قسەکە و بۆنەی قسـەکە و گوتەزاکەشـت بۆ باس دەکات. وەکئەوە وایە کە هەمیشە حەمید عەزیزێکی بچکۆلە، پیاوێک کە ئێمە نایبینین و بۆی هەیە وەک فریشە لەسەر شانی ڕاستی بێت، بیری حەمید عەزیزی مامۆستامان دەخاتەوە کە هیچ نەپەڕێنێت و شتەکان بخاتەوە سەر عەردی ساخ. هەندێک کەس کە باش نایناسن، وا دەزانن ئەو هەندێ شت دووبارە دەکاتەوە، لەکاتێکدا ئەو دووبارەیان دەکاتەوە لەبەر ئەوەی دەزانێت بەرامبەر لێی تێنەگەیشتووە.

مـن دڵنیـام ئەگەر فارابـی و غەزالی، یان ئەریسـتۆتالیس و تۆمای ئەکوینـی، زیندوو ببنەوە، ناتوانن لەسـەر بیروڕاکانی خۆیان و ئەو شتانەی لە بەرهەمەکانیاندا باسیان کردوون، گرەوی قسە لە حەمید

عەزیـزی کورد ببەنـەوە. لەگەڵ ئەوەشـدا وەفادارییەکی مەزن لەم پیاوەدا هەیە. ئەو ڕۆژە کە مامۆستا ئەحمەد سالار لەبەشی فەلسەفە سەبارەت بە پەیوەندیی فەلسەفە و دراما قسەی دەکرد، مامۆستاکەی ئێمە لە سەرەتاوە تا کۆتایی دانیشت. ئەمە بەلای منەوە ڕووداوێکی دەگمـەن بـوو، چونکە بۆ کۆبوونەوەکانی بـەش، ئەو بە دەگمەن تا کۆتایی دادەنیشـێ. دوایی بۆم دەرکەوت مانەوەکەی لە سـیمیناری مامۆسـتا سالاردا جگە لە ناوەڕۆکی بابەتەکە، پەیوەندیشیی هەبوو بە هاوڕێیەتییەکی کۆنیانەوە لە بەغدا.

تەنانەت لەبەرامبەر ئەو کەسانەشدا کە غەدرێکیان لێکردبێت، ئەم هیچ قین و ڕقێکی لەدڵدا بۆ هەڵنەگرتوون. وەک بۆخۆی دەڵێت: «دەیەوێ شەوانە بخەوێت و ئەملاولا نەکات». وەفای گەورەی ئەم بۆ (دایکی دانا)یە. ئەو خانمەی من هێشـتا لە نزیکەوە بە دیداری شاد نەبووم، بەڵام ئیتر ناوی ئەو لە باسـە فەلسـەفییەکان جیا ناکرێتەوە. نەوەی ئێمە لە فەلسەفە دۆستان بەختەوەرین، کە مەزنترین مامۆستای ئەم بـوارە هەتا ئێسـتاش بەو پەڕی چالاکیی و بەو پەڕی پۆشـتەیی و بەوپەڕی بۆنخۆشـییەوە لەناوماندا دەژی. من ئیرەییم بەو قوتابیانە دێت، کە ئەم پیاوە بەخۆی و قسەخۆشـەکانییەوە، بەبێ کتێب خۆی دەکات بە پۆلەکانیاندا و وێڕای جیاوازیی تەمەن و ئەزموون، کەچی وەکئـەوان گەنجانـە دەدوێ و بیر دەکاتەوە. ئەگەر لەم سـەردەمی گرژیی و ڕەشبینییەدا، بەلای دیوارەکانی بەشی فەلسەفەدا تێپەڕیت و گوێـت لـە تریقە و هـاڕەی پێکەنینی گەنجەکان بـوو، ئەوە بزانە حەمیـد عەزیز وانەیـان پێدەڵێتەوە. ئەو منداڵـە قەڵادزێیەی کە هیچ شتێک، خۆشویستنی دانایی و مرۆڤدۆستیی بیر نەبردۆتەوە.



## محەمەد عارف:

کوردێکی فریشتەیی.

فریشتەیەکی کورد..

لە دوورەوە زۆر شـتم لەبارەیەوە دەزانی و بیسـتبوو. بەڵام تاکو بۆخـۆم لە نزیکەوە نەمناسـیی، نەمزانـی ئەم کەسـایەتییە مەزنە چ خەزنەیەکـی گەورەی هزر و جوانی و ژیاندۆسـتییە. پێشـتر لە تابلۆکانییەوە ناسیبووم، ڕەنگ و جووڵەی فڵچەکەیم لە هەر شوێنێ دەناسییەوە. دەمزانیی ئەو کەسەی لە پشت ئەو کارانەوەیە، مرۆڤێکە بچووک ناکرێتەوە بۆسەر بوونە جەستەییەکەی و قەبارەی لەشی. مرۆڤێکە بە ڕۆحیی ئاوەوە جوانی دەپرژێنێ بەسـەر ئەو ڕووبەرە بێڕەنگانەدا کە لە وڵاتی ئێمە و لەلای مرۆڤی ئێمە ژمارەیان زۆرن. ئەو، هەروەکچۆن لە بەکارهێنانی فڵچەدا نەرم وَ ئارام بوو، ئاواش لە ژیانی تایبەتیدا شـیرین و بەڕێز بوو. ئەو هەروەکچۆن خۆی لە قسـەی ڕەق و زمانی زبر بـەدوور دەگرت، ئاواش لـە تابلۆکانیدا خۆی لە بەکارهێنانی هێڵی ڕەق و ڕاست و تیژ و چەمانەوەی لەپڕ بـەدوور دەگـرت. زۆر بەدەگمەن تالۆیەکیم بینیوە هێڵی ڕاسـتەیی

و گۆشـــەی تیژی تێدابێـت. هێڵەکانی ئەو، بەیادهێنــەرەوەی مانگ و چـاو و بـرۆی ئافـرەت و چەمانەوەی دەف و باوەشـی گەرمی خۆشەویستین. تەنانەت شمشێر و مەتاڵ و ڕمبی دەستی سەربازانی ناو تابلۆکانیشـی، ئەوەندە بە ڕۆحێکی شـاعیرانەوە کێشـراون، وا دەزانیـت لە لۆکە و پەموو دروسـتکراون و هیچ ترسـێکت لە دڵدا دروسـتناکەن. درەختەکانی و دیـواری باڵاخانە و لادیواری کوچە و گەڕەک و تەنانەت منارەکانیشـی هەرچەنـدە بڵند و ڕێکن، بەڵام تیـژ و ڕەق نیـن و وەک ئـەوە وایە لە دۆخی سـەما و خۆبادان و لەرینەوەدا بن.

دەکرێ مرۆڤ بپرسـێ: لەسـەردەمێکی تـەواو توندوتیژ و ڕقاوی و سـارد و سـڕدا، لـە زەمانەیەکی ئەوەنـدە پێوانەیی و شـیاوی دابەشـبوونی ژمارەیی و لەناو ئەم فـەزا دیجیتاڵییەدا، کە محەمەد عـارف کۆتایـی تەمەنی خـۆی تێدا بردەسـەر، چۆنە ئـەم هەموو گەرمـی و چەمانـەوە و نەرمییە، ئەم هەمـوو ئارامیی و خاویی و لەسـەرخۆییە بۆتە سرووشـتی تابلۆکانی ئەم مرۆڤـە و ئایا ئەوە خـودی سرووشـتە لە بەرهەمەکانـی ئەم هونەرمەند و مامۆسـتا مەزنـەدا بەوجـۆرە ڕەنگیداوەتەوە، یان ئەوە سرووشـتی ناخەکی هونەرمەندەکەیە، سیمای خۆی بەوجۆرە لە ناوەڕۆکی بابەتەکانیدا بەرجەستە کردووە؟

یەکەمجار لە خواردنگەی سوڵتان، لەسەر شەقامی شۆڕشی شاری هەولێـر چاوم پێی کـەوت. دووجاری تریش لـەوەدوا بە خزمەتی گەیشـتمەوە و ئیتـر منێک، کە ئەوەنـدە یاخییانـە دەڕوانمە ژیان، نەمدەتوانـی خـۆم بەرزەفتـە بکـەم و دانەیەمەوە بـۆ ماچکردنی دەستەکانی، کە ئەو نەیدەهێشت. کاتێ ئێمە چووین دابنیشین، ئەوان نانیان دەخوارد. من تەنیا ئەوم ناسییەوە، کە دەستێ جلکی کوردی

و کوڵەباڵێکی لەبەردا بوو. وابزانم نزیکی یەکێ لە جەژنەکان بوو. جاری دووەم لە سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەدین، ماوەیەکی دوور و درێژ لە خزمەتیدا مامەوە. لەسەر قەنەفەیەکی چەرمین لەکەنار یەکترەوە دووبەدوو دانیشتین و لەسەر دوو شت قسەی بۆ کردم. هونەری مینیاتۆر و چۆنێتی لەخەو هەستانی بەیانیانی و جۆرێ لە عیبادەتی ڕۆحیی، کە بە ئەزموونی چەندساڵەی پێی گەیشتبوو. ئەو کاتێ قسەی بۆ دەکردم سەراپا قەند و شیرین و بۆنی خۆش بوو. پێستی دەستەکانی نەرم و جوان و ئەمووستیلەیەک لە پەنجەدا. کراسێکی نەرم و بە گیرفانی لای چەپی چاکەتەکەشییەوە، لۆچی دەستەسرێکی سپی هاتبووە دەر. ڕیشێکی پاک و تاشراو، بەجۆرێ کە بریسکەیەک بە سەراپای سیمایەوە دیار بوو، کە بەباشی نەتدەزانی ئەوە بریقەی ڕووخسارییەتی، یان ڕەنگدانەوەی ئەو بزە شاراوەیەی بوو کە لە ژێر چەمانەوەی مووی سمێڵەکانییەوە، سەرچاوەی دەگرت؟

ئایا ئەوە چ هۆکارێک بوو کە ئەویان پاڵنابوو بۆ کارکردن لەسەر مینیاتۆر و وردەکارییەکانی ئەو هونەرە؟ ئەو بۆخۆی لەو دانیشتنەدا ئەمەی دەگێڕایەوە بۆ ڕەسەنایەتییەک، کە ئەم هونەرە لە مێژووی هونەری گەلانی خۆرهەڵاتدا هەیەتی. وردەکاری و جێکردنەوەی جۆرەها فۆرم لەیەک پانتایی بچووکدا، پاشانیش دۆزینەوەی هێما و هێڵە مینیاتۆرییەکان لە هونەری بیناسازیی و خانوو و دەرگا و سندووق و باوەڵی کۆنی کوردیدا، لە ڕستنی دەسترازە و چنینی گۆرەوی و ڕازاندنەوەی بێشکە و مەشکەی کۆنی کوردەواریدا. بۆ ئەو، هەموو ئەمانە بەشێک بوون لە ڕەسەنایەتی و بەشێک بوون لە هونەری دروستکردنی ناسنامە. ڕەنگە ئەم پیاوە بە درێژایی هەموو تەمەنیشی هەر ئەمە پڕۆژەی

سـەرەکیی بووبێـت و لە هەوڵی پێکەوەنانـەوەی ئەو ڕەمز و هێما و پارچانـەدا بووبێت، کە بە دۆزینەوە و پێکەوەنانەوەیان سـەر لە نوێ دەتوانرێ وێنەیەکی کاملتری بوونی مرۆڤی کورد، بەرجەستە بکرێتـەوە. بۆیـە هونەری ئەم پیاوە، هەرگیـز هونەری ڕەنگدانەوە نەبووە، بەڵکو هونەری بیناکردنەوە و سەر لەنوێ خەڵقکردنەوەیە. هونەرێکە ئەو بەشـە هەڕەشـەلێکراوانەی ژیانی مرۆڤی کوردمان بیـر دەخاتەوە، کە تەقینەوەی سـاتەوەختە مێژووییـەکان پەرتیان کـردن و ئیتر لێمـان گومبوون. هێمنی، میهرەبانی و لەسـەرخۆیی و هێڵـە چەماوەییەکان. هونەری مینیاتۆر بۆ ئەو، چڕبوونەوەیەکی ڕۆحیی مرۆڤ بوو هاوشـان بە تیژبینی و هەدادان لە ئاسـت شتە بەشـەکییەکاندا بۆ ئەوەی لەم ڕێگایەوە بتوانێ ئەو شتەی بەچاوی گشـتبینی ئاسـایی ئێمە، نابینرێ، ئەو لە تابلۆیەکدا بیوەسـتێنێ تا تووشی سەسووڕمانمان بکات.

محەمەد عارف پیاوێک بوو بە ڕۆحێکی جوانیناسـیی فراوانەوە، کە زۆر نزیک بوو لە زەوقی هونەرمەندانی ڕێنیسـانس و جوانیناسیی واقیعیانەوە، تەماشای دنیای دەکرد، بەڵام من هەمیشە نزیکایەتییەکم لە نێوان ئەم پیاوە و فەیلەسـووفانی پێش سـوکراتدا بینیوە، کاتێ لەسـەفەری گەڕانیاندا بەدوای بنەما و سەرچاوەی یەکەمی بووندا، توانایەکی لە ڕادەبەدەریان بۆ شـییکردنەوەی شـتە بەشەکییەکان دەخسـتەکار. محەمەد عارفی مامۆستاش لە هونەرەکەیدا بە دوای (ئاریخـە) و بنەمای بوونـی کوردیانەماندا دەگەڕا و ئەمەیشـی لە سرووشت و فیگەر و هێڵە سرووشتییەکاندا دۆزیبۆوە. سرووشت بـۆ ئـەو، جیهانێکـی نمونەیی بوو، کـە بۆ ئەوەی مـرۆڤ ڕۆحیی خـۆی لە هەر جـۆرە ژیانێکی ناسرووشـتیانە ڕزگار بکات، دەبوو سـەر لەنـوێ نمونـە باڵاکەی لـە سرووشـت خۆیـدا بدۆزێتەوە.

لێرەوە هونەری میناتۆر و هەوڵە مینیاتۆرییەکانی دوایی تەمەنی مامۆستاکەمان، جۆرێکی دیکەی سەرنجڕاکێشان بوون بۆ تێبینیکردنی پانتاییە بچووکەکان تا لەوێدا بزانین چ حەقیقەتێکی مەزن خۆیان شاردۆتەوە.
ئەم مرۆڤە مەزنە بەیانیان زوو لە خەو هەڵدەستا، بگرە ئەو لە رووی رۆحییەوە هەرگیز نەدەخەوت و هەمیشە بێدار بوو، خەوی ئەو خەوی جەستەیی بووە نەک رۆحیی. ئەو لە جۆرە سرووتێکی عیبادەتکردن دەدوا کە بەیانیان بە ئەنجامی دەگەیاند و لەگەڵ خوای خۆیدا دەچووە خەڵوەتەوە تاکو بە سووکبوون و شەففافبوون و پاکژبوونەوە بگات. من لە نێوان ئەم پاکژبوونەوەیە و هێڵە مینیاتۆرییە سادەکانیشدا، کە لە کاتی قسەکانماندا چەند نمونەیەکی پیشاندام، جۆرێ لە نزیکایەتی و لێکچوونم دەبینی و هەردووکیانم بە سرووشتی رۆحیانەی مرۆڤێک دەهاتنە پێشچاو، کە ئیتر خۆی لە هەرجۆرە جەنجاڵی و گرێ و گۆڵێکی ژیانی مادیی رزگار کردووە.
ئەو بە فریشتەیەک دەچوو، کە لە بەهەشت ئاوارە بووبێ. ئایا کاتێ فریشتەکان ئاوارەدەبن و هەلی گەڕانەوەیان بۆ دەرەخسێ، بۆکوێ دەچنەوە؟ ئەویش چۆتەوە ئەوێ، بەڵام دڵنیام ئێستا ئەو بە رەنگ و هێمنی و نوورە ئینسانییەکەیەوە، بەهەشتی جوانتر کردووە. خودایە، چەندە کەمن نمونەی ئەو فریشتانەی ئێمە تەمەنێک لەگەڵیان دەژین و وادەزانین لە خۆمان دەچن، سوپاس پەروەردگارا، کە یەکێ لەوانەت لە شێوەی کوردێکی هونەرمەندا بە ئێمە ناساند..



# ژنێک لەسەردەمی جێندەرکوژیدا

## هێرۆخان

هێرۆخان، لــە ڕووی پەروەردەییەوە، پەروەردەی یەکێ لە بنەماڵە نیشــتیمانپەروەرەکانی ســلێمانییە، کــە هەتــا ئێســتاش مێــژووی هاوچەرخ داوەرییەکی بێلایەنانەی لەبــارەوە نەکردوون. بنەماڵەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، بگرە بوونەتە یەکێ لە قوربانییەکانی ئەو مێژووەی کە پتر مێژوویێکی حیزبیانەیە، تاکو مێژووی ڕۆشنبیریی و کۆمەڵایەتی و فیکری. لەبەر ئەوە کۆی ئەو داوەرییانەی لە دەرەوەی مێــژووی ململانێ حیزبییــەکان و بەتایبەتی مێــژووی یەکێتییەوە، لەســەر ئەم بنەماڵەیە و کەســایەتییەکانی کراون، دووژمنکارانە و تاکڕەهەندانە بوون، لەکاتێکدا کۆی ئەو داوەری و بەرگریکردنانەش کــە لەناو مێژووی یەکێتــی و حیزبایەتییەوە لــە بنەماڵەی ناوبراو کــراون، یەکلابینانــە و بەرتەســکانە بــوون. ڕەنگــە هەڵەیەکیــش لەلایــەن خــودی ئــەم بنەماڵەیەشــەوە ڕوییدابێت کــە لەماوەیەکی زەمەنیدا ڕێگەیان داوە بچنە پەراوێز و ســێبەری مێژووی لایەن و

کەسانیترەوە و توانای بەشداریی و دەستپێشخەری و بەردەوامیی خۆیان بەستبێتەوە بەو پەیوەندییە سیاسیانەوە کە پاشتر بۆیان دروستبوون، نەک ئەوانەی بۆخۆیان داهێنەر و دەستپێشخەریان بوون.

ئەو، میراتگرێکی ڕاستەقینەی باوکییەتی، چ لە ڕووی سیاسییەوە و چ لە ڕووی کەلتووریی و ڕۆشنبیرییەوە و یەکێکیشە لەو کەسانەی زۆرترین غەدری مەعنەوی لێکراوە، نەک لەبەر ئەوەی کچی ئیبراهیم ئەحمەدە، بەڵکو لەبەر ئەوەی هاوسەری مام جەلال تاڵەبانییە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کەسایەتیە نە بەهۆی ئەویانەوە خۆی سەلماندووە و نە لە سایەی ئەمیشیاندا چۆتە پەراوێزەوە. ئەو دەیەوێت و سوورە لەسەر ئەوەی تایبەتمەندیی خۆی هەبێت و لەپاڵ چالاکییە سیاسییەکانیشیدا، سوودی گشتیی هەبێت. بەڵام ئیتر ئەو دوو پیاوەی ناو ژیانی هێرۆخان بەجۆرێ سێبەریان بەسەردا کردووە، کە هەم دۆستانی و هەم نەیارەکانی لەبەرخاتری و لەداخیی ئەوان، دژایەتی و دۆستایەتی ئەمیش بکەن.

من لە بەشێکی ئەم گیرۆدەبوونە میراتییەی خانمێک دەگەم، کە ڕەوا نییە، لەبەر پەیوەندییە نەسەبی و سەببییەکانی بخرێتە بەر شاڵاوە سایکۆلۆژییە ساتەوەختی و گرژەکانی کۆمەڵگاکەیەوە. بەڵام لەوەش تێدەگەم، کە ئەم کۆمەڵگایە کۆمەڵگایەکی پیاوسالارە و هەمیشە لە کۆمەڵگایەکی پیاوسالاریشدا قوربانیی یەکەم ئەو مێیینانەن، کە بە کار و چالاکییان، هەڕەشە بۆ سەر هەیبەت و لەخۆتێگەیشتنی نێرانەی پیاوەکان دروستدەکەن. من دڵنیام، هێرۆخان لەمجۆرە کۆمەڵگایەدا هەرگیز لە بواریی سیاسی و حیزبایەتییشدا بەشداریی نەکردبایە و بەردەوامیش وەک فریشتەیەکی ئەودیو پەردە بمابایەتەوە و لەبری ئەوەش جوانترین شیعر و جوانترین تابلۆی بۆ کێشابایەنایە، هەر

ڕووبەڕووی ئەو هەموو تەشـەر و غەدرە مەعنەویانە دەبۆوە، کە ڕووبەڕوویان بۆتەوە. لەبەر ئەوە، ئەو چەندە قوربانیی پیشـەکەی و پەیوەندییەکانییەتـی، ئەوەندەش قوربانیـی ڕەگەزەکەی خۆیەتی و ئەمـەش ئەو شـتەیە کە من هانـدەدات وەک کەسـایەتییەک، کە کۆمەڵگای نێرسـالار هێرشی دەکاتە سەر، قسـەی لەبارەوە بکەم. هەروەکچۆن پێویستە ئەمە هەڵوێستی گشت مرۆڤێکی ئازادیخوازیش بێت، کاتێک دەبینێت دەسەڵاتەکانی وەک ئایینسالاری و نێرسالاری و حیزبسـالاری، لەماوەی قەیرانە سـایکۆلۆژییەکانی خۆیاندا، بەم یان بەو شـێوەیە خاڵی هاوبەشیان بریتیبووە لە پەلاماردانی مێیینە و کچان و ژنانی بە توانای وڵاتەکەمان.

هێرۆخـان، لـە مـاوەی پچڕپچـڕی تەمەنـی پرۆفێشـناڵیی خۆیدا، کـە ئاوارەبـوون و ماڵبەکۆڵـی و کتێبخانەسـووتانی تێکەوتـووە، ئاخیرییەکـەی خوێندنی دەروونزانیی لە زانکۆی موستەنسـرییەی بەغـدا، تـەواو کردووە و بـە دامەزرێنـەری پربینەرتریـن کەناڵی تەلەفزیۆنـی کوردسـات و ڕێکخراوێکی گـەورەی منداڵپارێزیی لە هەرێمی کوردسـتان دادەنرێت. ئەمە جگە لـە هەوڵە بەرچاوەکانی لەبواری دەستگیرۆییکردنی هونەرمەندان و نووسەران لە ڕێگەی هەر یەک لە گالەریی و مۆزەخانەی (زامووا) و (فۆندی ئیبراهیم ئەحمەد) ـەوە. ئەمانەش هەمووی دوای سـاڵانێکی زۆری پێشـمەرگایەتی و ژیانێک، کە پتر لە ژیانیی پیاوانەوە نزیکبووە، تاکو ژیانیی خانمێک، کە غەریزەی دایکایەتی و سۆز لە پێش هەمووشتێکی ترەوەن.

ئەو زۆر جار بە «شـەیتانی سیاسـەتی کوردی» و «ئاگری بنکا» و «دەسـتی شـاراوەی ناو یەکێتی نیشـتیمانی کوردستان» ناوی براوە. کۆی ئەم قسانە پتر زادەی فەنتازیای نێرینەیی و باڵادەستیی کۆمەڵـگای کوردیـن، تاکـو ئەنجامـی توێژینـەوە و سـەلماندن.

ڕاستییەکەی ئەوەیە، ئەو چالاکە، یاریدەدەر و دەستگیرۆییکەر و خاوەن بیروڕای خۆیەتی، ئەمانەش بەسن بۆ ئەوەی خەیاڵیی دەستەجەمعی و غەزەبیی کۆمەڵایەتی لە دژی خۆی بخاتە کار، تەنانەت لەناو حیزبەکەی خۆیشیدا. هەروەکچۆن هەمان خەیاڵ و غەزەب، لە ساتەوەختێکی تردا (لەیلافەریقی) و لە یەکێکیتردا (کەژاڵ ئەحمەد) و بۆ سبەینێش کاتێ هەر فەنتازیا شەڕانییە، مێژووی ژنانی ئەم وڵاتە دەنووسێتەوە، هەر یەک لە (بەهێی شێخ مارف، ئەنجومی عەبدوڵا زوهدی و ئایشەگووڵ و باجی تەنکە و دایکی ئامێز و ڕووناک ڕەووف و گەزیزە و بەدیعە دارتاش) و دەیان ناویتریش دەخاتە بەر هێرش و سوکایەتی ناڕەوا. پێدەچێت ئێمە بەرەو شوێنێک بڕۆین کە ئەم خەیاڵ و زەینییەتە جیهادییە بتوانێ سەرلەنوێ نیگا شەڕانییەکەی ئاراستەی کەسایەتییەکانی، وەک (مەستوورەی کوردستانی، خانزاد و عادیلەخانم و حەپسەخانی نەقیب و شەهید ئەختەر) بکاتەوە و بەهەمان شێوەی کە لەمڕۆکەدا کۆی بوونیی مێینەیی لە کۆمەڵگای ئێمەدا دەداتە بەر خەنجەر، ئاواش ڕۆحی ئەوان هەلا هەلا بکات.

هیچ شتێک هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد لەو شاڵاو و هێرشانە ناپارێزێت، تە نانەت ئەو کاتەش کە هەمان خەیاڵ و فەنتازیا و زمان نازناوی: «خانمی یەکەمیی عێراق»ی لێدەنێت و ئەم ناولێنانەش وەک قەفەسێکی ئاسنینی تر بەکار دەهێنێت بۆ ئەوەی مێینەیی ئەو، ژنێتی ئەو و شوناسی ئەو ملکەچی فەنتازیاکانی خۆی بکات. ئەم ناولێنانە بۆ ئەو، کە لە هەرێمێکی پڕ لە چەوسانەوەی مێنەییی و زەمینەیەکی کۆمەڵایەتی لێوانلێو لە ئافرەتکوشتن و خۆسوتاندندا دەژی، لە بەدڕەفتارییەکی دیکەی نێرسالاری و نیشاندانی دەمامکێکی دیکەی ئافرەتسڕینەوە، هیچیتر نیە. پێویستە ئەو بۆخۆیشی یەکەم

کـەس بێت نەهێڵێت بەم تـۆڕ و قولاپانە بکرێ بـە داوەوە. چونکە لـە هـەر کۆمەڵگایەکی پیاوسـالاردا کاتێ پیاو بۆخـۆی «یەکەم» بـوو، ئیتر کەسـیتر ناتوانێ و نابێتە کەسـی یەکـەم، بەڵکو هەموو ئەوانیتر دەبنە دووەم و سـێیەم سـەدهەم و دەخرێنە پەراوێزەوە. وەلێ ئیتر زەحمەتیشـە نـەوەی نوێ بتوانن کەسـایەتی هێرۆخان و نمونەکانیتـری وەک ئەو، کە لە چەندین لاوە پەیوەسـتبوون بەم تۆڕانـەوە، وەکخۆیان و لە پێگەی مێینەیی خۆیاندا بناسـن. لەگەڵ ئەوەشـدا حەقیقەت لەوەدایـە هۆکار و هانـدەری چالاکییەکانی لە شـوێنێکی تردا ببینینەوە، کە زۆرجار مێژوو و شوێنکاتەکان ڕێگە بەدەرکەوتنی نادەن.

بنەوانی کەسایەتی ئەو نە سیاسەت و نە حیزبایەتی و نە پەیوەندییە نەسـەبی و سەبەبییەکانی ناو ئەو مێژووەن کە بۆی دروستکراوە، بەڵکـو ئەو لە مێینەیی خۆیەوە، لـە ڕەگەزە برینداره‌کەی خۆیەوە، سرووشـی کار و چالاکییەکانـی و بیرۆکەکانـی وەردەگـرێ و هەرچـی دەیـکات و کردوویەتـی، هەنگاوێکـە بۆ خـۆ پچڕاندن و بەرجەسـتەکردنەوەی کەسـایەتی خـۆی وەک ژنەکوردێـک، کـە میراتگـری کـۆی ئـەو چەوسـانەوە و غەدرانەیە لە مێـژووی ناو سەردەسـتەیی نێرینەیـی و ئایینسـالاریدا، لێیان کـراوە و نەرێتە کوردایەتیەکان بەسـەر ئافرەتانەوە کردویانەتە ماڵ و میرات. ئەمە ئەو خاڵە هاوبەشـەیە کە پێویستە هێرۆخان لەبەرامبەر هاوڕەگەز و هاوپێگەکانی لێوەی تەماشای پەیوەندییەکانی خۆی بکات و ئەمە هەمان پنتیشـە کە پێویستە هاوڕەگەز و هاوپێگەکانی ئەو کەسایەتی ئەوی لێوە ببینن.

ئـەو چیدی کچـە باریکەلە ڕوومەت شووشـەییەکەی سـەردەمی پێشـمەرگایەتی نیە.قـەدە باریکەکـەی هەر پاراسـتووە، بەڵام قژە

ڕەشــەکانی ئیتر ســپیی دەچنەوە و بەمەشــدا ئەو دایکە کوردێکی ئاساییە. وەلێ من هەمیشە وەک پێشمەرگەیەک بینیومە کە بەردەوامە لــە خەباتکردن بۆ منداڵانــی وڵات و هاوڕەگەزەکانی. ئەمەش بەبێ ئەوەی بۆ ســاتێکیش دەســتیی لــە ســنگفراوانی و خاکەڕاییەکەی هەڵگرتبــێ. هەر کاتیش بویتە میوانی، بەدەســتی خۆی چایەکت بۆ تێنــەکات دڵی ئــاو ناخواتەوە، هاوکات بەمەش لەو دیو قژە ماش و برنجییە تێکئاڵاوەکانییەوە، چاوە وردیلەکانی قووڵ قووڵ تەماشات دەکەن و کاتێ دەشــیەوەێ قســەیەک بکات، وشــەکان وەکخۆیان بەیانــدەکات، وەکخۆیان بەبێ هیچ گرێ و گۆڵ و تەکەلووفێک. ئەو بــە گفت و زمــان و ڕەفتاریدا، هیچ لە کچی بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند ناچێــت، کــە پێشــئەوەی بزانین کێیە، نازمان بەســەردا بفرۆشــێ. لەســەردەمی ئێستاشــدا کە ژنان و مەســەلەکەیان لەبەر هێرشــی بەردەوامی شەڕانییەتدایە و جێندەرکوژیی بۆتە دروشمی جەهالەت، بوونــی ئەو و هاونموونە چالاکەکانی لە کۆمەڵگای کوردیدا جۆرێ لە دڵنیابوونمان پێدەبەخشێت.

٢٠٠٩



## خانمێک لەسەر شانۆیە:

## «ست بەدیعە»

ناکرێ باسی شانۆی کوردی و هەشتاکان و بەعس بکەین و بەدیعە دارتاشمان بیر بچێت. ئەو دەمەی لە هەشتاکاندا لە پەیمانگای هونەرەجوانەکانی سلێمانی، لە بەشی شانۆ، وەرگیرام، بۆ یەکەمینجار مامۆستا بەدیعە دارتاش و هەندێ مامۆستای دیکەی ناو هونەر و شانۆی کوردیم لە نزیکەوە ناسین، کە ساڵەها بوو خەونم بە ناسینیانەوە دەبینی: ئەحمەد سالار، بەدیعەدارتاش و حیکمەت هیندی، کە وەک تیمێک و دەستەیەکی پتەو پێکەوە کاریان دەکرد و خۆشەویستی هونەریان لە لای قوتابییەکان دەچاند.

دارتاش خانمێک بوو تووڕەیی لێنەدەهات، بەڵام لە سەرەتاوە زۆریش جیدی بوو، بە ئەندازەیەک کە من تۆزێک لێی دەترسام. من هەمیشە لە ژنان دەترسم، ترسێک کە بڕوام پێدەهێنێت ئەوان لە سەرچاوەیەکی پیرۆزەوە پەیدابوون و هەر لەبەر ئەمەش گەورەترین ڕازێک لە بووندا بۆ من، ڕازیی مێینەییە. لەگەڵ ئەوەشدا دارتاش

خانــم، تا بڵێی هــاوکاری قوتابییەکان بوو بۆ ئــەو کار و پڕۆژە و چالاکییانەی دەیانویست ئەنجامی بدەن، بەبێ ئەوەی بیر لە ئەنجامی بڕیــارەکان بکاتــەوە، ئەگەرچــی جــاری وایش هەبوو بــۆ خاتری قوتابییەکان بڕیــاری وایان دەدا، کە دەبوو خۆیان باجەکەی بدەن. بۆ نمونە کاتێ ئێمە ویســتمان بڵاوکراوەیــەک بە ناوی (ئەزموون) ـەوە بڵاو بکەینەوە، مامۆستا بەدیعە یەکەمین پشتگیر و هاوکارمان بوو. وابزانم لە کڕینی ئەو مێزە شووشەییەشدا کە بڵاوکراوەکەمان لەسەر پەخشــدەکردەوە، هەر هاوکاریی کردین، بەبێ ئەوەی حەز بکات ناوی بهێنین. ســەردەمەکە سەردەمێکی مەترسیدار بوو: هەر کەس لە ئاســت خۆیەوە، گومانی هەبــوو لەوەی ڕۆژێک لە ماڵەوە تــا دەگاتــە پەیمانگا، نەگیرێت، یــان بە پێچەوانەوە: لــە پەیمانگاوە بەرەو ماڵ نەکەوێتە کەمینەوە. کەمینەکانی ئەوسا زۆر و بەزەبر و نادیار بوون. پەیمانگاش شوێنێکی دیار و ناسراو بوو، دواجار کار گەیشــتە ئەوەی لەلایەن ڕژێمەوە کۆنترۆڵێکی زۆر دەخرایە ســەر پەیمانگا. ترس و مەترسیی گیران ڕۆژ بەڕۆژ زیادیی دەکرد. بەڵام مامۆستاکان و لە ناویشیاندا مامۆستا دارتاش نەیدەویست ورەمان بەر بدەین و بەردەوام هانیدەداین.

لــە کەســایەتی ئەودا گەشــبینییەکی بێســنوور هەبوو. گەشــبینیی مامۆســتایەک، کە جیهانی لەلا شیرینتر دەکردی، بەتایبەتی کاتێ لە چاوی ئەودا خۆت وەک مرۆڤێکی گەورەتر لەوەی هەبووی، دەبینی. هەندێ مامۆستا هەن، چاوشکێنت دەکەن، هەندێکیان چاوترسێن و هەندێکیشیان چاوت دەکەنەوە. بەڵام بە دەگمەن تیایاندایە بتبینێ و لە چاویدا هەڵتگرێ و هەڵتسەنگێنێ و وات لێبکات بەخۆتدا بچیتەوە. دارتاش لەو مامۆستایانە بوو، هەمیشە وای پیشان دەدا جیدییەتێکی تیایە بەرەو تورەیی و دروستکردنی سنوور. ئەمە پیشەی زۆرینەی

ئافرەتانی کـوردە، کاتێ یادوەریی مێیینەییان ئـەو ئازارانەیان بیر دەخاتەوە، کە لە ئەزموونیاندا بەدەست نێرینەوە کێشاویانە. ئەو لە ئێمە تووڕە نەبوو، بەڵام زیاتر لەگەڵ کچەکان دڵی خۆی دەکردەوە، تـا کوڕەکان. ئێمە ئەومان زۆر خۆشدەویسـت، بەڵام دەبوو باجی نێرینەیی خۆمان بدەین. لەگەڵ ئەوەشـدا بەردەوام وای لێدەکردین بەخۆماندا بچینەوە و هەستبکەین کە ئێمە هەین و کە هەیین، کێین و کە کوردین، کوردبوون لە بواری هونەردا مانای چی دەگەیەنێ؟

گەشبینییەکەی ئەو جاری وا هەبوو، جاڕسکەر بوو: تەنانەت بیستم یەک دوو دەقی شانۆیی کە بۆ بەشداریکردن لە ڤیستیڤاڵی ساڵانەی پەیمانگادا، خرابوونە بەردەم لیژنە، لەسـەر قسـەی دارتاش و بەو هۆیـەوە کە ئەو شـانۆییانە زۆر ڕەشـبینانەن، ڕەتکرابوونەوە. من ئەو کاتە لەم ڕەتکردنەوەیە تێنەدەگەیشـتم. ئێمەی گەنج بەو جۆرە تێدەگەیشتین، کە سەردەمەکە کاتێ بۆخۆی ئەوەندە ڕەش و تۆقێنەر بوو، بۆ دەبێت جێگەی دەقی شـانۆیی ڕەشبینانە نەبێتەوە، ئەمەش بێئـاگا لەوەی لە نێوان ئێمە و مامۆسـتاکانماندا ململانێی نەوەکان و تێگەیشـتنی کەلتووریی جیاواز هەیە. لەوەش بترازێ، نەمدەزانی کە بیسـت سـاڵم لە ئەزموون و تەمەن پێویسـتە بۆ تێگەیشتن لەو ڕۆحـە دایکانەیـەی دارتاش، کـە وەک کچە کوردێک نەیدەویسـت ئێمـە، لانیکـەم لە بواری هونەردا، بە ئاوازیی سـەردەمەکە سـەما بکەین و لە هەوڵی ئەوەدا بوو، بوێریی ژنانە و کوردانەی خۆی لە بەرپەرچدانەوەیەکی پێچەوانەدا بخاتە ڕوو، تا ئاشکرای بکات ئێمە ناترسین و تەسلیم نابین.

ئەو بەبێ ئەوەی، ئاشکرای بکات، یان بیکاتە درووشم و ئیدیعایەی گـەورە، هەمـان کاری دەکـرد، کـە دایکانی هاوسـەردەم و ژنانی هاوتەمەنی دەیانکرد: بەخشـین و بەخشـین و بەخشین و دووبارە

بەخشینەوە. ئەمە بەشداریی ئافرەتانی ئێمەیە لە دەیەی هەشتاکاندا: ئەوان لە پشت هەموو دەستکەوت و سەرکەوتنێکی کوردەوە بوون و لە پێشــی پێشــەوەی قوربانی و بریندارەکانیــش بوون. دارتاش، کــە ئێمە ئەوســا پێماندەگوت: «ســت بەدیعــە»، چاوێکی هەبوو و هــەزار گوێ: ئاگای لە هەموومان بــوو، بەڵام بەردەوامیش جۆرێ لــە ورە و نەترســیی و لە هەمان کاتیشــدا خۆپارێزیــی ئامادەبیان هەبــوو. ئــەو لــە ڕووی هەڵســوکەوتی کۆمەڵایەتــی و پۆشــینی جلوبەرگەوە، موحافیزەکار بوو. دەمانبیســت کە کچەکان هاندەدات بۆ سەرپۆشــکردن، دواجار کە لێشــمان دەپرسی: ئایا بەڕاست ئەو ئەمــکارە دەکات؟ لەوەڵامدا پێیدەگوتین بــۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن و دووچاری کێشــە نەبن و لە هێرشــی دەســتدرێژان بەدوور بن، چونکــە کچانی هونەرمەنــد و قوتابیانی پەیمانگا، کەســانی دیارن. ئێمــە ئەم وەڵامەمان زۆر بەدڵ نەبــوو، ئەگەرچی ڕۆژانە زریکەی ئەو کچانەشــمان دەبیســت کە بە زۆر و بە قژڕاکێشــان، ســواری موسەللەحە و زیلە عەسکەرییەکان دەکران.

کە بڵاوکــراوەی (ئەزموون)یان پێداخســتین، پەنامــان بۆ بردەوە، ئەمجارەیــان بە دەم قســە و بــە نیگا قووڵەکەی، کــە نەماندەزانیی تووڕەییــە، یان جیدییەت، یاخوود هەردووکیان، قەناعەتی پێکردین، کە باشترە ماوەیەک چاوەڕێ بین، تاکو بارودۆخەکە باشتر دەبێت، کــە نەبوو. تــا ئەوە بوو مامۆســتا حیکمەت هێندیی بەســەرا گیرا. دارتاش کاتێ قسەی بۆ دەکردین تاکو ئاگامان لە خۆمان بێت، خۆی بڕوای بەوە نەبوو کە بارودۆخەکە باشــتر دەبێت، بەڵام دیسانەوە، دڵی بڕوایی نەدەهات، ســاردمان بکاتەوە، چونکە خۆشیدەویستین و نەیدەویســت هەموو ئەو شــتانە بزانین، کە ئەوان دەیانزانی. ئەو زۆری دەزانی، زۆرتر لەوەی ئێمە پێویســتمان بوو بیزانین، چونکە

ئەگەر ئەوەندەی ئەومان هەست بە مەترسیی سەردەمەکە برکردایە و بمانزانیایـە، دەترسـاین. لە بەعس زۆر دەترسـاین، چونکە بۆی هەبـوو بەعس هەموو شـتێک بێـت، بۆی هەبـوو پیاوێکی لاکۆڵان بێت کە بانگی دەکردی و دەیبردی و نەدەهاتییەوە، بۆیشـی هەبوو مامۆسـتایەک بێت لەسـەر سـەرت و لەناو پۆلدا وانەت پێبڵێتەوە. ڕۆژێک لە وانەی عەرەبیدا، مامۆستا پرسیارێکی کرد، پەیوەندیی بە حکومەتی عێراقییەوە هەبوو کە چۆن ئۆتۆنۆمی داوەتە کوردستان، مـن لە ژێر لێومەوە، شـتێکم گوت کە لەوە دەچوو بەباشـی گوێی لێبووبێت. یەکسەر هاتە ڕیزەکەوە و گوتی: ئەو کەلبی بنی کەلبەی گوتی حوکمی زاتیی کارتۆنی کێ بوو. مەرگ هاتە ناو ڕۆحمانەوە، کەس قسەی نەکرد، هیچ وشەیەک نەیدەتوانی ئەو بێدەنگییە ترسناکە بشـکێنێ. دواجار کە زەنگیی پشـوو لێیدا، هەموومان هەناسەیەکی قووڵمان دایەوە و من یەکدوو چەپۆکم بۆهات!

دوانیوەڕۆیەک هاوڕێیەکم پێی گوتم، کە سەردانی ست بەدیعە بکەم لە ماڵەوەیـان. هەرگیز چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد، لەگەڵ ئەوەشـدا چـووم و لـەدەرگام دا. کە دەرگایـان لێکردمەوە، ئـەو بۆخۆی لە ژوورەوە منـی بینـی و هاتـە دەر. تەنیا بە یەک ڕسـتە پێی گوتم: «باشترە نەیەیتەوە بۆ پەیمانگا» و «کەسیش لێت نەبیستێ کە من ئەمەم پێڕاگەیاندویت».

دوای پازدە سـاڵ بینیمەوە، دیسـانەوە لەبەردەم هۆڵی شانۆیەکدا، دیسانەوە خۆمم لە چاوەکانیدا بینییەوە، پێمگوت:

«هەتـا مردن، قەرزداری ئەو قسـەیەتم». بە پێکەنینەوە فەرمووی: «ئەگەر وانەبواییە ئێستا تۆمان نەدەبوو».



پیاوە ڕەنگاوڕەنگەکە پێری
لە ماڵی ئێمە بوو:

**ڕێبوار سەعید**

پێـرێ لــە ماڵی ئێمە بــوو، لە پیرزیــن و دوێنێ پێکــەوە چوین بۆ بەشــیی فەلســـەفە. هەر جارێ دێتەوە کوردستان سەردانی شەولێر دەکات، شــارێک، کە زۆر لەمێژە ئامێزی بۆ تابلۆکانی کردۆتەوە و سەرسامە بە شوێنەوارە دێرینەکانی و لەگەڵ زۆرێک لەو کەسانەی کە بیست و پێنج ساڵ بەر لەئێستا میوانی پیشانگاکەی بوون، هەتا ئێســتاش دۆستایەتیان ماوە. ئەو بە ڕۆح و سەبریی ئەییووبەوە لە جیهانێکی پڕ لە خێرایی و توندوتیژدا دێت و دەچێت، بەڵام هەمیشە پاسەوانی ڕەنگە لە ڕەشەبا و پەرژینە بۆ فلّچە لە بەردەم تێژڕەویی لافاودا. هەرگیز ماندوویی ناناسێت، ئەو لە ژیانی خۆیدا منداڵییەکی ســەخت و پڕ لە بەرپرســیارێتی و ژیانێکی پڕ لە وێستگەی کۆچ و ســەفەر ژیاوە، بەڵام هەمیشە دڵسۆز، هەمیشە هاوکار و بەردەوام داهێنەرانــە ماوەتــەوە. لــە منداڵیــدا جگە لــەوەی شــوێنی زۆری بینیون، بەردەوام شـــەیدا و خولیای ئەدەبیات و شــاعیران بووە و

لەبارەیانەوە بابەتی نووسیون و بۆخۆیشی شاعیرێکی بێئەندازە ناسک و زمانپاراوە. ئەگەر ماوەی سەقزی لەگەڵدا حساب بکەم، بیست و سێ بۆ بیست و پێنج ساڵە دەیناسم. یەکەمجار لە ساڵی ١٩٩٦ لە لەندەن یەکترمان لە نزیکەوە بینی و هەر لەوێ ئاشنای کردم بە مۆزەخانەکان و گالێرییە بەناوبانگەکان. ئەو بۆخۆی بە تەنیا قوتابخانەیەک و ئەرشیفخانەیەک و سەفارەتێکە. کەم چالاکیی هونەری و بۆنەی نەتەوەیی کوردەکانی ئەورووپا هەیە، تیایدا بە شێوەیەک لە شێوەکان بەشداریی نەکردبێت. من زۆرجار پێمگوتووە: ئەگەر بۆ هەر یەکی لەو کارانەی کردوتن پارەیەکت وەربگرتایە، ئێستا ملیۆنێر دەبوویت، بەڵام ئەو دووژمنێکی هەیە لەناو زمانیا کە ناوی «بەسەر چاوە!». ڕێبوار مرۆڤێکە «نەئگوتن» نازانێت و هەرشتێکیش بکات بەوجۆرە دەیکات وەکئەوەی کە بیەوێت، بەربەستێک لە لم لەبەردەم لافاوی ڕووبارێکدا درووست بکات: ئەوەندە وردەکاریی تیا دەکات و دەیپەستێتەوە، کە ئیتر ئاوی ڕووبارەکە ناچار دەکات ڕێڕەوی خۆی بگۆڕێت. ئەو نایەوێت ببێتە هۆی هەرەس و تێکشکانی بەردەم ئەو کارانەی بەشدارییان تێدا دەکات، یان بۆخۆی ئەنجامیان دەدات، بۆیە بەجۆرێ ئەنجامیان دەدات، کە ئەنجامدانیان بەشێوەی تر مەحاڵ بێت. ئەم مرۆڤە لە بەخشیندا ئەوەندە گەورەیە بە سوڵتانێکی دەستبڵاو دەچێت، بەڵام ئەو وەکو سوڵتانەکان لەو باج و سەرانەیەی بە زۆر لە خەڵکی سەندووە، نابەخشێت، بەڵکو لەوە دەیبەخشێت کە بۆخۆی هەیەتی. ئەو زۆری هەیە: لە بیرۆکە و چالاکی و ڕەنگ و کەسەرستە و هەدادان و هەڵکردن و گونجان و خۆگونجاندن. من لەم هونەرمەندە گەورەیەوە فێربووم کە سەرکەوتنی پرۆژەیەک لەوەدا نییە بیرۆکەکەی بە نهێنی لای خۆت بهێڵیتەوە و بۆ کەسیی باسنەکەیت،

بەڵکو لە چۆنێتی ئەنجامدانیدایە. ئەو هیچ ناشــارێتەوە و هەمیشــە لەبارەی کارەکانییەوە بە ڕاشکاوی و سادەیی و سنگفراوانی و بێ ڕۆشــنبیرانەکردنی ئــەوەی بیریی لێدەکاتــەوە و دەیەوێ ئەنجامی بدات، باسی دەکات. لە هونەری گوێڕادێرانیشدا مرۆڤێکی دەگمەنە، بەڵام هاوکات بەوەی قسەی بۆ دەکەیت، ئەو بیر دەکاتەوە. ڕێبوار سەعید نیشتیمانپەروەرێکی مرۆڤویســتە. ئەم کەسایەتیەی ڕێگەی پێداوە، چەندین کەسایەتی و هونەرمەندیی جیهانی و لۆکاڵی لەسەر دەســتی ئەم هونەر و کێشــەی کورد بناســن، ئەو پێشــمەرگەیەک بوو لە چیاکانەوە دەســتی بــە خەباتکردن کرد، بــەڵام دوایئەوەی لە کیمیاییباران ڕزگاریی بوو، هونەری خەباتکردنی گواســتەوە بۆ پانتاییەکی فراوانتری جیهان.

بە پێ ڕۆیشــتن، نەخەوتن و بەرگەگرتن و گواســتنەوەی قســە بۆ ئاســتی کــردار، لە خەســڵەتە هــەرە دیارەکانی ئەم مامۆســتایەن. ئەو لە خەســڵەتە گەڕۆکییەکەیدا لە بۆدلێــر دەچێت، بەڵام ئاوێنەی ڕێبوار ڕەنگ و یادوەرییە. ڕێبوار ســەعید هیچ شتێکی لەدەرەوەی یادوەرییەوە نیە، یان ڕاســترە بگوترێ هەر شتێکی کە دەیخوڵقێنێ پەیوەندییەکیشــی بــە یادوەرییــەوە هەیە. بەهێزبوونــی ڕەهەند و بنەمــای یادوەریــی پەیوەندییەکــی ڕاســتەوخۆی بــە گەڕۆکــی و پیاســەکانییەوە هەیــە. مرۆڤی گــەڕۆک، ورد دەبێتــەوە و دیققەت دەدات و لە ئاســتی ورد و بەشــەکیدا داتا و زانیاریی کۆ دەکاتەوە. ئەمانــەش زەخیرەیەکی باش بۆ یادوەریی ئەم هونەرمەندە دەخەن و وادەکەن پرۆژەکانی پڕ بن لە ئاماژەی جۆربەجۆر بۆ پەیوەندیی نێــوان مرۆڤــی بێــدار و دەوروبەرەکــەی. زۆر بەکەمــی فیگەرێک یــان ڕووخســارێک، لەبەرهەمەکانی ڕێبوار ســەعیدی هونەرمەندا دەبینیــت، کــە خــەوی لێکەوتبێت، یان لــە دۆخی ناهووشــیاری و

بێهۆشییدا بێت. ڕێبوار لە کارەکانیدا و بەهۆی ئەو دیدە ئیستاتیکییە مرۆڤویستییەی کە هەڵگریەتی، هەمیشە مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی زیندوو وێنا دەکات، کە لە پەیوەندییەکی نزیک و هاوکاتدایە بە واقیع و دەوروبەرییەوە.

ڕێبوار سەعید بە ئاراستەیەکی زۆر تایبەتدا کاریکردووە: ئەو هەمیشە جۆرێ لە سیمبوولیزم لە کارەکانیدا ئامادەیی هەبووە، بەڵام هەمیشەش ئەم سێمبوولیزمە مەیلێکی ئەبستراکتیانەی لە خۆیدا شاردۆتەوە. هێڵەکانی ئەو دەکرێ لە یەک کاتدا هەم سێمبوول بن بۆ شتێک و هەم ئەبستراکتیزەکردنی بیرۆکە و دیمەن و دیاردەیەک. لە پشت هەموو سێمبوول و ئەبستراکتیزەکردنێکەوە، ڕۆحێکی سۆفیانە و عەشقێکی عاریفانە ئامادەیی هەیە. ئەگەرچی ئەو گەنجترە لەوەی بیخەینە داوی سۆفیزم و عیرفانەوە، بەڵام بەبێ ئەوەی چاوێکمان لە عیرفان و تەسەووف بێت، تێگەیشتن لە هونەری ڕێبوار ئاسان نییە. خەت و هێڵ و بازنە و نیوەبازنە و ئەتمۆسفێری نێو بەشێکی زۆری کارەکانی ئەم هونەرمەندە بەیادهێنەرەوەی نیگای شەوبێداران و مورتازە هیندی و ڕامانە بوودایییەکانن بۆ ناخی خۆیان و بۆ ئاسمان. سووربوونی ئەم لەسەر ئەنجامدانی کارێک بەوپەڕی وردبینیی و هەستەوەرییەوە، میدیتاشێۆنی بوودایییەکانمان بیر دەخاتەوە، کاتێ دەیانەوێ بگەنەوە بە ڕاستەقینە.

ڕێبوار سەعید لە هونەری پەیماندانیشدا لە لوتکەدایە و پەیمانەکانی بەبەردەوامی دەباتە سەر. ئەمەش لەسەردەمێکدا، کە چ خێراییەکەیی و چ بێوەفاییەکەی وای لە زۆربە کردووە کە بە ئاسانی پەیمان ببەستن و بە ئاسانییش پەیمان بشکێنن. ئەو دواجار بە مەسحێک دەچێت، کە گووڵ بۆ ماسییەکان ڕۆدەکات.

پیری لە ماڵمان بوو، ئێســتا هەموومــان بیریی دەکەین، نامانەوێت، هەرگیز وەکو ئەمجارەی دوایی بێتەوە نیشــتیمان، بەڵام ئیتر ئێستا ئەو لە هەموومان باشتر دەزانێت، کاتێ داییک کۆچی دوایی دەکات، بۆ هونەرمەند یەک نیشــتیمان دەمێنێتەوە: هونەر. ئەو گەڕایەوە بۆ ناو هونەر، بۆ شوێنێ دوور دوور تر لە توندوتیژی و ڕق.



## چۆنە تا ئێستا ماویت؟

# عەبدوڵای حەسەنزادە:

کاتێ لەم زەمەنی تۆپباران و گرتن و سێدارە و تاوانانەی کۆماریی ئیسلامیی ئێراندا، خۆم ئامادە دەکرد بۆ نوسینی پۆرترێتێک لەسەر هاوڕێ و برا کوردەکانی ڕۆژهەڵاتم، لە نێوان دوو ناودا تێدامام، کە ئاخۆ چۆنە ئەوان بەپێی ناوەکانیان لە ڕوانگەی ئەو ئایینەوە کە لە ئێراندا حکومدارە، دوو مرۆڤی یاخیین و ناوەکەیان نەبۆتە قەنەرێک بۆ کەسایەتییان، ئایا ئەمە بە دیموکراسییەتی ئایینی لێکبدەینەوە، یان بە خیانەتی ئەوان لە ناوی خۆیان؟ ئەو دوو ناوەش بریتین لە: عەبدوڵای حەسەنزادە و عەبدوڵای موهتەدی، کە وێڕای ئاگاداریم لە ناکۆکییەکانی جارانی نێوان هەردوو ئەو حیزبەی ئەوان کاری تێدا دەکەن و ناکۆکیی سالانی دوایی نێوخۆیی هەردوو حیزب خۆیان، هێشتا ئەوان بە دوو کەسایەتی تێکۆشەر و مکووڕ نەسەر داواکاریی نەتەوەیی کوردەکانی خۆرهەلات، دەزانم، کە مانەوەیان لە هەرێمی کوردستان هەمیشە دڵنیاییەکی گەرمیان بە من و

نــەوەی من بەخشــیوە تا دڵنیابیــن کە مرۆڤی خەباتــکار و بەهای ماف، لەم زەمەنی ســۆپەرمارکێت و مەسرەفگەراییەدا، هێشتا لێرە جێگەی دەبێتەوە. هەڵبەت تێدامانەکەم، لەبەر ئەوە نەبوو کە دوودڵ بــووم لەســەر کامیان بنووســم، چونکە ژمارەی ئەو کەســایەتییە کوردانەی خۆرهەڵاتی وڵات، زۆرترن لەوەی تەنیا بە یادکردنەوەی دوانیــان پێمانوابێت، ئەرکی خۆمان لە ئاســتیاندا جێبەجێ کردووە. ئەگەر دوودڵییەکیشم لەوبارەوە هەبووبێ، زیاتر هی ئەوە بووە کە کامیان پێشــئەوەی تریان بخەم، ئەگەرچی لە ڕووی جۆرایەتییەوە، مــن ڕێــزی چوونیەکم بۆ خەباتــی هەردووکیان هەیــە و لە دڵەوە پێموایە، ئەمجۆرە کەسایەتیانە هەڵکەوتەی مێژوویەکن، کە هاوکات بە گەورەبوونی من، ئەوانیش جێدەســتی خۆیــان لە ڕووداوەکانی ناوچەکەدا بەجێهێشــتووە. لەگەڵ تێگەیشتنی زیاتریشم بۆ مێژووی ئەو تەمەنەی بە شەخسیی تیا ژیاوم، بۆم دەرکەوتووە بەبێ ناوی ئــەو کەســایەتیانە وێناکردنی ئەو مێژووەش بڕێکــی زۆر لەمانای خۆی لەدەستدەدات.

دواجار پاڵپشت بە یادەوەرییە دوورەکانی منداڵیم، بڕیارمدا سەرەتا لەســەر مامۆســتا عەبدوڵای حەســەنزادە، پیاوێک کە لە هەوەڵێڕا لــە ڕێگــەی وەرگێڕانەکانییــەوە ناســیم، دەســت پێبکــەم. هەڵبەت پێویستە ئەوەش بەیاد بهێنمەوە، کە شۆڕش و خەباتی گەلی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردســتاندا، زنجیرە ناوێکی ئەوەندە درەخشــان و نەمــری پێبەخشــیوین، کە جگە لــە هەڵبژاردن لــە نێوانیاندا هیچی دیکەمان لەدەســت نایەت. نازانم حەسەنزادە خوێندن و پێگەیشتنی زانســتی و ڕۆشــنبیریی لە کوێی وڵاتدا بەئەنجام گەیاندووە، بەڵام هەمیشــە لە زمانی ئەودا ڕەگوڕیشــە ڕەسەن و دانسقەکانی زمانی کوردیم بینیوە. حەســەنزادە، پتر لەوەی سیاسییەکی پیشەیی بێت،

سیاسییەکی پراکتیکیە و باروودۆخ و هەلومەرجێک بەسەریدا سەپاند کە سیاسەت بکاتە چارەنووسیی خۆی، لەکاتێکدا ئەگەر ئەو هەلومەرجە جەبریانە نەبوونایە، ئاسایی بوو حەسەنزادە توانایی ئەدەبی و زمانی خۆی بکردایەتە ئەو چارەنووسە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو زمانزانێکە نزیک لە ڕۆحی زمان و زیندوویی ئەبەدیانەی زمانەوە. ئەو لەنەوەی ئەو کەسایەتییە کوردانەیە، کە سەنگەرێکی هەرە گرنگیی بۆ گرتووین، کە لانیکەم، لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا و بەدرێژایی سەدەی بیستەم، لە مەترسیی بەردەم شالاوی دوژمناندا بووە. دڵنیام خۆشەویستیی و گرنگیپێدانی حەسەنزادە بە زمان، جگە لەوەی هەستیارییەکی قووڵیی لە پشتەوەیە، ئاواش لە گرنگیدانی ئەو بە شوناسەوە، هاتووە. شوناسێک، کە سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی منداڵی و یەکەمین یادوەرییەکانی ئەو بە خاکەوە. ناکرێ تۆ لە گوندێکی نزیکی شارۆچکەی سەردەشت گەورە بووبیت، کیلەبەردینە و مووشێنت کردبێ و بانت بە باگردێن گێڕابێت و قووڕ و کات بۆ دیوار تێکەڵ کردبێ و بێڵنەت کردبێ و بە وەروەران بانت ماڵی بێ و لە بەهاراندا کانییت خاوێنکردبێتەوە و زەویکێلان و تۆوچاندنت دیبێ و جۆماڵت کردبێ و دیاریی و پریاسکەت بۆ کچان لە بنبەردان دانابێ و گوێت لە زیرەک و ماملێی نەمر گرتبێ، خاک سەنجی ڕانەکێشابێت و قوڕاویی نەبووبێت و تەپوتۆز لە شان و ملت نەنیشتبێ و قامکت نەقڵیشابن و چەوسانەوە و هەژاری و کوردبوونت لە ئاستە هەرە هەرە خاکەڕاییەکەیدا ئەزموون کردبێ و نەبووبیتە عەبدوڵای حەسەنزادە. ئەو نە لە ناچارییەوە، بەڵکو بە پێویستیی و لە ڕەوەندێکی مێژووییدا بۆتە ئەو مرۆڤەی کە تێکۆشان بکاتە ستایلی ژیانی خۆی. حەسەنزادە لەو ماوە زۆرەی خەباتی خۆیدا، کە بۆ ئەو دەبێت جێگەی سەربەرزی

بێـت، کە زۆرینـەی جاران بـە هەڵبـژاردن ئەرکی پێسـپێردراوە، دەستی لە چەند شتێک هەڵنەگرتووە و بەردەوام لە کەنار تێکۆشانە سیاسـی و ڕێکخراوەییەکانیدا، پەیوەندیی خۆی بەو خەسـڵەتانەوە پاراستووە:

یەکـەم: پەیوەندییەکی فراوانی بە نووسـەران و ڕۆشـنبیرانەوە و کرانەوەی بێسـنووری لەگەڵیاندا. ئەگەرچی زۆرێک لە بیروڕاکانی ئـەو بۆ هەندێک لە ڕۆشـنبیران جێگەی باس و قسـەن، بەڵام ئەو یەکێکە لەو سیاسییە دەگمەنانەی کە هەمیشە پەیوەندیی خۆی لەگەڵ ئـەم توێژەدا ڕاگرتووە و پێموایە هەم سـوودی بەخشـیوە و هەم سوودیشی وەرگرتووە. ئەم خەسـڵەتەی حەسەنزادە، جگە لەوەی دەگمەن و جێگەی ستایشە، ئاواش ئەو لە زۆرینەی سیاسییە کوردە هاوچەرخەکانی جیا دەکاتەوە، کە یان شـەڕێکی ئاشـکرایان لەگەڵ ڕۆشنبیران ڕاگەیاندووە، یان پێیانوایە سیاسەت دەبێت بەدوور بێت لە ڕۆشـنبیریی. حەسەنزادە، ئەگەر لە ئاسـتی بەرهەمیشدا نەبێت، ئەوە لە ئاسـتی شـێوەی ژیان و کردەکیدا سیاسییەکی ڕۆشنبیر و لەگەڵێک بواردا خاوەن هزرینی تایبەت بە خۆیەتی.

دووەم: پەیوەندییی بەردەوامی ئەو بە ئەدەبیاتەوە: حەسـەنزادە لە چل ساڵی ڕابردوودا یەکێکە لەو کەسایەتیانەی کە لە ئەدەبیات دابڕ نەبووە و هەمیشـە لەسـەرەتاتکێکرندا بووە تا پێمان بڵێت ئەویش لەوێیە، لەو شـوێنەدا کە مرۆڤ پێویستیی بە گرتنی پەیوەندییەکی ئەڵتەرناتیڤ لەگەڵ ژیان و مرۆڤەکانی تر، هەیە. سەلیقەی ئەدەبیی حەسـەنزادە بەو بەرهەمانەشـییەوە دیارە کە زانستیی و سیاسین. ئـەو بە گشـتیی بەرخوردێکـی ئەدەبیانەی لەگەڵ بـوون و ژیاندا هەیـە و هەموو شـتێک بە فیلتـەری زمانێکی ئەدەبیـدا، کە خاڵیی نیـە لە وشـەئارایی و جوانی، تێدەپەڕێنێت. ئـەو بە پیاوێک دەچێت

کــە تەشــتێکی پڕ لە وشــەی ئەدەبیی لە بەردەمــی خۆیدا دانابێ و هەرشــتێکی بێتە بەردەســتی، سەرەتا لەو تەشــتەی هەڵدەکێشێ و دەیخووسێنێ.

ســێیەم: ئەو مرۆڤێکی سیاســییە بــەڵام پەیوەندییەکی تایبەتیشــی لەگــەڵ نەزیلە و قســەی نەســتەق و نوکتەگێڕانــەوەش هەیە. زۆر نیــن ئــەو کەســانەی کە لــە ژیانــی سیاســیی خۆیانــدا نوکتەیان بیرنەچووبێتــەوە، ئەو لە دەگمەنەکانیانە و ئەمەش ســەرمایەیەکی ڕەمزیی بۆ دروستکردووە. من بۆخۆم کاتێ بیر لە نوکتە و سیاسەت دەکەمەوە، ئاوای دەبینم: نوکتە ژانر و جۆرێکی دەربڕینی بێوەفایە، ئەگەر نەیکەیت، دەتکات! یان ئەوەتا سیاســەت و سیاسییکار دەبنە بابــەت و ناوەڕۆکی نوکتەکان و خەڵک پێیان پێدەکەنێ، یان ئەوەتا سیاســیکار بەهۆی نوکتەکانەوە تەمەنی خــۆی لە ژیانێکدا کە ئیتر بەسەر چووە، درێژ دەکاتەوە. سەرانی کۆماری ئیسلامی لە جۆری یەکەمن و مامۆســتا حەســەنزادە لە جۆری ئەمەی دواییانە. ئەو لە میانەی ژیانی خۆیدا پانتاییەکی بۆ پێکەنین و شادبوون نەهێشتباوە، لەمێــژ بوو لە سیاســەت و لە ژیانیشــدا بیر دەچۆوە. لە ســەدەی بیســتەم و ئەم سەدەیەشدا، کۆماری ئیسلامیی لە هەموو قۆلێکەوە تۆپێکی بە کوردبوونی حەسەنزادە و هاوزمانییەکانەوە ناوە و هیچ شوێنێک نەماوە لە ژیانی کوردییدا بۆمبارانی نەکات و لە سێدارەی نــەدات. کەچی ئەو کوردە سەرســەختانەی ڕۆژهــەڵات بە هەموو شــتێک پێدەکەنن و نوکتەی لەســەر دروســتدەکەن. من پێشــنیار دەکەم کۆماری ئیسلامی کۆمیتەیەکی تایبەت بۆ بنەبڕکردنی نوکتە پێکبێنێ، تا کەســانی وەک حەســەنزادە، کە خەباتی پێشمەرگایەتی و تێکۆشــان لەناوی نەبردن، بە تۆمەتــی نوکتەکردن ڕاپێچی دادگا بکات.

هەمیشە بە حەسەنزادە و هاوخەباتەکانیدا بیرمدەکەویتەوە، ڕێگای تێکۆشـان چەنـدە دوور و درێـژە. خودایـە مـرۆڤ دەبێت چەندە پشـوودرێژ و مانـدوو نەناس بێت، تا بەرگـەی ژیانێک بگرێت، کە ناچارە بژی و بەری ڕەنجی بۆ ژیانێک بێت، کە ئیتر بۆخۆی نەماوە و کەسـانیتر لێی بەهرەمەند دەبـن. من، وێڕای ئاواتی تەمەندرێژی بۆیان، نازانم هاوڕێ و تێکۆشەرانی کورد لە ڕۆژهەلات، لە تەمەنی خۆیانـدا بـەری ڕەنجی خۆیـان لێدەکەنەوە، یان جێـی دەهێڵن بۆ نەوەکانی پاشـەڕۆژ. بەڵام دوو ڕاسـتیی دەزانم: یەکـەم ئەوەیانە خەباتی ئەوان هەمیشە ڕێگرێک بووە کە نەهێڵێت کوردەکانی ئەوێ لەوە زیاتر بێڕێزی و دەستدرێژییان بکرێتە سەر، کە کراوە. دووەم: ئازادیی ئێمە هەرگیز مانای پڕاوپڕی خۆی وەرناگرێ هەتا ئەوانیش ئـازاد نەبن و ئەوەش کە ئێمە بۆیـان دەکەین، زۆر کەمترە لەوەی کە پێویسـتە بۆیان بکرێت. سڵاو لە تێکۆشانتان، ئەی کەسانێک کە پەتی سێدارە هەرگیز لە ملتان جوێ نەبۆتەوە.



# تارماییەک بەڕێوەیە: کچێ لە کوردستانەوە

## لەیلا فەریقی

دەنگــی ئەو بەلای منــەوە لە دەنگی سەرلەشــکرێکی بوێر دەچێت، کــە لــە دوورەوە هــاوار دەکات: گوێــم لێگرن: واهاتــم بە خۆم و ڕەگــەز و دەنگ و جەســتە و ئیرۆتیــکای کچێنییمــەوە. وا هاتم و ڕادەماڵم ترســێک، کە ســەدەهایە بێدەنگی کردووم و ڕەگەزێک کە داگیریکــردووم و پیاوێک کە خنکاندوومی. ئەو لە دوورەوە دێت و ئاگر لە پووش بەردەدا و بەفر دەتوێنێتەوە و تیمساحە تەمبەڵەکانی ناو زۆنگاوەکانی مێژوو بێدار دەکاتەوە و دەیانەوێ لەو قوڵاییەوە کەڵبەیان لە تیتۆڵی کراســەکەی گیر کەن و بە لرفێک هەڵیلووشــن. بەڵام ئەو قوربانییەکی هێندەئاســان و نێچیرێکی ئەوەندە لاواز نییە تا ئەوەندە نزم بفڕێ کە بتوانرێ لە لوتکەی قەڵا و نووکی منارەکان و بەیتوونــەی تەلارەکانــەوە دایکێشــنە خوارەوە. ئــەو هات و بەو وشە و ئاوازانەی ترسێکی زۆری خستە ناخی ئەو پاشا بێتاجانەی وڵاتــەوە، کە یاســایان قەدەخەیە و وشــەیان خەنجــەرە و نیگایان

شــەڕانی و نەوســن. ئەو هات و هیچ لەشکرێکی پێنە بوو، تەنیا بە دەنگییەوە هات و بۆ هەمیشە لەناو ئەم تەلاوەی حیکمەتە درۆیانەدا دایکوتا و دڵی نەوەی نوێ و گەنجانی وڵاتی داگیرکرد. ئەو پڕ بوو لە هەڕەشــەی ئەو هەســتە قووڵە ژنانەییانەی بــە درێژایی مێژوو داگیــر و چەپێنــراون. ئەو بــەو هاتنەی بایی ســەدەیەک لە گریان، پڕیکردین لــە گۆرانی. ئەو هیچیی پێنەبوو لە دەنگ زیاتر، دەنگیش وەک فەرووغزاد گوتبووی: «تەنیا شتێکە دەمێنێتەوە».
ئەو هەموو جوانی و شــکۆی خانمە کوردێکی تێدایە: ئەم وێنەیەی کــە تیایــدا دەســتێکی خســتۆتە ســەر ڕانــی و شــانی داداوەتــە ســەر دەســتەکەی تــری و قــووڵ و تــاک و تەنیــا تێماندەڕوانێ، بەیادهێنــەرەوەی کچە شــازادەکان و کچی کافــرۆش و کۆی ئەو کچانەیە کە جوانییەکەیان بۆتە هۆی خولقاندنی جوانترین داســتان و بەســەرهاتەکان. لەیلا فەریقی، خانمە هونەرمەندێکی تاقانەیە کە هەموو نێرسالاری و ئاینسالاری سەردەمەکەی ئێمە نەیتوانی خەفەی بــکات،، چونکە دەنگی ئەو هەڵگری بەشــێکی زۆر لەو حەقیقەتەیە، کە لە ئەزموونێکی زۆری چەوســانەوە و جیاوازی و نایەکسانی و ستەمکاریی کەلتوورییەوە سەرچاوەی گرتووە. لەیلا، لەگەڵ خۆیدا دەنگــی کپکراو و بێدەنگکراوی هەزاران ژنــی بۆ زیندووکردینەوە، کــە هەرگیز گوێیان لێنەگیــرا و نەبینران. ئــەو هەرچەندە هەڵگری ڕۆحــی تاکایەتی و خودێتــی و مێینەیــی و یاخیگەرانەی خۆیەتی، بــەڵام هیــچ وەختێ تەنیــا نییە و هیــچ وەختێ بۆخــۆی نییە. ئەو بەرجەســتەکەری ستەمێکی کەڵەکەبوو، عەشــقێکی بێدەنگرکراو و جەســتەیەکی یاســاخە، کە پڕ پڕە لە ئیرۆتیکا و جوانی و هەڕەشە. ئەو تارماییەکە و ترســێکی زۆری خســتە ناخی ئــەو کەلتوورەوە کە لە غیاب و شــاردنەوە و داپۆشــینی مێینەییدا هەموو شــتێکی

بۆسەر چووە و شاعیر گوتەنی: وەک گوڵی فەرشی ناو ماڵ، مامەڵە لەگەڵ مێینەییدا دەکات، کە بەردەوام بەسەریدا دەڕوات و نایبینێ. ئەو یەک کەڕەت هات و گوتی من هەم: من وەک خۆم و وەک ڕەگەز و وەک جەستە و وەک دەنگ هەم و هاتنێک هات وەکخۆی بەبێ ئەوەی لە هەڕەشەی شەرم و کوشتنی کەسایەتی و بانگەشەی شکاندن و ئابڕووبردن بترسێت. دەنگی ئەو لە زار و لێوییەوە دەرناچێت، هەناسەکانی ئەو لە گەرووییەوە دێنەدەر، بەڵام بنەوانەکەیان دەچێتەوە سەر قووڵاییەکانی کچێنی و ئازاری مێینەبوون. ئەو بە ئەندازەی نەڕەی ڕەگەزی نێرینە کە بە درێژایی مێژوو لە کۆشکەکانی دەسەڵات و سەکۆی حوکم و بڵندگۆی منارەکانەوە، بەسەر ئازایەتی خۆیدا هەڵداوە و پەیکەری بۆخۆی دروستکردووە، لە مێینەیی خۆیەوە دەچریکێنێ و بەو دەنگەی خودێتی خۆی لەسەر ناوچەوانی مێژوویەک بەرجەستە دەکات، کە بۆ ئەو جگە لە حەرامکردن و شەرم و کوشتن هیچیتری پێنەبووە. لەیلا جاروبار کەمێ ڕووت، کەمێ فریودەر، کەمێ ختووکەدەر و زۆریش خرۆشێنەر دەردەکەوێ. ئەو هیچ شتێکی مێینەیی و هیچ خەسڵەتێکی ڕەگەزەکەی کە خوای گەورە و جیاوازیی سرووشتی پێی بەخشیوە، ناشارێتەوە و ملکەچی ژێر نیگای کەلتوورێکی ناکات، کە بە ڕۆژ حەرامی دەکات، لە ڕووناکاییدا بەنەفرەتی دەکات و بەشەو ئیکلامی بۆ دەکێشێ و لە تاریکیدا بۆی دەچێتە سەرچۆک و لەبەری دەپاڕێتەوە. ئەو هیچکامێ لەو خەسڵەتانەش ناشارێتەوە، کە بەسەرییەوە بوونە ماڵ و بەهۆیانەوە فریودراوە و ملکەچ کراوە: تەماشای زێڕەکانی سەر سینە و بازنگەی دەست و ئەڵقەی پەنجە و پاوانەی پێی بکە. هەموو ئەمانە ئەو جۆرانەی ڕازاندنەوە نێرانەییەن، کە پیاو لە درێژەی مێژووی حوکمڕانییەکەیدا بە ژنی

بەخشیون و بەهۆیانەوە دەستەمۆی کردوون و لە سایەیاندا بێدەنگی کردووەو ویستویەتی تەماشای بکات. بەڵام ئەم خانمە لە پشت هەموو ئەو شانۆنامەی ژنبوونەوە، لە پشت ئەو سیما فریودەرانەی کەلتووری پیاوسالاری لەسەر مێیینە بەرهەمیهێناوە، دەیەوێ خۆی بێت و بە نیگایدا دەمانباتەوە ناو ناخی خۆی، ناو ناخی مرۆیی خۆی بۆ ئەوەی لەوێدا نەک هەر تەماشای بکەین، بەڵکو ببینین. بۆیە لەیلا نمونەی ئەو خانمانەیە کە بە ئامادەییەکەی، لە دەنگ و ڕەنگ و ڕەگەزدا، هەڕەشەیەکی توند لە کەلتوورێکی پیاوسالارانە دەکات، کە هەموو چرکەیەک ناچارمان دەکات حەز و ئارەزوو و ویست و تامەزۆرییمان بۆ ئەویتر بشارینەوە. ئەویترمان لێدەکاتە مەملەکەتێکی ئەوەندە دوورە دەست، کە ئیتر ناچاربین تەنیا لە خەیاڵ و لێکدانەوە و هێنانەپێشچاوەکان و فەنتازیادا، یەکلایەنانە ڕووبەڕووی ببینەوە و کاتێکیش پێیدەگەین، هەرچی وزەیە پێمان نەماوە و هەموویمان بەخشیوە بە سیاسەت و خواردن و جگەرە و عارەق و خەفەت. بۆیە لە ساتەوەختێکدا کە ڕووبەڕووی مێیینە دەبینەوە، هیچمان لە مرۆڤبوون پێنەماوە و سیس و داماو و بەتاڵ، مەگەر تەنیا وزەیەک کە پڕبوویـن لێی ئەو توڕەیی و توندوتیژییە زۆرە بێت کە بۆتە لۆگۆ و نیشانەی پیاوبوونمان. هەربۆیەشە کاتێ ئەو ڕووبەڕووی خودی خۆمان و مەحروومیەتی خۆمان لە ژیانێکی ئارام و ئیرۆتیکانە و ژیاندۆستانەمان دەکاتەوە، تووڕەییە مێژووییەکەمان داگیرمان دەکاتەوە و نەفرەتی خۆمان لە شێوەی تیزابڕێژی و ئاوێنەشکاندن و ئارایشگا تەقاندنەوە و توندوتیژیی خێزانی و حەرامکردنەکاندا دەردەبڕین و کەسێ بەناوی ئەو کەلتوورە شەڕانگێزەوە ڕادەسپێرین: قیر بکات بە سیمای کچێنی و جوانی و شارستانیەتی مێیینەییدا. کەسێ ڕادەسپێرین تا ئەو ترسە

مێژووییەی لە مێنەیی و ئیرۆتیزم هەمانە، داپۆشێ و بیشێوێنێ و ناشیرینی بکات، بەبێ ئەوەی بزانین کە بەو کارەمان و بە ئاسایی وەرگرتنی ئەو ڕەفتارە، چەندە خۆمان لە بەردەم ژیاندۆستیدا ناشیرین کردووە و شێواندووە.

لەیلا، بۆ ساتەوەختێک بەو دەنگە بەهەشتییەی، بە هەناسە قووڵەکانی کە زەنگی ئیرۆتیزمێکی داگیرکەرانە دەدات بە گوێی بیسەردا و بێدەنگییەکی مێژوویی ژنبوونی پێدەشکێنێ، هەرچی وزە و توانای مرۆییە تیاماندا بێداری دەکاتەوە و بانگمان دەکات بۆ ژیانێک کە جوانی ئێمە لە پێکەوەبووندایە، چونکە «کێشەمان یەک» و «دێوی ڕەش» دوژمنی سەرەکیمان. ئەو کەدێت، بە کەمترین پاڕانەوە و زۆرترین بڕوابوونەوە بە خۆی دێت و لە «مەرگیشدا بۆ ژیان دەگەڕێت». سەری بڵند و سنگی دەرپەڕیو، لاقەکانی دەسەڵاتمەندانە و نیگای ئارام. ئەگەرچی دڵی «وەکو ئاوێنە خەمێکی لێڵ داپۆشیوە»، بەڵام خاوەنی نیگایەکی ئەبەدیانەیە، کە هیچ شتێکی زەمانە و هیچ ناوزڕاندن و هیچ ستەمێک، ڕۆحی کچانە و کوردیانەی ئەو ناشێوێنێ و نایترسێنێ. ئەو ئەوەتا لێرەیە و لە ناخماندایە و بۆیە نەهاتووە شتێکی تر بێت جگە لەخۆی وەک مێینەیەک، وەک خودێک و وەک جەستەیەک کە پڕە لە جوانی و شکۆ و کەرامەت و ئیرۆتیزم. بەڵام ئەو لە سەرلەشکرێکیش دەچێت، کە بەو دەنگە دلێرەیەوە دڕ بە بێدەنگی دەدات و خۆی لە دەنگدا بەرجەستە دەکات. ئەو بۆ ئەم کەلتوورە داخـَراوە ئافرەتکوژەی کوردستان، تارماییەکە بە ڕێوە تا ڕۆحی ئەوانە بتۆقێنێ کە لە مرۆڤ و ژیان و کرانەوە و جوانی دەترسن و تەنیا دیارییەک بۆیان هێناوین ترس و تۆقاندن و کوشتنە.

لە سلێمانی، ئێمە ماڵمان لە گەڕەکی مەجیبەگەوە تازە هاتبووە تووی مەلیک. ئەمە تەنیا شوێنگۆڕکێیەک نەبوو، یان گواستنەوەیەک لە هەرێمی بەگایەتییەوە بۆ پاشایەتی، بەڵکو ئەوە بۆ من ڕزگاربوونێک بوو لەو گەڕەکەی کە زۆرترین چەوسانەوەم تێدا بینی: دووجار خەریک بوو بە پاسکیلەوە بکەومە ناو سەددەکەی مەجی بەگ، سێ جار ڕێگرەکان کە هاوتەمەن و لەخۆم گەورەتر بوون ڕێگەیان پێگرتم، جارێک بە پایسکیلەوە خۆم کێشا بە کەرێکدا، کە لە قەراخ جادەخۆڵەکە وەستابوو، سێ تەقلەم لێدا. ئەو کوڕە عاشقەی هەمیشە بڕۆی هەڵدەتەکاند و پێی کۆنترۆڵ نەدەکرا، کاتێ لە چاوەڕوانیی خۆشەویستەکەیدا، پاڵیدابوو بە عەموودی کارەباوە، لەبەر باران و بەفر، کارەبا گرتی و کوشتی. لەبەر کورتەباڵاییم، لە قوتابخانەی دەباشان کوڕەکان نەیاندەکردمە ئەندامی تاقمی شەڕەشەق و لە تیپی گەڕەکیش دوایئەوەی بەزۆر کردیانمە گۆڵچی و لە یەکەم

یاریدا هەشت گۆڵم لێکرا، دەریانکردم. تەنیا شتێک لە گەڕەکی مەجی بەگ بیرم دەکرد، دەنگی کەمانەکەی مامۆستا دلێر ئیبراهیم و ئاراسی برای و دەنگی دڵسۆزی خوشکیان و میهرەبانییەکانی ئەختەرخانی دایکیان بوو، کە هەرگیز لە هیچ شوێنێکی دنیادا، نەبوومەوە هاوسێی بنەماڵەیەکی وا بەهرەمەند..
هێشتا پەیمانگای هونەرەجوانەکان لە گەڕەکی هەوارە بەرزەبوو، کە قوتابیان بە جلوبەرگە تایبەتییە خۆڵەمیشی و سپییەکانیانەوە، شەقامی تووی مەلیکیان دەخرۆشاند. تەنیا شتێکی نامۆ موسەللەحەکان و سەیارەی فریاکەوتن (نەجدە) بوو، کە بەردەوام بەوێدا هاتووچۆیان دەکرد. ئەو کاتە پیاسەکردن بە شەقامی تووی مەلیکدا جۆرێک بوو لە خۆپیشاندان و بەرگریی و پرۆتێست. من ماوەیەک لەوە دوا و لە نێوان توی مەلیک و هەوارەبەرزە و لەو کەشوهەوایەی سلێمانیدا، مامۆستا بورهان قانعم ناسی.
ماڵەکەیان دەکەوتە بەشی تووی مەلیکەوە، کە بەتەنیشتییەوە چۆڵەوانییەک هەبوو، سالانیی پێشتر بۆ پیاسە ڕوومان تێدەکرد و لەوێ گوێمان لە «قاریئەتولفنجان»ی «عەبدول حەلیم» دەگرت. ئەو لەسەر شەقامی تووی مەلیک بۆ پاس دەوەستا. نازانم چۆن دۆزیمەوە، بەڵام پێشتر مامۆستا ئەحمەد سالاری شانۆکار باسی ئەوی بۆ کردبووم، کە دەتوانم بۆ پیاچوونەوە و بەراووردکاری سیناریۆی فیلمی (پایسکیل دز)ی (فیتۆریۆ دیسیکا)ی ئیتالی، پەنای بۆ ببەم. لەسەر راسپاردەی مامۆستا سالار ئەو سیناریۆیەم وەرگێڕابوو بۆ کوردی و دەبوو کەسێکی شارەزا لەگەڵ دەقە فارسییەکەیدا بۆم بەراوورد بکات.
ساڵەها لەوەدوا، لە دانمارک، فیلمەکەم دۆزییەوە و دیسانەوە لەگەڵ دەقە دانمارکیەکەشدا بەراووردم کردنەوە. لە ماڵەکەی مامۆستا

بورهـــان قانیعدا، هەیوانێک هەبوو، کـــە وا بزانم بە دوو پلە قادرمە بۆی دەچوویتە ســـەر. من بەیانیان بە خزمەت مامۆستا دەگەیشتم و ئەوەی لەم بارەیەوە دەیڵێم، لە ڕووی یادوەرییەوەیە نەک فاکتی ڕاســـتەقینە. کە چاووم پێی کەوت، ئەمجا تێگەیشـــتم بۆ دەبێت ئەم مرۆڤـــە وەرگێـــڕی (مێژووی ماد) لە نووســـینی ئـــە. م. دیاکۆنۆف، بێـــت. کتێبەکە پێناســـەیەک بوو بۆ کەســـایەتی وەرگێڕەکەی و ئەو هەدادانـــەی ئەو لە ژیانیـــدا هەیبوو، ئەمە جگە لـــەوەی بەو کتێبەدا بۆت دەردەکەوت بورهان قانع، چ هەســـتێکی نەتەوەیی ڕیشەداری هەیە، کە بێگومان ئەمەیان میراتی قانیعی شاعیری میللی بوو بۆی مابۆوە. من ئەو کاتە (مێژووی ماد)م بەتەواوی نەخوێندبۆوە، بەڵام چەنـــد نامیلکەیەکی دیکەیم خوێندبوونەوە و (شۆڕشـــی کۆیلەکان، یان سپارتاکۆس) کاریگەریی زۆری لەسەرم هەبوو.

کە زانی، ئەمەی زۆر پێخۆش بوو، هەربۆیەش زوو متمانەی پێکردم و تێیگەیانـــدم کـــە دەتوانم لەماڵەوە ســـەردانی بکەم، بە مەبەســـتی پێداچوونـــەوە بـــە کتێبـــی ســـیناریۆکەی «دی ســـیکا»دا. بـــە بیرم نایەت چەندجار چوومەوە خزمەتـــی، بەڵام هەرجارەی کەدەچووم ڕووبـــەڕووی هەمان ڕێـــز و هێمنی و خۆشەویســـتی دەبوومەوە. منیش شـــەرمم لێـــدەڕژا و وەک کـــوڕە لادێییەک، کـــە فێرکرابووم نابێت لەماڵان پێڕاکێشـــم، سانســـۆرێکی زۆرم لەسەر خۆم دادەنا. من بـــە زۆری بەیانیان دەچوومە خزمەتی و ئەو بۆخۆی کاتەکەی بۆ دیاریکردبووم. ســـاڵەها لەوەدوا کـــە بیرم لەو کاتە دەکردەوە و بەراووردم دەکرد بە شێوازی ژیانی چینی ناوەند، بۆم دەردەکەوت هەرچەنـــد مامۆســـتاکەم زۆر دەوڵەمەنـــد نەبـــوو، بەڵام هەســـت و شـــێوازێکی دەوڵەمەندانەم لەکەسایەتیدا تێبینیکردبوو. ئەو بەیانیان تۆزێک پێش ئەوکاتە هەڵدەستا کە ڕێکەوتی چوونی منیشی دەکرد.

لەبەر ئەوە ئەو چەند بەیانییەی کە دەچوومە خزمەتی، هێشتا نانی بەیانی نەخواردبوو..

چیرۆکە سەیرەکە لێرەوە دەستپێدەکات، کە بە گەڕانەوەم بۆ کتێبی (فەنتازیای خواردن) دەست بە گێڕانەوەی دەکەم. کاتێک خەریکی نووسینی ئەو کتێبە بووم، بە قسەیەکی مامۆستا بورهاندا، پەیوەندیی نێوان خواردن و دەنگم بۆ دەرکەوت: «نانخواردن ملچەملچەکەی خۆشە»!. کاتێ بەیانیان دەچووم، ئەو بە عادەتێکی کەمێ وردە بۆرژواییانە، کە زیاتر سەرچاوەی لە ڕۆشنبیرییەکەیەوە گرتبوو، تازە لە خەو هەڵدەستا و نانی بەیانی دەخوارد. ئیتر نازانم ئەم لە خەوهەستانەی دوای بێداربوونەوەی یەکەمی بووە، یان هەر ئەو کاتە لە خەو هەڵدەستا. نانی بەیانیانی ئەو، هێلکەوڕۆن و تەماتەی کاڵ و پیاز بوو بەنانی تیرییەوە. لانیکەم ئەو چەند جارەی من چوومە خزمەتی ئەمە دووبارە بۆوە. هەمووجارێکیش بەگەرمیی و بە عادەتی بنەماڵەیی خۆی، زۆر تێمەوە دەئاڵا تا لەگەڵیدا بخۆم. من نانم خواردبوو، بە زۆریش نان و ماست و چای شیرین بە کولێرەی پیاڵەسووەوە. ئەو نانەکەی لەسەر لەپی دەستی دادەنا و بەدەم قسەی خۆش و پرسیارەوە، کە زیاتر بۆ ڕاگرتنی دڵی من بوون، هێلکەکەی دەخستە سەر و ئەمجا بە قاشە تەماتە و پیاز دەیئاخنی و کەمێ خوێی دەکردە سەری و لوولیدەکرد. دەست و پەنجەی خڕوخەپان بوون و لێیدەهات. جاری یەکەم، ئەم خواردنە و پێکهاتەکانی هیچ سەرنجیان ڕانەکێشام، بەڵام هەر کە ئەوم بینی بەو هەموو چێژەوە پاروەکەی لە دەمیدا دەگلاند، یەکسەر ئیشتیام چووە سەری و تازەش پەشیمانبوونەوە دادی نە ئەدام. بۆیە هەر کە چوومە ماڵەوە، یەکسەر دەستمکرد بە هێنانی پیاز و تەماتە و هێلکە و نان و پاروویەکی وەکئەوەی مامۆستا خۆشسەلیقەکەم

دروستکرد. بەڵام ئەو تام و چێژەی نەبوو، کە لە تەماشای مامۆستاوە هەستمپێدەکرد. «نانخواردن ملچەملچەکەی خۆشە!»، کە من نەمدەزانی چونکە بەمنداڵی لەسەر ئەو ملچەملچ و تەقەی کەوچک و ددانە، لێدانی زۆرم خواردبوو.
پاش ساڵانێکی تر، کە «مێژووی ماد»م بەتەواوی خوێندەوە، تێگەیشتم کە سەلیقەی ئەو لە خواردندا، لە وەرگێڕانیشدا ڕەنگیداوەتەوە: بە هەمان چێژ و وردبینی و مکووڕبوونەوە کاری لە وەرگێڕان و فەرهەنگنووسیدا کردبوو، کە لە ئامادەکردن و خواردنی پاروویەک ناندا. ئەو بە ڕاستیی ئەو کاتە قانیع دەبوو، کە کارەکە بە باشی و پوختی ئەنجام درابا. دێر بەدێر، تا سنووری باوێشکدان، دەقە کوردییەکەی پێدەخوێندمەوە و خۆیشی تەماشای دەقە فارسییەکەی دەکرد. هەر سەرنج و ڕاستکردنەوەیەکی هەبایە، دەیوەستاندم و بۆی ڕاستدەکردمەوە و منیش دەمنووسی.
دەبایە لە تەمەنی خۆم گەورەتر بم، ئەو منی زۆر بە جیدی گرتبوو. لەم نێوانەشدا بەردەوام چای دەخواردەوە. چای گەرم، گەرم. لەمەدا باوکمی بەبیر دەهێنامەوە: ئەوان هاو تەمەن بوون و دوور بەدوور یەکتریان دەناسی. تەنانەت کاتێ لەو کارەساتەدا بە ڕەحمەت چوو، باوکم دڵی بۆی پڕ بوو. ئەوان هەردووکیان چایان بەبێ ژێر پیاڵە دەخواردەوە: پیاڵەکەیان بە دوو پەنجە دەگرت و بە لێویانەوە دەنا بەبێ ئەوەی فووی لێبکەن. ساڵەها لەوەدوا تێگەیشتم ئەوانە لە نەوەی پیاوانێکی ئەم وڵاتە بوون ژیانێکی پڕ چەرمەسەرێ و هەژاری و دەربەدەرییان بەسەر بردبوو، بەڵام ئابڕوومەندانە. ئەوەی ڕۆژگار نەیبەزاندبێ، لە چای گەرمیش ناترسێ. من بەو شێوازی کارکردن و هاوکارییەی مامۆستا بورهان قانع، کەمێک شارەزابووم. ئەمە هەمان شێوازی کارکردنی حوجرە بوو، کە من

لە منداڵیمدا دوو ســاڵێک ئەزموونم کردبــوو. بەڵام ئەو زۆر زیاتر چاویکرمــەوە و کاری وەرگێڕانــی لەلا خۆشەویســت کردم. یادی بەخێر.



# ژنانی بناری سیوەیل..

کاتێک ئەم وتارە بڵاو دەبێتەوە، چەند ڕۆژێک بەسەر یادی هەشتی مـارس دا، کە ڕۆژی جیهانیی ژنانە، تێپەڕ دەبێت. من دەمەوێ لەم بۆنە پیرۆزەدا، کە بۆنەی سـەرهەڵدانی بوون و ژیانە، پۆرترێتێکی ژنـان و دایکانـی ناوچەی خۆمان بکێشـم، کە لە هەمان کاتیشـدا نمونـەی ژنـان و دایکانی ناوچەکانیتـری وڵاتەکەمانن. ژنانێک، کە تابلۆیەک لە جوانیی و بەرزیی و پیرۆزیی وڵاتەکەمان پێکدەهێنن و ئەگـەر بمانەوێ باس لە ژنانـی هەموو ناوچەکانیتر بکەین، تەمەنی نووحمان دەوێت.

بناری سـیوەیل بـە درێژایی مێژووی خۆی ناوچەیەکی شـاخاوی و داڵـدەدەر بـووە. تا کۆتایـی حەفتاکانیش دەسـتی حکومەتی بە ئاسـانی نەدەگەیشـتێ. زەوی بـەراو و باخاتی میوەی ئاسـایی و لەبـەر ئـەوەش دەرامەتی کەم. هەژاری هەمیشـە لـەم ناوچەیەدا یـەک دووژمنی هەبـووە: دەسـتکراوەیی و دڵکراوەیی خەڵکەکەی.

ئەوان لە وەرزەکانی کاروکاسپیدا ڕەنجیان کێشاوە و لە وەرزی میوان و گەشتیاریدا لەگەڵ میوانەکان و ڕێبواران، بەشیانکردووە. هیچکاتێکیش وەک هەندێک لە حیزبە سیسیاییەکان پارووی دەمی خەڵکیان نەژمارادووە. یەع!. لەبەرامبەر ئەمەدا، زستانی سەخت و بەهار و هاوینی بەهەشت. پڕ لە میوان و ئاوەدان. خەڵکی ناوچەکە چەندە زەحمەت لەگەڵ سرووشتدا دەکێشن ئەوەندەش بۆ میوان کراوە و خۆماندووکەر. بەڵام لەناویاندا ژنان ماندووتر و زەحمەتکێشتر. پێویستە لەم گۆشە نیگایەوە، سەر لەنوێ مێژووی ناوچەکە بنووسرێتەوە.
ژنانی سیوەیل، هەرچەندە لە سێبەری پیاوانیدا بوون، بەڵام مێژووی خۆیان جیاوازە. من لە زمان زۆر لە مامۆستا ناودارەکانەوە، ناوازەیی و ئازایی ئەو ژنانەم بیستووە، وەک مامۆستایان ئەحمەد هەردی و محەمەد ڕەسووڵ هاوار. مەلا مستەفا، کاتێ لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٢دا سەفەرێکی ئەو ناوچەیە دەکات، ڕێگە نادات چێشتلێنەرە تایبەتیەکانی خۆی، خواردنی بۆ دروستبکەن، ئەو خواردنی دەستی ژنانی ئەوێ دەخوات. ساڵانێک لەمەوپێش لە دیدارێکدا لەگەڵ بەڕێز نەوشیروان مستەفا، پێی گوتم ئەگەر ناوچەی سیوەیل و شارباژێڕ نەبوایە، ئێمە نان نەبوو بیخۆین. سەرۆکی هەرێم هەموو جارێ، هەروەک لەگەڵ هەموو کەسیشدا، بە ئێمە دەڵێت: لەیەک عائیلەین! لەودیو ئەم قسانەوە، کە هەموویان جوانن، واقیعێک هەیە کە ژنان بەتایبەتی تیایدا چەوساوەن. ئەوان قوربانیی یەکەمی ناوچەکەن و هەمووشیان بریندار و جگەر سووتاو و زامی غەدری مێژوو بە ڕۆحیانەوە. جوانیی ئەو قسانە، لەو ئەرکە کەمناکاتەوە کە پێویستە بۆ ژنان و منداڵان ئەنجام بدرێن.
ئەم ئێوارەیە لە خزمەت دایکما دانیشتبووم، باسی تەمەن و

هاوڕێیانمان دەکرد. ئەو گوتی: «ئێستە من بێ هاوڕێم، ڕەفیقەکانم هەموویـان بەجێیان هێشـتم. هەر ئەوەندەش بەرگــە دەگرین، ئیتر مردن زۆر ئاساییە.».

ئەم قسـانە جگە لە ڕۆحە سۆفییە پاکژەکەی ئەودیویانەوە، جگە لە ورەی دایکانــە، هاوڕێکانی ئەویان بە بیرخســتمەوە، کە هەندێکیانم بینیون و نانی دەســتیانم خواردووە، هەندێکیشـیانم دووراودوور ناسیون. بەڵام دەزانم هەموویان مرۆڤی مەزن و کەسایەتیی بەتوانا و خۆشەویست بوون و کەم کەس هەیە ڕێی کەوتبێتە ئەو بنارە و سوودی لە بەری ڕەنجی ئەم ژنەخانمانەی وەرنەگرتبێ.

ئەوان لە ڕەنج و تێکۆشان و ئاگر و فیتەنەکوژاندنەوە و ئاشتەواییدا بێنمونە و هاوبەش بوون. شـیریان پاک و دەمیان پاک و خوێنیان پــاک و داوێنپــاک. ئەمانە بــە تەنیا دایکی کــوڕ و کچەکانی خۆیان نەبوون، بەڵکو دایکی ئەو لێقەوماو و بێدایک و باوکانەش بوون، کە ڕۆژگاری ڕێیان کەوتۆتە ناوچەکە.

لــە پێش «یایە پیرۆز»، داپیرە گەورەی هەمووان، ناوی کەســیترم نەبیستووە، کە هەم لە سیاسەت و هەم لە بواری کۆمەڵایەتیدا، ڕێز لێگیراو بووبێت. لە تەمەنــی خۆمدا، ئامینەخانی حاجی کەریم ئاغا، ئەفسانەیەک و تابلۆیەک بوو لە بەخشندەیی. یەکجار ڕووخساریت بینیبا، بۆ یەک تەمەن بیرت نەدەچوو. من هێشتا لە ئەوروپا بووم، کە مەرگی ئەوم بیست و ئەمێستاکەش سیمایم وەک تۆقەنە نێرگزێکی بەهاری دێتەوە بەرچاو.

پوور حەنیف، ژنێک لە ڕاز و پڕ لە حیکمەت. لە پشت هەر بڕیار و گوفتارێکیــەوە، ئازادیی مرۆڤێک و ژیانــی ژنێک و مژدەی منداڵێک هاتۆتە دی. ئەو ئاشــتیخوازێکی بێنمونــە و فریاگوزارێکی خۆبەش بووە. سیمای ئەوم وەک تارماییەک دێتەوە پێشچاو. وەک ئەوەی لە

ئەفسانەکاندا بینیبێتم. دەبێت لە بەفر پرسین، چەند جار لە زستانە سەختەکاندا بە فریای ژنان کەوتووە و شوێن پێی منداڵێکی بۆسەر شوێن پێی مرۆڤایەتی زیاد کردووە. ئەو مامان و حەکیم بووە و لەسەر دەستی ئەو، مردن بەچۆکدا هاتووە.

پار لە پرسەی نەعیمەخاندا دانیشتین، ژنێک لە چاکە و شکۆی دایکانە. ژنێک پڕ لە گەورەیی بەرگەگرتن و شۆخیی و هەدادان و بێ فیزی. چەند ساڵێکیش پێش ئەوەی بگەڕێمەوە، پیرۆزخان، ئەو چەپکە گوڵەی کە زۆر کەم بەبێ جگەرەیەک بە لێوانەوە دەتدی، کۆچی دوایی کرد و سەرەتاییترین قسەی «بەساقەوبم»، بوو. ئەمانە بێ فیز بوون و کارەکەریان لەدەورە نەبووە و خانمایەتیان نەکردووە.

لیستەکە درێژە: ئەختەرخانی مەحمودئاغا، شێخ ژنە نازداری خانەقای سیرێ، کافەخانی حاجی شێخ ئەحمەد، حەلاوەخانی نۆڕەباب، ستارەخان حاجی ئامینە و دەیانیتر، کە دەبێت ناوەکانیان لە ئەستێرەکان پرسین، داخۆ ئەو هەموو ڕووناکییەیان لە کوێوە هێناوە..

یەکێکیتر لەوانە نەزیرەخان بوو، کە چەند هەفتەیەک بەر لە ئێستا کۆچیی دواییکرد. من زۆر کەم بینیبووم، بەڵام خۆشمدەویست چونکە ژنێکی یارمەتیدەر و بەڕێز و هەتیونەواز بوو. ئەو لەنەوەی ئەو ژنانە بوو کە مێژووی ژیانیان لەگەڵ مێژووی ناوچەکە و کوردستاندا تێکەڵ بووە. بەڵام هەرگیز میهرەبانیی دایکانەیان لەدەست نەدا. ئەو وەڵام بوو بۆ مێژوویەک و ڕۆژگارێکی ڕەق، ڕۆژگاری ئاوارەیی و تاراوگە، بەڵام بەبێ ڕق و کینە. ئەو پڕ بوو لە هەدادان و سەبر، کە دواجار مردنێکی هێواش بردیەوە بۆخۆی. لە بناری سیوەیلەوە بۆ سلەیمانی و لەوێوە بۆ وێستگاکانی ئاوارەیی

و تاراوگـە و جەرگسـووتان، لەوێشـەوە بـۆ مردن لـە هەولێر و چوونەوە ژێرگڵ لە سلێمانی. دایکم، وەکئەوەی قسەی لەگەڵ بکات، بۆیدەگێڕامەوە، کە چۆتە سـەردانی کـردووە و لە دوورەوە ئەمی ناسیوەتەوە، پاش تەمەنێک دابڕان.

ڕادیۆکـەی باوکـم لـە مۆدێلـە کۆنـەکان بـوو، گـەورە و ڕەش، بڵندگۆیەک لە بەشـی پێشـەوەی و ئانتێنێک بە لای چەپەوە، بەڵام زۆر بـە درەنگ پاترییەکانی دەگۆڕدران و کەم مەسـرەف بوو. کە ئێسـتا بیر لـەم ڕادیۆیە دەکەمەوە، بیچم و ڕووخسـاری، دووگمە و سـویچەکانی و ئـەو مادەیـەی لێـی دروسـتکرابوو، نیشـانەی سەرەتاکانی تەکنەلۆجیایان پێوە دیار بوو. تەکنەلۆجیایەک، کە هەر لەسەرەتاوە هیچ سنوورێکی نەدەناسی و بۆ هەموو شوێنێ دەچوو. دواجـار تەکنەلۆجیـا سـەلماندی، کە دەسـەڵاتێکی تایبەت بەخۆی هەیە و سـنووری سیاسـی و جوگرافی وڵاتان ناتوانن کەوشـەنی بڵاوبوونەوەکەی دەستنیشان بکەن..

مـن بـە چـاوی منداڵێکی پێنـج یان شـەش سـاڵانەوە، ڕادیۆکەی باوکمم لە بیرە، کە زۆر جار ئارامیی دەکردمەوە و گەلێک جاریش هەراسان، بەتایبەتی بە شەوان، کە هەواڵەکان و وەسواسیی باوکم

بۆ دەنگوباسەکان و تەشویشی هەزاران کیلۆمەتری هەوایی لەو ڕادیۆیەوە دەهاتە ناو جیهانی منالآنەی منەوە. بەیانیانیش زوو هەر بە دەنگی ئەو بەخەبەر دەهاتم. سەرەتا خوێندنەوەی قورئان بە دەنگی کە سێک، کە ساڵەها لەوە دوا زانیم مامۆستا عەبدولباسیت عەبدولسەمەد بووە و ڕەنگە کوردیش. ڕۆحێکی کوردیانە لە دەنگیدا هەبوو، کە تێکەڵێک بوو لە شکست و تراژیدیا و هەر دەبوو زوو بزانم کە تەنیا کوردێک بەو جۆرە قورئان دەخوێنێ و تەلاوەتی دەکات.

پاش ئەویش بەرنامەی شیعر و مۆسیقا: پەروین موشیر وەزیری یان شوکرالآی بابان پێشکەشیان دەکرد و بەیانیان و ئێوارانیان پڕ دەکردین لە دەنگ و وشە و مۆسیقا. من ئێستا کە بیر لەو سەرەتایە دەکەمەوە، نازانم بۆ وەک سەرەتای بوون و سەرەتای کات و پیرۆزیی و یەکەمین بەدەنگهاتنەکانی ڕۆح، بیرم دەکەوێتەوە..

مامۆستا عەزیزی شارۆخ، یەکێکی تر بوو لە دەنگە ئاسمانیەکان و دەنگەکانی سەرەتا، دەنگێک کە هاواری منداڵیانەی مرۆڤ و جیابونەوەی ڕەگەزە سرووشتییەکانم بیر دەخاتەوە. تۆنی دەنگی باریک و ناسکی ئەو هەمیشە بەبیرخەرەوەی سەرەتای منداڵییەکانە، کاتێ بە داوێکی باریک و ناسکیی ئومێد و خەونـدا، دەمزانیی بۆ ئێرەم دەهێنن. دەنگیی ئەویش وەک پلووسکی شەپۆلە دەنگێکی باریک، کە لە گەروویەکی سافەوە بنەوان دەگرێ و تا دەڕژێ و ڕەوان دەبێ، زیاتر ئەو پلووسکە دەبێتە ڕووبارێک لە دەنگ و ئامادەیی و ئاوەدانی..

نەوەی نوێی شارنشین و خەڵەتێنراو بە کولتوور و زەوقی مەسرەفگەرای کلیپە بێتامەکان و ڕۆحی پلاستیکیانە، زۆرکەم

گوێیان لەم دەنگە داوودیانەیە بووە، کە هەتا ئێستاش بە بۆشاییدا بڵاو دەبێتەوە.
ئەو بۆ من هەمیشە بە یادهێنەرەوەی قوتابخانە دەنگیەکەی سەید عەلی ئەسغەری کوردستانیە:
«زەردیی خەزان..
یار غەزال
ئەی ڕەفیقانی تەریقەت..»
بەڵام بەو جیاوازیە زۆرانەی کە لە هەر یەکەیان کەسایەتیەکی تایبەت و ئۆرگیناڵ و دانسقەی دروستکردووە. یەکێک لە جیاوازییە هەرە دیارەکانی نێوان ئەم دوو هونەرمەندە، بریتیە لە فەزای تەکنکی تۆمارکردن و کاریگەریی بۆ سەریان. لەلای عەلی ئەسغەر هەرگیز تەکنیکی تۆمار کردن نەبۆتە جێگرەوە، یان سێبەری هونەرمەند. هونەری مۆنتاژ و تێهەڵکێشکردن و پێکەوە لکاندنەوە و لە فیلتەردان و کاریگەرییە دەنگییەکان، هەر نین و بەکەمیی ئامادە و هەمیشە لە نێوان ئەو مەودایەدا کە هونەمەند بێدەنگ دەبێت و پێویستە مۆسیقا دەست پێبکات، مۆسیقاش تا مارەیەک بێدەنگ و ماتە. وەکئەوەی مۆسیقا دوودڵ بێت و گومانیی هەبێت لەوەی نەتوانێ بەردەوامیی بە دەنگی هونەرمەند بدات. مۆسیقا بە سەرسووڕماویەوە دەستپێدەکاتەوە و بەیانکەری مەودایەکی بێدەنگیە لە نێوان دوو دەنگدا: دەنگی ئامێر و دەنگیی مرۆڤ. کەچی لەلای شارۆخی، هەمیشە مۆسیقا باوەش بۆ دەنگ دەکاتەوە. مۆسیقا بەردەوامیی و درێژکراوەی دەنگە و ئەوەی لە نێوان ئەم دووانەدا ڕوو دەدات دیالۆگێکە بە وشە و ڕیتم و نۆتە.
لەبەرهەمەکانی ئەم دوو هونەرمەندەدا، هەمیشە ئامێری سێ تار و کەمان، دوو ئامێری ئامادەن و هەردووکیشیان نزیکن لە

دەنگیانەوە: کەمان و سیتار بەرجەستەکەری دەنگیی مرۆییانەی ئەم هونەرمەندەن لە دەرەوەی جەستە و لەدەرەوەی پێکهاتە بایۆلۆجییەکەی مرۆڤ. وەکئەوەی دەنگی مرۆیی ویستبێتی بە هۆی ئەم دوو ئامێرەوە لە فەزایەکی ناجەستەییدا درێژە بەخۆیان بدەن و ئەمەش لە ڕەسەنایەتی کاری ئەم دوو هونەرمەندەیان بردۆتە سەری.

شارۆخی هونەرێکی تێهەڵکێشە لە نێوان ئەوەی کاری ڕاستەقینەی خۆیەتی و دانسقەیی ئەو پێکەدەهێنێت و لە نێوان ئەوانەی تێهەڵکێشیان دەکات و لە هونەری خۆیدا جێیان دەکاتەوە. ئەو، هەم قوتابخانەی گەرمیان و بەتایبەتیش (مەردان)ی بەرجەستە کردووە، هەم مۆسیقای دەڤەری سلێمانی و بەتایبەتیش دیلان و هاوتەمەنەکانی و کەمێک پێشتر:

«سوبح پێناکەنێ تا بێتەوایەک شەو بە دڵ نەگری
گوڵێ ناپشکوێ تا بولبوولی سوبحێ بەکوڵ نەگری»

یان:

«بە ڕەنگیی زەرد و شێوەی دەست و شمشاڵی کزا دەروێش
حەزم کرد بەستەیەک ببیەم سەراسەر حوزن و ماتەم بێ،
لە سیماتا بەدیم کرد هەیکەلی عومرێکی حەسرەتکێش
وەها دیارە کە بەختت ئاشیانی بولبوولی خەم بێ..»

بەڵام ئەم دووبارەکردنەوەیە هەرگیز دووبارە کردنەوەی کۆپیانە نیە، چونکە بە هەمان گەرووداتێپەڕ نابێتەوە. ئەمە جگە لەوەی قوتابخانەی مۆسیقای کۆیە، بەتایبەتیش تاهیر تۆفیق لە هونەری شارۆخیدا دیار و ئاشکرایە:

شەماڵ هات بە گاڵە گاڵ،
هەور بوون گەواڵ گەواڵ

پشکوت گوڵی سوور و ئاڵ
بولبوول کەوتە ناڵە ناڵ

...

لە برادەر و ڕەفیقان مزگێنی بەهارە..

لاوک و حەیرانەکانیشی لەلایەکەوە، بە یادهێنەرەوەی ناوچەی بادینان و لەلایەکی تریشەوە ناوچەی شکاک و ئەو دەڤەرانە و دەشتی هەولێرن، وەک ئەوەی لە «گەنج خەلیل»ەکەیدا دەبیستین:

«دە لێ لێ
وەرە لێ لێ/ وەرە لێ لێ/ وەرە لێ لێ/ وەرە لێ لێ/ وەرە لێ لێ/
وەرە لێ لێ/ وەرە لێ لێ/ وەرە لێ لێ/ وەرە لێ لێ/ وەرە لێ لێ/
وەرە لێ لێ/ وەرە لێ لێ/ وەرە لێ لێ/ وەرە لێ لێ/. نەمایم..»

ئەو هونەرمەندی هەموو بەشەکان و دەنگیی هەر چوار وەرزی ساڵە. بەڵام دواجار بەخشینێکی دیکەی شاری مەهابادە بە کورد. ئەو پێش هەموو شتێک هەڵگری تایبەتمەندیەکانی شاری خۆیەتی و وەک قازی ملی بۆ پەتی سێدارە لار. ئەویش وەک هەر هونەرمەندێکی دیکەی خۆرهەڵاتی کوردستان دەچریکێنێ و هاوار دەکا. ئەوان هەموویان بە تۆنی بەرز گۆرانییان چڕیوە. تۆنی بەرز دەلالەتی بانگکردن و گەیاندنی دەنگە بۆ ئەو پەڕی و ئەو سەری جیهان. دەنگبەرزیی ئەم هونەرمەندانەی وەک شارۆخی، نیشانەی کوردبوونی ئەوانە لە جیهانێکدا کە دەنگیی کورد نابیستێ. شارۆخی بە هاوار و چریکەکانی، بەرجەستەکەری هونەریانەی دەنگیی مەرگە، کاتێ پەتی سێدارە و ئیعدام ئاخرین هەناسەکان لە گەروودا دەخنکێنێ. لە دوای قازی محەمەد و هاورێکانیەوە

ئەمە خەسلەتی دەنگبێژانی کوردی خۆرهەڵاتە. وەکئەوەی ئەوان هەموویان بیانەوێ ئەو هاوارە بەرجەستە بکەن، کە لە گەرووی قازی و هاورێکانیدا خنکا. لەم ڕوانگەیەوە، عاشقانەترین گۆرانیی خۆرهەڵاتیەکان تەمێکی سیاسیی بەسەرەوەیە، تەمێک کە هەموو شتێکی عاشقانە دەکات سیاسیی و هەموو شتێکی سیاسیش لە پەیوەندییەکی عاشقانەدا دەخاتە ڕوو.

دوجار لە ڤیستیڤاڵی (سۆران)دا لەسەر شانۆ بینیمەوە: وەک مەسیحایەک بە بێدەنگ، بە کاوە خۆ و نەجیبانە چووە سەر شانۆ و چریکاندی. وێنەیەکیم گرت، بەبێ ئەوەی بزانم، بەبێ ئەوەی مەبەستی بێت، لەو وێنەیەشدا ملی وەک ئەو گەنجانەی ڕۆژانە ئیعدام دەکرێن، بەلارەوە ناوە.

ئایا عومەر دزەیی کاریگەریی لەسەر زەوقی هەمووومان هەبوو؟ ئەم (هەمووومان)ـە کێیە، لە کاتێکدا هەرکات باسی ئیستاتیکا و هونەر دەکەین، مەبەستمان لە زەوقی تاکەکەس و سەبجەکتیڤانەی مرۆڤە؟ ئەمەیە ئەو پرسیارەی لەکاتی قسەکردنمدا لەسەر ئیستاتیکای دزەیی، پێویستە بەدوای وەڵامەکەیدا بگەڕێم..

هونەر هەم دەربڕی ئاستێکی زەوق و هەم بەخشینی کاریگەریی بگۆڕی زەوقیشە. ئەو یەکێک بوو لەو دەگمەنە هونەرمەندانەی، کاتێ لە تەلەفزیۆن، یان ڕادیۆ بەرهەمێکی بڵاو دەکرایەوە، باوکم کەناڵەکەی نەدەگۆڕی. دزەیی لە زومرەی ئەو دەنگانە بوو کە باوکمی دەوەستاند و ئەمەش بەس بوو بۆ ئەوەی من گوێی بۆ بگرم. من و باوکم هەم مەودایەکی تەمەن و هەم مەودایەکی کولتووریی لە نێوانماندا بوو، بەڵام ئەو کاریگەریی لەسەر هەردووکمان هەبوو..

هەرکات من باسی پەروەردەی زەوقی و بیستنی خۆم بکەم، نابێت

ڕۆڵی ڕادیۆکەی باوکمم لەبیر بچێ، کە جیهان و گەردوونیی لە تۆنە دەنگییەکاندا بە من ناساند: هەر لە گرمە و شریخەی ئەو هەورانەوە کە ئاسمانی ولاتانی دەتەنی، تا دەگاتە ئەو مۆسیقا دەنگیانەی کە لەملاولای ئەو کەناڵەوە، کە باوکم مەبەستی بوو گوێی لێبگرێ، خۆیان دەکرد بە گوێچکەماندا و کاریگەرییان لەسەر دادەنایێن. ئەو ڕادیۆیە گۆیچکەی منی ڕاهینا لەسەر مۆسیقای زمانەکان و ئامادەی کردم بۆ فیربوونیان و لەوێشەوە فێربوونی ئەو جیاوازییەی لە زمانەکان و جیهانبینیی بەکاربەرەکانیاندا هەیە. وەک لە (دنیای شتە بچووکەکان)دا نوسیومە، ڕادیۆ کاریگەرییەکی بێئەندازەی بەسەر ژیانیی کوردیانەی ئێمەوە هەبووە، ڕەنگە بێ زیانترین میدیا و تەکنەلۆژیا مۆدێرنەکان بووبێت، ئەگەر بەراووردیی بکەین بەو توندوتییژیانەی لە تەلەفزیۆنەوە ئاراستەمان دەکرێت. بەو فاشیزمەی لە ڕاگەیاندنەکانەوە سرووشتیی مرۆییمان دەشێرێنێ و وامان لێدەکات بەچاوی بەدگومانی بڕوانینە یەکتر و کۆمەڵگاکەمان و دۆخی هێوریی و ئارامی وەک دۆخێکی ڕیزپەڕ وێنا دەکات..

من باسی ژیانی گوند و ڕاکشانی سەربانی شەوانە لەبەر ئەستێران و گوێگرتن لە دوورترین شەپۆلە دەنگییەکان دەکەم، کە جاروبار لەتەک هەموو ئەوانەدا، حەپەی سەگ و دەنگی کوندەبوو و باعەی ڕێوی و جریوەی ئەستێرە و گریانی درەنگەشەوانی منالیکیش خۆیان تێکەڵ دەکرد بەو هارمۆنیایە..

من لەناو ئەو کەشوهەوایەدا، کەسانی وەک ئیدیت بیاف، ئوم کەلسوم، فەرید ئەترەش و محەمەد عەبدولوەهاب، وەردەی جەزائیری، ئەسمەهان، عەلی مەردان، سێوە، محەمەد عارف جەزراوی، شارۆخ،

زیرەک، داودە و قورئانخوێنی مەزن: عەبدولباسیت عەبدوسەمەد و گەلێکیتر و. پاشان: عومەر دزەیی گوێبیستبووم و بۆم دەرکەوت، ئەمانە لەو خواوەندانەی دەنگ بوون کە باوکم لە هەنگامەی گەڕانیدا بۆ کەناڵێکی تایبەتیی رادیۆیی، تا هەواڵێکی نوێی لەسەر چارەنووسی کورد پێبڵێت، دەیدۆزینەوە و لەسەریان دەوەستا..
من ئەو کاتە هیچکام لەم ئەستێرە گەورانەم نەدەناسین و پاشان لە شوێنی جیاواز و قۆناغی پاشتری گەورەبوونە لەعنەتیەکەمدا، سەر لەنوێ هەموویانم دۆزینەوە و ئەمجارەیان هەم بەیادی باوکم و هەم بۆ تێگەیشتنی زیاتر لێیان و هەم لەژێر ئەو کاریگەرییانەی لەسەریان دانابووم، گوێم لێگرتنەوە. و لاسایی هەندێکیانم کردەوە، وەک لاساییکردنەوەی دزەیی.
گوێملێگرتنەوە و گوێملێگرتنەوە هەتا سەر لەنوێ گوێچکەی منداڵیی خۆمم دۆزییەوە و ئەمەش چێژەکەی چەندین جار دەبردە سەرێ. چێژی منداڵبوونەوە و خۆدیتنەوە لە ژێر ئاسمانی پڕ ئەستێرە و شەوانیی تەنیایی، بەلام ئیتر بەبێ پەنجەکانی باوکم کە میلی ڕادیۆکەی با دەدا و لە پای گوێگرتن لە هەواڵەکان، لەبەردەم دەنگێکی وەک دزەییدا، دەوەستا و خامۆش..
باوکم نەمابوو، هەر بۆیەش رادیۆکەی من جگە لە گۆرانیی و دەنگیی خۆش، هەواڵی ناخۆشیشی بڵاو دەکردنەوە، وەک هەواڵیی مەرگیی شاملوو و حەمەی ماملێ، کە لە کتێبی (نەتەوە و حەکایەت) دا باسمکردوون..

عومەر دزەیی زۆر جیاواز بوو. چونکە گۆرانیەکانی ئەو وەکئەوەی بۆ یەکەمجار بێت، فرەدەنگییان لە مۆزیکدا پێناساندم و گوێچکە و بیستنیان پەروەردەکردم. ئەمەشم پاشتر لەگەڵ منداڵەکانی خۆمدا،

زەریـاب و نایـاب، دووبـارە کـردەوە هەر لەو کاتەوەی لە سـکی دایکیانـا بوون، گۆرانییەکانی قادر کابان و عومەر دزەییم بۆ گوتن و لە گەشـەی دوای لەدایکبوونیشیاندا، هەر کات ئازار و خەمێکیان هەبوویێت، بەو میلۆدیانە ئارام و لەسەر خۆبوونەوە.
لـە کارەکانی کابان، (جادەچۆڵ و سـێبەر بوو، کاتی بەیانی و زۆر قـژی زەرد..) و لـە کارەکانـی دزەیی مـەزن، (قژ کاڵـی لێو ئاڵی، کانیەکی ڕوونی بەر تریفەی مانگەشـەو..)، هێندەی دوو پزیشک و حەکیمی کارامە، سـوودیان بۆ تەندروسـتی و ڕۆحدروسـتیی ئەو دوو منداڵەمان هەبووە..
سـەیریش نیە کە هەردوو ئەم هونەرمەندە بە گوتنەوەی شـیعری (عەبدوڵا گۆران)ی مۆدێرنیسـت، مۆدێرنیزمیان هێنایە ناو گۆرانیی و میلۆدیی کوردییەوە و مۆدێرنیزمی وشـە و زمانیان هەڵگێڕایەوە بـۆ مۆدێرنیزم لـە میلۆدیی و دەنگدا. مۆدێرنیزمـی کابان زیاتر لە ناوەڕۆکـی گۆرانیەکانیـدا دەبینمـەوە و مۆدیرنزیمـی دزەیـی لە نـاوەڕۆک و ئاوازەکانیشـدا، ئەمە وێڕای ڕەهەندی نومایشـیانە و فرەدەنگیانەی بەرهەمەکانی. لە ڕاستیشـدا کارەکانی هونەرییەکانی دزەیی، ویڕای ناوەڕۆکە شارییەکەیان، گوزارشێکی هەستەکییش لە کات و سەردەمێکی تایبەت دەکەن، کە خەون و نۆستالیژیا، خەیاڵ و داهاتوو بەرجەسـتە دەکـەن. بەم مانایەش دزەیی لە پرۆسـەی هونەریی خۆی و لەو کاریگەرییەی بە دەنگ و میلۆدیەکانی کردیە سـەر نەوەی مـن، زۆر پێش سـەردەمەکەی خـۆی کەوتبوو. ئەو مژدەبەخشـی جۆرێکـی تـری چێـژ و جۆرێکی تـری گوێگر بوو پێشـئەوەی شـار لـە جەنجاڵـی خۆیـدا، ناچارمانن بـکات خۆمان بدەینە دەسـت ئـەو ڕیتمە ئایرۆبیکیانەی لەو سـەرەوە تەنیا فێری هەڵەکەسەمامان دەکەن، هەر بۆیەش ئێستا بەبێ ئەوەی لە نزیکەوە

بیناسم، یان هاوڕێی هاوبەشمان هەبێ و ئەو بۆی گێڕابمەوە، بە سەختی ئەو هەستەم هەیە، کە ئەو ئەمێستا وەک هونەرمەندێک هەست بکات هەموو خۆشی و چێژەکانی خۆی لە ڕابردوودا ژیابێت و ئەم کەشوهەوا کولتوورییە داخراوەی هەنووکە، ئەویان لەچاو خەونە هونەرییەکانیدا هەناسەسوار کردبێت.

کۆمیدیای ژیان لەوەدایە کە هونەرمەندێک هەست بکات لە ڕابردووی کاتدا، کە کۆمەڵگا زۆر لە ئێستا بێ ئیمکانیەت تر و دەستکورت تر بووە، ئازادیی ئەو زیاتر بووە و کرانەوەیەکی فرەتر. لەکاتێکدا ئێستای کۆمەڵگا بەو سانسۆرە کولتوورییانە دەورەیان گیرا بێت، کە لەدژی کرانەوەی کولتووری و هونەریی ڕەسەنن!!. ئەگەر هونەرمەند و جوانیدۆستێک هەست بەمە نەکات، خۆی و باوکی ملهوڕن و هونەر بۆ ئەو جگە لە خۆنواندن و کلیپکردن، هیچیتر نیە. کلیپ، ئەم دیوەی هەستی هەموومانی شێواند و فیری درۆی گوێگرتنی کردین، بەبێ ئەوەی گوێمان لە هیچ بێت..

ژمارەی ئەمانەش کە بە فیتی بازاڕ سەمایەکی ناڕەسەن دەکەن، لە چاو ئەو گەورە تەنیایانەی وەک دزەیی مۆدێرنیست، ئاسمان و ڕێسمانە، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە، کەس و هیچ شەپۆلێک لەم هونەرە بازاڕیی و بێ کەسایەتی و تەمەن کورتە، نەیانتوانیی پاشەکشێ بە کەسانی وەک دزەیی بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەمیان بەرهەمی کەم و ئەوانیتر بازاڕیان پڕ کردووە.

زەبەلاحێکی وەک دزەیی بەم ڕووخسارە ماکیاژکراوانە یادوەریی و هەنووکە چۆڵ ناکات. ئەو بەدەنگێکی هێندە لەیاسا بەدەرەوە هاتە ناو گوێی کوردییەوە، کە بەیادهێنەرەوەی ئیمبراتۆریەتە گەورەکانی مێژووە. بەڵام نەعرەتە دەنگییەکانی ئەو، لە جیاتی ئەوەی لەشکرکیشی و مەیدانی جەنگەکانمان بیر بخاتەوە، بیرخەرەوەی

جوانیە و هەر ئاواش خستیە بواری خزمەتکردن و پەروەردەکردنی هەستەکیی ئێمەوە. ئەو نەڕەی شێرێک بوو کە لە خەمی بوولبوول و مەست بوو بە وەسفکردنی کانییەکی ڕوونی بەر تریفەی مانگە شەودا..

بە مانایەکی تر، هەرچەندە دەنگی ئەو بەیادخەرەوەی تۆنە دەنگێکی نێرانە و باوکسالارانەیە، کە بەهۆیەوە شوناسی هۆز و عەشیرەت لە شێوەی (تێخوورپین، هەڕەشە و گوڕەشە و هاوارکردن)دا، بەرجەستە دەبێت، کەچی ناوەڕۆکی ئەم دەنگە لە هونەری دزەییدا، دەبێتە دەربڕی خودێکی جوانپەرست و ژندۆست و ئەڤیندار. هەر بۆیەش ئەو، هەمیشە لەلایەن کولتووری خێڵەکیی کوردییەوە، وەک نێرینەیەکی یاخی، کە لە یاساکانی هۆز هەڵگەڕاوەتەوە و ملکەچی ڕێنماییە عەشیرەییەکان نیە، دژایەتی کرا و بگرە سوکایەتی پێکراوە و هەوڵدراوە شوناسێکی نزمتری پێببەخشرێ لەوەی ئەندامانی دیکە شانازیی پێوە دەکەن.

بەمجۆرەش، ناوەڕۆکی یاخیگەرانە و جوانپەرستانەکەی هونەری دزەیی، هەیمەنە و دەسەڵاتی دەنگە نێرانەکەیان شاردەوە و دەنگەکەی بووە گوزەرگای پەڕینەوە بۆ شتێ لە خۆی گەورەتر و مرۆییتر و بووە بەرجەستەکەری سۆزێکی مۆدێرن، کە مرۆڤی نوێی شاری بەردەوام پێویستیی پێیەتی بۆ گەڕانەوە ناوخۆی و شکانی شەرمە عەشیرەییەکانی..

ئالێرەوە، ئەو نوێنەرایەتی لقێکی بەرزی هونەرێک دەکات، کە تیایدا دەنگی نێرانە، کارکردە کۆمەڵایەتیە توندڕەوانەکەی خۆی لەدەست دەدات و دەبێتە دەنگی پاڕانەوە لە یار و دەبێتە دەنگی ئەڤیندارییەکی مەزن، کە لە چوارچێوەی کاتدا، ژەنگ هەڵناهێنێ. دزەیی پرۆمیسۆسێکە، کە دەنگیی دەسەڵاتخوازانە و نێرسالارانەی

عەشیرەتەکەی و باوکسالاریی کولتووری کوردیی دزیی و بەخشیە جوانیی و ئەڤین و ئازاد و ڕەهای کرد. هەرکەسی تر بوایە لە جێی دزەیی لەو زەمان و هەلومەرجەدا کە ئەوی پێدا تێپەڕی، سەردەمی حەماسە و کوردایەتی و شۆڕشگێڕێتی، (بۆ ئەوەی لە هاوپیشەکانی جێ نەمێنی و شانازی بەخۆیەوە بکا)، ئیستا وڵاتی پڕکردبوو لە سروودی نیشتیمانیی ئێکسپایەر.

ئەمە یەکەمین شۆڕشی یاخیگەرانەی دزەییە، کە پێی گوتین، ئەو خاوەنی دەنگیی خۆیەتی و دەنگیی ئەو لە یادوەریی مندا بەیادهێنەرەوەی فۆرمێکی مۆدێرنیستانەیە، کە دەتوانم بڵێم ڕەگێکی لە شێوازە دەنگی ڕەفیق چالاکیشدا دەبیستینەوە، بەبێ ئەوەی چالاک توانبێتی خەسڵەتی مۆدێرنیستانە بەرجەستە بکات..

دووەمین خەسڵەتی دزەیی بریتیە لە بەرجەستەکردنی مەعشوق وەک ژن، نەک وەک میتافۆرەکانی ژن، چ نیشتیمان بێ و چ تێکۆشان و هەر شتێکی تر. ئەو باسی ژن دەکا، ماچی ژن دەکا و تامەزۆریی ژن دەکا وەکئەوەی ژنە، نەک ژن وەک سیمبوول و میتافۆر. هەر بۆیەشە کاتێ ژنان گوێ لە دزەیی دەگرن، هەستدەکەن باسی جوانی ئەوان دەکرێ و تامەزرۆیی و تاسەی ئەوان دەکرێ و منی نێرانەش ناسک و شاعیر دەکەنەوە.

بەرهەمەکانی دزەیی پڕن لەم ئاشتکردنەوەیەی سوژەی مێیایەتی و هونەر، بەبێ ئەوەی ژن وەک بابەتێکی خرۆشێنەر و سێکسی، یان پۆرنۆگرافیانە و وەک بابەتێک بۆ نێرینە بخرێتە ڕوو. بەبێ ئەوەی تۆنە دەنگییەکەی ئەو بەیادهێنەرەوەی فەرمان و هەڕەشەی پێگە کۆمەلایەتی و دەسەلاتەکەی نێرینە بێت لە ئاست مێینە و ژندا. دیاردەیەک کە لە کلیپەکانی ئێمەدا بەوپەڕی نەشارەزاییەوە بەرهەم دەهێنرێتەوە و ئەمەش خزمەتێکی زۆری بە زیندووکردنەوە و

بەرهەمهێنانەوە و نومایشدانەوە و بەرجەستەکردنەوەی بیرۆکە نێرسالارییەکانی کولتووری کوردیی کردووە.

ئەمرۆ ئێمە لەبەردەم لێشاوێک لە گۆرانیی و کلیپ و ملیپداین، کە هێندەی هەر بزووتنەوەیەکی ئایدیۆلۆژیی توندڕەو خزمەتیان بە پیرۆزکردنەوەی ئایدیاڵە نێرسالاری و ڕەگەزسالاریی و ئایینسالارییەکانی نێو کۆمەڵگای کوردی کردووە. زۆرینەی ئەو کلیپانە نەک هەر تەنیا جیاوازییەکانی نێوان نێر و مێ بەپێی بەرژەوەندیی کولتووری نێرسالاری، قووڵتر دەکەنەوە، بەڵکو پڕن لە دەستدرێژی زمانی و بینراو. من لە بۆنە و ئاهەنگگەلێکدا بەشداربووم، کە گۆرانیەکانی جگە لە ئیهانە و سووکایەتیکرن بە ڕەگەزی ژن لە ڕوانگە کولتووریە باوەکەوە، هیچ شتێکی ترم گوێ لێنەبووە. هەر بەو تۆنە دەنگییەی دزەیی، هەفتانە گوێمان لەو وتارانە و خوتبە سیاسیانە دەبێت، کە جگە لە بەیادهێنانەوەی تۆنە دەنگییە نێرانەکەی باوکسالاری و نێرسەروەری، بێرێزییەکی زۆریشیان تێدایە بەرامبەر بە مرۆڤ..

دزەیی دەگمەنە هونەرمەندێکە، نەکەوتۆتە ئەم زەلکاوی ڕەگەزسالارییەی پیاوی کوردەوە و لەبەرهەمەکانیدا جوانیی هێندەی ئەوەی بەیادخەرەوەی ڕەهەندیی ئێرۆتیکیانە و ئەڤیندارانەی ژنە، ئەوەندە خرۆشێنەر و هاندەری حەزەکانی نێرینە نیە بۆ بینینی ژن وەک بابەتێکی جەستەیی ڕووت. ئەم ئاشتکردنەوەیە و لە هەمان کاتدا دەستنیشانکردنە، بۆ خودی ژن، نەک بابەتی ژنانە، گەڕانەوەیەکی ڕاستەخۆیە بۆ ئەو بەشە، نەک هەمووی، لە ڕەسەنایەتی گۆرانیی و بەیت و حەیرانیی کوردی، کە تیایدا هەموو شتێ بەناوی خۆیەوە ناو دەبرێ نەک وەک ئاماژە بۆ شتێکی تر. هەموو شتێ لە ئاستە ئێرۆتیکیەکەیدا، نەک لە ئاستە سێکسیی و

جەستەییەکەیدا وەسفی دەکرێ.
لەگەڵ هونەری دزەییدا شوناسی ئێستاتیکیانەی ئێمە گۆڕانێکی بەرچاوی بەسەردا دێت و گوێچکەی ئێمە بە تۆنە دەنگێ ئاشنا دەبێ، کە بۆنی مرۆڤبوون و ئەڤینی لێدێت، نەک هەڕەشە و تووڕەیی باوکانە. ئەم پرۆمیسیۆسەی هونەر، فۆرمێکی ئێستاتیکیانەی یاخیبوونی بەرهەمهێنا بەبێ ئەوەی هیچ خوێنێ بڕێژێ و شۆڕش بەرپا بکا. ئێستاتیکایەک لە جوانیی مرۆڤ و ژن بەتایبەتی و جوانیی وشە، جوانیی دەنگ و میلۆدیی بەرهەمهێنا بۆ ئەوەی ژیان ڕەهەندیی جوانیناسانەی خۆی لەدەست نەدات..



## له بەغداوە بۆ کۆیە

# کاکە حەمەی مەلاکەریم:

هەتــا بۆ دوورترین یادەوەری هەرزەکاری و منداڵیم بڕوانم، ناوی کاکە حەمەی مەلاکەریمم بیر دەکەویتەوە. ناوی ئەو تەنانەت لەسەر ئەو کتێبانەش هەبوو، کە لە مزگەوتی دێی (بارێ بچووک)دا و لەسەر تاقێک، کە وێنەیەکی ئیمامی عەلی لەســەر هەڵواســرابوو. بەڵام بۆ یەکەمینجار لە ماڵی مامە غەفوور ئاغام، کە لە هەموو مامەکانی ترم خوێنــدەوار تر بوو، زیاتر ئــەو کتێبانەم چاوپێکەوتن، کە نەک هەر ناوی کاکە حەمەیان لەسەر بوو، بەڵکو بەناوی گەورەترین مرۆڤی ڕۆحانیی سەدەی بیستەمی کورد، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و مامۆســتا فاتیحی کوڕی، ڕازێنرابوونەوە. هەر ماڵێک ئەو کتێبانەی لێبوونا، پڕ دەبوو لە دانایی و وشە و خودا.

یەکــەم دیدارمان لە بەغدای هەشــتاکان بوو. ئەمــەم وەکو خەونی هەرزەکارێــک لە بیــرە کە بڕوای نەدەکرد حەمــەی مەلا کەریم بە چــاوی خۆی ببینــێ و ئەوەندەش پیاوێکی ســاکار و ســنگفراوان

بێت. من چووبووم بۆ وەرگرتنی پاداشـــتی وتارێکم، لەسەر ڕۆمان و گرنگییەکـــەی بـــۆ کورد، کە لە وەڵامی وتارێکی مامۆســـتا کەمال غەمباردا نوسیبووم. هێشتا لەوێ بووم کە هەواڵیان دامێ شیعرێکم کراوەتـــە عەرەبـــێ و بڵاویش کراوەتـــەوە. ئەمەیان لـــە وەرگێڕانی کاک موکـــەڕەم ڕەشـــید تاڵەبانیی بوو، یان مامۆســـتا عەبدوڕەزاق بیمار. تەواو دڵنیا نیم. بەڵام چونەکەمی بۆ بەغدا کردە شایی و دڵم خـــۆش بوو. وا بزانم لـــە ڕۆژنامەی هاوکاری بوو، یان لەو نزیکانە بـــە خزمـــەت کاکە حەمە گەیشـــتم. ئەویش لە پاشـــکۆی ڕۆژنامەی (العـــراق) شـــیعرێکی منی خوێندبۆوە و ناســـیمییەوە. گرنگیی پێدام و لەگـــەڵ خۆی بردمی بـــۆ بارەگای کۆڕی زانیاری، بۆ ژوورەکەی خـــۆی و لـــەوێ شـــتێکی هەڵگـــرت کە دەبـــوو بینێـــرێ وا بزانم بۆ عەبدوڵاپەشێوی شاعیر. کە لە بارەگای کۆڕ هاتینە دەر، هەستمکرد دەبێت لە گەڵیدا ڕاکەم، بەدەم ڕاکردنیشەوە بۆ گەیشتن بەو پاسەی کـــە ئێمەی پێدەڕۆیشـــتین، ئاوڕیـــی لێدامەوە و بلیتێکـــی پێدام. ئاوا یەکەمین دیداری من و مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم دەستپێکرد. کە مرۆڤێک بوو زۆر لە ناوبانگی خۆی دڵگەورەتر و ســـنگفراوانتر و هەرواش مایەوە..

لە دوای بەجێهێشـــتنی کوردســـتان، کاتێ لە ســـاڵی ١٩٩١دا، بەشی یەکەمـــی (کتێبـــی نالی)م بە ناوی (چەمکـــی میتۆلۆژیا و جیهانبینیی نالی) لە دانمارک بڵاو کردەوە، نازانم چۆن کاکە حەمە نوسخەیەکی بەدەست گەیشتبوو، یان هەر لە دوورەوە بۆیان باسکردبوو، بەڵام نامەیەکی شـــیرینی بۆ نووسیبووم و ڕەزامەندیی خۆی دەربڕیبوو لەسەر ناوەڕۆکیی کتێبەکە. پێموایە ئەو نامەیەم لە ڕێگەی مامۆستا فەرهاد شـــاکەلییەوە بەدەست گەیشـــت، کە بۆخۆیشی پیاوێک بوو زۆر پێمـــەوە مانـــدوو بوو و دەستخۆشـــیی لێدەکردم و لە ســـوید

هەمیشــە لە ماڵی خۆی میوانداریی دەکردم. ئەمەیان باسێکی ترەو بێگومان لە شوێنێکی تردا دەگەڕێمەوە سەری..

نامەکەی کاکە حەمە، لەوێنەی سرووشــێک بوو لە ســەحرادا. ئەوە هەر نامەیەکی ئاســایی نەبوو، بەڵکو لە کەســێکەوە بوو لە خزمەت مامۆستای مودەڕڕیس و کاک فاتیحدا، زۆرترین بەشداریی کردبوو لە زیندووکردنەوە و ساخکردنەوە و نوێکردنەوەی ڕێنووسی دیوانی شــاعیرە کلاسیکەکانی وەک نالی و مەحوی و مەولەوی و گەلێکی تر. نەوەی ئێمە لە دوو توێی ئەو تەفســیر و لێدانەوانەی ئەوانەوە ئاشنابووینەوە بە میراتی ڕۆحیی خۆمان و ئەمەش یاریدەی دابن تا ســەر لەنوێ لە هزری پێکهێنانەوەی شوناسیی مرۆیی و نەتەوەیی خۆماندا بین. تەنیا دانمارک و تەنیایی پەلکێشی ناو جیهانی نالییان کــردم و تەنیا ئەو نامەیــەی کاکەحەمەش دڵنیای کردمەوە، کە بەو بچکۆلەییەی خۆمەوە، دەستمداوەتە کارێکی گەورە.

دوای گەڕانــەوەم لــە دانمــارک، ســـەرەتای ســاڵانی دوو هــەزار، کاکــە حەمەم لــە ئاکرێ بینییــەوە و بەخزمەتی گەیشــتم. ئەمەش لە گەشــتێکدا بوو کە وەزارەتی ڕۆشــنبیریی هەرێمی کوردســـتان و یەکێتی نووســەران بەهاوکاریی ســەنتەری ڕۆشــنبیریی ئاکرێ، ڕێکیخســتبوو. لەو گەشــتەدا، کە دەبوو بەشــێکی بە پیادە بڕۆین، مــن ســەرقاڵی ســەرنجدان بووم لــە دیمەنە جوانەکانــی ئاکرێ و ئەمبەراوبەری، کە هێندەم نەزانی لە پێشمەوە، پیاوێک بە هێواشیی ڕووەو هــەورازی بازاڕی ســەرەوە ملی دەنا و ڕێــک لەو جێیەی فرۆشیارەکان لە قەراخ شەقامەکە، بەرهەمە خۆماڵییەکانیان لەسەر ســندووق و نانەشــانە و قرتاڵــە دانابوون، مامۆســتا کاکە حەمەم ناســییەوە. لە سـنگفراوانی و ڕێــز و خاکەڕاییدا، هیــچ نەگۆڕابوو، بەڵام لە چاو ئەوەی لە بەغدا پێش ئەوەندە ساڵ چۆن لە پێشمەوە

ڕایدەکرد تا بە پاسەکان بگات و ئەمێستاش گۆچانێک بە دەستەوە، لە جەبری زەمانە تێگەیشتم. بۆیە پێشنیارم لە خزمەتیا کرد، کە بچین و لە چاخانەیەک دابنیشین. نازانم چەندەش لەوێ ماینەوە، بەڵام زۆرترینی کاتەکە ئەو پرسیاری لێدەکردم و من بەدەم وەڵامدانەوەوە سەرنجیم دەدا و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئەمە ئەو پیاوەیە کە لە زیندان و ئازادی و لە خانەقاوە بۆ کۆڕی زانیاریی، بۆ ئێمەی نوسیوە. سەرم دەسووڕما لە توانای مرۆڤێک، کە ساڵەهابوو قەڵەم و زمانی نووسینی بۆ ڕۆشنگەری و ساخکردنەوە و ڕەخنە و توێژینەوە تەرخانکردبوو. ئەمە ئەو پیاوە بوو کە لە هۆشی مینە و ماوتسی تۆنگەوە بۆ حاجی قادری کۆیی و نالی و مەحوی و چەندانی تر، کاری کردبوو. ئەمە هەر ئەو مرۆڤەش بوو کە پێشەکیی چەندین کتێب و نامیلکەی بە وشەکانی خۆی ڕازاندبۆوە و لانیکەم لەلای من، خۆشەویستیی کردبوون. پێشەکییەکەی بۆ چامەی ناڵەی جودایی مامۆستا هێمن و هەروەها دیوانی گۆران، بەڵگەی ئەم قسەیەن..

بۆ من، کاکە حەمە لەوەتەی هەیە شەش خەسڵەتی لە کەسایەتی خۆیدا بەرجەستە کردووە: یەکەمیان ئەو ڕێزە زۆرەی لە کەسایەتیدا هەیەتی و بەرزگرتنی کەسانیتر و سنگفراوانییەکەی، بەڵام لە هەمان کاتیشدا مشتومڕی ئەدەبی و نووسینی لەگەڵ زۆرێک لە کەسانی هاوتەمەنی خۆیدا کردووە، بەبێ ئەوەی سنوورەکە ببەزێنێ و هەر ئەمەش وایکردووە کە نەیارەکانیشی، ڕێزی لێبگرن..

دووەمیان، بریتیە لە کوردایەتیەکەی و قۆشمەییەکەی، کە لێرەدا وشەی قۆشمەیی لە جیاتی وشەی ئایرۆنیک (Ironic)، بەکار دەهێنم. کەسایەتی ئایرۆنیک، کەسایەتییەکی خۆگرە لەبەردەم ناخۆشییەکانی ژیان و دەسەڵاتی وەختدا. من لە مێژە دەزانم ئەم

پیاوە کانگایەکی دەوڵەمەند و پڕی نوکتەبازی و خۆشسەلیقەییە و توانایەکی سەرسووڕهێنەری هەیە لە هەڵگێراندنەوەی ساتەوەختە تراژیدییەکان، بە ساتەوەختی کۆمیدی و گاڵتەجاڕانە بۆ بەرگەگرتنی ناخۆشییەکانی ژیان و مانەوە لە پێناوی بەردەوامییدا. بێگومان، تێکەڵیی ئەو بە جیهانی ڕەسەنی خانەقای کوردەواری و کۆڕی فەقێ و مەلایان، لەمەدا بێکاریگەر نەبووە.
سێیەمیان: بەردەوامیی ئەو لە نووسیندا، ئەوەش بە درێژایی ساڵەکان و لە سایەی جۆرەکانی سانسۆر و لێپێچینەوەدا. کاکە حەمە، هەمیشە وەک مامۆستایەکی نووسین و خاوەن ستایلێکی تایبەتی داڕشتن و پەخشان مایەوە، کە ناسینەوەی ئاسانە و پڕە لە دەوڵەمەندیی و وشەئارایی و وردبینی جوان، کە هەندێجاریش جێگەی سەرسووڕمانە.
چوارەم: وەفاداریی بۆ باوکی: ئەو پیاوەی وەک تاکەکەس ناوێک بوو: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، بەڵام لە ڕووی مەعنەوییەوە مرۆڤێک بوو سەدەی نۆزدەی کولتووری مەعنەوی کوردی بەستەوە بە سەدەی بیستەمەوە و ڕۆشنبیریی ئایینی ئەوەندە تێکەڵ کرد بە ڕۆشنبیری و شوناسیی نەتەوەیی، کە پێشتر نمونەکانی مەگەر لەلای مەلای جەزیری و نەورەسی و حاجی کاک ئەحمەدی شێخ، ببینینەوە. ئەو «درەوشانەوەیەک بوو لەناو تاریکەسەلاتدا» و مرۆڤە بوێرەکەی ناو ئەشکەوتی ئەفلاتوونیی دنیای ئێمەبوو، کە توانیی ڕۆشنیایی ڕاستەقینەی کوردبوون و بڕواداریی ئایینیی بدۆزێتەوە. کاکە حەمە، لەسەردەمی بێوەفایی بۆ باوک و چاخی باوککوژیی کوردەکاندا، وەک دڵسۆزێکی باوکی ڕەفتاری کرد و هەمیشە وەک کوڕە بچکۆلە و وەفادارەکەی ئەم پیاوە مایەوە.
پێنجەم: پابەندبوونی بە تێگەیشتنی «زانستیانە» لە جیهان، کە ئەم

تێگەیشتنە زانستیانەیە بۆ کاکە حەمە و هاوبیران و هاوچاخەکانی، زیاتر مانایەکی چەپیانەی هەبوو، نەک زانست بە مانا پیشەیی و پسپۆڕییەکەی. کاکە حەمە لەبەرەی ئەو نەوەیەی نووسەر و ڕۆشنبیرانی ئێمەیە، کە هەمیشە وەها جیهانبینی و ڕووئیای خۆیان دەخستە ڕوو، کە نایانەوێت بچنە بەرەی کۆنەپەرستی و ئیمپریالیزم و سەرمایەدارییەتەوە. ئەم خستنەڕووە، بە پێویست ئەوانی نەدەخستە ڕۆشنبیرانی چەپی دۆگماییەوە، بەڵام بۆ ئەوان وشەی «زانستی و بەرەی زانستی و بیری زانستی»، زیاتر میتافۆرێک بوو بۆ شاردنەوە و ناونەهێنانی بەرەی چەپ و مارکسیزم و تەنانەت لینینیزمیش، وەک بیرمەندانێک کە لەسەردەمی شەڕی ساردا بە سەنگەری بەرگریکردن لە هەژاران و بەرەی پڕۆلیتاریا حسابیان بۆ دەکرا.

خەسڵەتی شەشەم، لە کەسایەتی کاکە حەمەدا بۆ من پرسیارێکە: ئایا ئەو نەریتخوازە یان مۆدێرنیست؟ یان تێکەڵێکە لە هەردووکیان؟ نووسینەکانی ئەم مرۆڤە پڕکارە، زۆر و جۆربەجۆن، چ لە ڕووی بابەتەکانیانەوە و چ لە ڕووی شێواز و ژانریی ئەدەبییەوە. کاکە حەمە پڕە لە بابەتی نەریتخوازیی ڕۆشنبیریی کۆنی کورد و لە هەمان کاتیشدا هەمیشە چاوێکی لە فۆرمە ئەدەبییە مۆدێرنیستیەکان بووە. ئەو کاتێکی زۆری بەدیار کەشکۆڵ و دەستنووس و سیپارەی کۆنەوە بەسەر بردووە و لە هەمان کاتیشدا وەرگێڕی پۆشکین و دنەدەری شیعری نوێ کلاسیکی کوردییە، وەکئەوەی لە لای هێمن موکریانی دەیبینین. کاتێک (پووشکین)ەکەی بڵاو بۆوە، بە بڕوای من ئەمە ڕووداوێک بوو لە بواری وەرگێڕاندا بۆسەر زمانەکەمان. نوسینەکانی پڕن لە ناوی کەڵە نووسەری مۆدێرن و لە زۆرینەی بەرهەمەکانیدا ناوی چەندین نوسەر و دانا دەبینرێنەوە، کە پێشڕەو

بوون لە ئەدەبیات و جیهانی مۆدیرندا، چ لە ئەورووپا و چ لە یەکێتی سۆڤێتی جاران. ئەمەش لەپاڵ ئەو ئاوڕدانەوە بەردەوامانەی بۆ شیعری شاعیرانی لەبیرکراوی کورد، تا ئەو پەڕی ناودارانیان. کاکە حەمە، وەک هاوتەمەن و هاوخەمەکانی خۆی، دەیانویست بە نووسین و ڕۆشنبیری، هەم پردێک لەدەرەوە بۆ ناو دنیای ئێمە دروست بکەن و هەم لەناوەوەیش ڕۆشنبیری کوردیی بینا و نوێ بکەنەوە.

من ئیتر بە خزمەتی نەگەیشتمەوە. تا ئەو ڕۆژەی لە کۆیەی حاجی قادری نەمر، من کۆڕێکم لەسەر چەمکی کات لە شیعری حاجیدا پێشکەش کرد. پاشان چووین پەردە لەسەر پەیکەری سێوەی هونەرمەند لابدەین. هەمووجارێ کە بەوێدا تێپەڕ دەبمەوە، لەلای پەیکەرەکەی (سێوە)وە، مامۆستایەکی هەرە گەورەی بواری نووسینی کوردیشم بیر دەکەوێتەوە: حەمەی مەلا کەریم. وەکخۆی بەڕێز، دڵسۆز و پڕکار و سادە و سنگفراوان..

٢٠١١



منداڵییەکی نەمر لەسەردەمی ڕقدا..

**لەتیف هەڵمەت:**

سەرەتا لە ڕێگەی بەرهەمەکانییەوە بۆ منداڵان، لە تیف هەڵمەتم ناسی و کاریگەرییەکی زۆری لەسەر دانام. هەرگیز نەمبینیبوو، سرووشتیم نەدەزانی و نائاشنا بە سیمای. لەگەڵ ئەوەشدا ئەدەبەکەی، لەو قۆناغە زووەی منداڵیمدا، کە تازە لە لادێوە هاتبووینە شار، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر دنیای ناخەکیی من، دانا و لە پێگەیشتن و بیناکردنەوەی مەعنەویاتی ڕووخاومدا، بێکاریگەر نەبووە، ئەگەرچی ئەمە شتێک بوو پاشتر لێی تێگەیشتم. هەرچەندە هەر لەو کاتەوە، کەمێک لێی وەڕس بووم کە لە جیاتی ئەوەی باسی منداڵانی وەک من مەحرووم و دێ سووتاو و منداڵیی لەدەستداو بکات، زیاتر باسی منداڵ و خەڵکی فەلەستین و شوێنەکانیتری دەکرد. کاتێکی زۆری ویست، تا لە زمانی ناڕاستەوخۆی ئەدەب بە گشتی و زمانی ناڕاستەوخۆی شیعری لەتیف هەڵمەت تێبگەم. بەڵام ئەو شاعیرێک بوو، زۆر لە ژیانمدا مایەوە: لەگەڵم بوو بۆ ئێران و

لە ژێر بۆردوومانی گوندەکانی سەر سنوور و لە ژیانی ئاوارەیی و پاشان لە سوریا، لە مەساکین بەرزەی شام و دواجار لەگەڵم هات بۆ سکەندناڤیا و لەوێشەوە پێکڕا هاتینەوە بۆ کوردستان. من باسیی منداڵی خۆم دەکەم، بەشێک لە منداڵیم کە هەمیشە لە ڕێگەی شیعرەکانی هەڵمەتەوە، بیرم هاتۆتەوە و لە ونبوون و پەرتەوازەیی و پەشۆکان ڕزگاریی بووە.
ئەو لەو شاعیرانەیە کە دەکرێ بە شاعیری فرە ڕەهەند ناویان ببەین، بەبێ ئەوەی پێویستییان بە خۆ مانیفێستکردن و خۆبەرجەستەکردن و خۆ زەقکردنەوە هەبێت. هەڵمەت هەمیشە لە شیعرەکانیدا بۆ من شاعیرتربووە، وەک لە نوسین و مانیڤێست و گفتوگۆکانیدا لەسەر شیعر. ئەو شاعیری دیدگاگۆڕینی مرۆڤ و سەرنجڕاکێشانێتی بۆ زۆر شتی تایبەت، کە مرۆڤ لە ژیانی ئاسایی و بە چاوی خۆی بەوجۆرە نایانبینێ. هەڵمەت بە ئاگابوون لە ڕاستییەک، یان نهێنیی و ڕازێک، لەو دیو ژیان و ئەزموونی مرۆییەوە، سەرنجمان پەلکێشی جیهانە شیعرییەکەی دەکات، کە پڕە لە ساتەوەختی سەرسووڕمان و کەشفکردن. ئەمەش ئەو شتەیە کە هەندێک بە تەسەووف لەلای هەڵمەت پێناسەی دەکەن. بە بڕوای من لەمەدا جۆرێ لە چوارچێوە و لە قاڵبدان هەیە، کە بۆخۆشی ڕۆڵی لەو وێناکردن و لە چوارچێوەدانەی شیعرەکانیدا هەیە. شیعر بەدەر نیە لە ساتەوەختی سۆفیانە، بەڵام مەرج نیە سلوکی شاعیر، یان ئامانجی شیعریانەی شاعیر، سۆفیانە بێت. ئەوەی لەتیف هەڵمەت لە فەزای سۆفیانە نزیکدەخاتەوە، هەوڵدانی ئەوە بۆ بەیانکردنی ڕاز و نهێنییەک، کە لە قووڵاییەکانی ئیدراکی مرۆییدا، پاش ئەزموونێکی زۆری هەستەکی لە ژیاندا، دەمێنێتەوە و پۆنگ دەخواتەوە و دواجار دەیەوێ خۆی بەرجەستە بکات لە زماندا بە پەنابردن بۆ دەستەواژە

و چەمک و گوزارەی ئەوتۆ، کە لە بەرجەستەکردنی زمانی سۆفیانە و عاریفانیشدا گرنگیی خۆیانیان هەیە:

مرۆڤ لە زەوی بێزار دەبێ
دەڕوا بۆ لای خوا
دەبێ بە ئەستێرە و
شەوان لە دوورەوە
تەماشای
ماڵەکەی جارانی دەکا..

هەڵمەت ئەو زاتەیە کە من هەستدەکەم هەمیشە پۆنگیی خواردۆتەوە بەبێ ئەوەی ئەم پۆنگخواردنەوەیە ببێتە مایەی بۆنناخۆشی. چونکە یەکێک لە بەدئەنجامییەکانی پۆنگخواردنەوە، بۆگەن کردنە و لە نەوەی هەڵمەتیشدا ئەو جۆرە شاعیرانەمان هەن، کە بەرهەمە شیعرییە کۆن و سەرەتاییەکانیان زۆر شاعیرانەترن لە بەرهەمە یەکبەدوای یەکەکانیاندا، کە ئیتر بەرامەی شیعرییان لەدەست داوە.

من ڕاشکاوم: لە شیعردا، وەستان شەرافەتمەندانەترە، لە بەردوامیی و پۆنگخواردنەوە لە جوغز و گۆشەنیگایەکی وەستاودا، کەم بەرهەمی شۆخترە لە بەرهەمزۆریی بێتوانا بۆ خستنەوەی جیاوازیی و فرە ڕەنگی. ئەو شاعیرانەی منداڵیی خۆیان زوو بە جێدەهێڵن، شیعر دەکەنە ئامرازێک بۆ بەردەوامبوون لە پێناوی مەبەستی دیکەی نا شیعریدا. ئەو شاعیرانەی بەردەوام منداڵیی خۆیان دەژین، هەمیشە شیعریان جیاواز، تەنانەت ئەگەر ئیتر لە نووسین بوەستن. لە کەسایەتیی هەڵمەتدا، هەمیشە منداڵییەکی ڕامنەکراو، نائارام و مەحرووم هەیە، کە جارێ لاسار و وڕکگرە و جارێ ئارام و سەلار. ئەو وەفادارێکی هەمیشەیی منداڵییەکانێتی و شیعری ئەو، لە

نێوان ئەم دوو ڕەهەندەدا دێت و دەچێت و کارنامەکەشــی گەواهی ئەم خوێندنەوەیە دەدات. ئەو دوو جۆر بەرهەمی نووســیوە: شیعر بۆ منداڵان و شــیعر بۆ گەورەساڵان: بەڵام لە هەردووکیاندا ڕۆحی منداڵێکــی گەورەتەبووی بێســنوور هووشــیار و دانــا هەیە، کە لە وێناکردنە باوە مرۆییەکانەوە بیر لە نیشتیمان ناکاتەوە:

من دێمە ناو دڵی تۆوە
تۆش وەرە دڵی منەوە
ئیتر پێویست بەوە ناکات،
ماڵمان هەبێ یا نیشتیمان..

لەبارەی هەڵمەتەوە زۆر شــتم بیســتووە و بیســتبوو. پێش ئەوەی بیبینم بە پیاوێکی چوارشانەی وەک دەنگی ناو شیعرەکانیم دەهێنایە پێشــچاوی خۆم، کە چــۆن بە گژ نایەکســانیی و دەســەڵاتەکانیدا دەچێتەوە. ئەو شیعرێکی هەیە بە بڕوای من بە تەنیا فێرگەیەکە:

با پاشاکان گوێ ڕابگرن
شاعیرێک دەیهەوێ بدوێ
با ڕەشەباکان ڕاوەستن
نێرگزێک دەیهەوێ بڕوێ
با تفەنگەکان بێدەنگ بن،
مناڵێک دەیهەوێ بنوێ..

کاتێک بینیم، ئەوم وەک چڵە وەنەوشەیەکی خامۆش هاتە پێشچاو، کە گۆران وەســفی دەکا بە خامۆشییەک لە ژێر سێبەری تووترِکا. شــوێنەکە شەقامی سابوونکەران و کاتەکەش هەنگامەی ڕەشەبای بەعس بوو لە ســەرەتای هەشتاکاندا. ئەو بە شکۆیەکی بێدەنگەوە، لە کتێبخانەی ئەوقافی جاران دەهاتە خوارەوە و منیش لە وێستگەی

پاسە پۆلۆنییەکانی ئێستا، شووتییەکی کەمێک لە خۆم بچووکتر بە باوەشـــەوە و چاوەڕوانیـــی پاس بووم بمباتەوە بـــۆ تووی مەلیک. ئەوســـا بەدیدی مندالانەم تووی مەلیک بریتیبوو لە: ئەوپەڕی دنیا. ڕەنگە تەنیا بەو وزەیەی لە بیرکردنەوەم لە شـــیعرە منالانەییەکانی هەلمەتـــەوە بـــۆم دەهات، توانیبێتـــم ئەو شـــووتیە گەورەیە ببمەوە مال!

هەتا لە کوردستان بووم، هەلمەتم بە قسە نەبینی و لە هیچ کۆڕێکیدا دەرفەتـــی بەشـــداریکردنم نەبوو. بەلام تەنیا دوایئـــەوەی لە ئەوروپا گەڕامەوە، بۆ یەکەمجار لەو شـــوێنەی ئێســـتا باخچەی (نالی)یە، بە خزمەتی گەیشـــتم و ویستم خۆمی پێبناسێنم. کەچی ئەو ماچیکردم و وەک ناســـیاوێکی لە مێژینە باوەشـــی پێداکـــردم. وێڕای ئەوەش کـــە، من هەرگیـــز ئەوەندە لە هەلمەت نزیک نەبـــووم، بەلام هەتا لە ولات بووم و دوای گەڕانەوەشم، لە ڕێگەی مامۆستا عەبدولا تاهیر بەرزنجییـــەوە، هەوالی هەلمەتی مامۆســـتام دەزانی. ئەوان هاوڕێی دێرینەی یەکتر و نمونەی وەفادارین، کە یەکەمیان ناڕاســـتە و خۆ و دووەمیـــان ڕاســـتەوخۆ، کاریگەریی لەســـەر ئاراســـتەوەرگرتنی ئەدەبیانەی من هەبووە. ئەم چیرۆکەش هەلدەگرم بۆ دەرفەتێکیتر.



ئەستێرەکی دوور،
درەوشانەوەیەکی نزیک..
**جەمال نەبەز:**

پێش ئەوەی بچمە ناو دنیای ڕۆشنبیرییەوە، ناوی مامۆستا جەمال نەبەزم بەرگوێ کەوتووە و کاتێکیش چوومە ئەو دنیایەوە، کە هەمیشە سیاسیانە و نائومێدانە بووە، بە ناچاری و لە پێویستییەوە، یەکێک لەو کەسایەتیانەی خۆمم لەبەردەمدا بینیوەتەوە، ئەم مرۆڤەیە. ڕەنگە ئەمەش ڕێکەوتی کاتێکی کردبێ، کە ئەو لەمێژ بووبێ، بە قۆناغی دوورخرانەوە جەبرییەکانی بۆ ناوچە بیابانەکانی خوارووی عێراق، ئەزموونی دووزخرانەوەی ناچارەکی باوباپیرە کوردەکانی پێشخۆی دووبارە کردبێتەوە و سالانێکی لە زیندانەکانی حکومەتگەلی عێراقدا، بەسەر بردبێت و ئەزموون کردبێ. بەمجۆرەش، نەوەی من، کاتێ بەم مرۆڤە ئاشنا دەبێت، کە ئەو لە زۆر ڕووەوە بەسەر جەنگەڵ و ڕووبارەکانی نەهامەتیی کوردبووندا پەڕیوەتەوە و هێشتاکەش کۆڵی نەدابێت، بۆ ئەوەی ڕۆحی پێشینەکان و باوباپیرە کوردەکانی خۆی نائومێد نەکات.

پاشانیش لە هەشتاکاندا یەکەمین ئاشنایەتییەکانم لەگەڵ کتێبەکانیدا پەیداکرد و پاشتریش بۆم دەرکەوت کە یەکێکە لە توێژەرە هەر چالاک و داناکان بە زمانی کوردی، بە تایبەتی لە بواری زمان و زاراوەکان، مێـژوو و کولتوورناسـیی و لەناو ئەوانەشـدا، ئایینزاناسـییەکانی ناوچـەی کوردسـتانی گـەورە. کتێبە فیکـری و سیاسیەکانیشـی بەجێـی خۆی، کە هەمیشـە تیایانـدا وەک داکۆکیکەرێکـی بوێر و زانا بە پرۆسەی دروسـتبوونی نەتەوەیی کورد و قۆناغەکانی ئەو مێژووە، خۆی بەرجەسـتە کردووە. ئەمە جگە لە ئەدەبیاتی نامە و بیرخسـتنەوە و بەیاننامەکانی، کە وەک دەستەودامانبوون و تکا و پاڕانەوەی لە سیاسەتمەدارانی کوردی کۆن و نوێ، نووسیونی، بۆ خۆبەدورگرتنیان لەهەر جۆرە دووبارەکردنەوەیەکی ئەو هەڵانەی، کـە لە مێژوودا کوردیان پێوە ناسـراوە، وەک هەل لەدەسـتدان و هاوپەیمانێتـی نابەجێ و خۆخۆری و ڕقی خێڵەکیانە و ناوچەچێتی و دەسـتهەڵگرتن لـە مافەکانـی خۆمان بۆ ڕازییکردنـی ئەوانیتر و شـەرمنیی سیاسـی و خۆ بە سـووننە و شـیعە و فارس و تورک و عەرەب و عێراقی لە قەڵەمدان، زیاتر لەوەی سـوونە و شـیعە و فارس و تورک و عەرەب و عێراقییەکان، خۆیان هەن.

ئەو زانایەکی مەزنە، چ وەک سـنگفراوانیی زانسـتیی و بەخشـینی بەردەوام، چونکە سـنگفراوانی و بەخشین، ئەخلاقێکی زانستیانەیە، چ وەک شـارەزا بـەو بابەتانەی کاری لەسـەر کـردوون لە بواری سیاسـەت و مێژوودا. نامیلکەیەکی هەیە لەسەر ئەفسانەی کوردی، بۆخۆی شاکارێکە، من چەندجارێکم خوێندۆتەوە و سەرسام بووم بە شێوازی شییکردنەوەکانی لە بواری توێژینەوە و ڕەچەڵەکناسیی پێشئەقلانیی هزری کوردەکاندا. زمانی یەکگرتووەکەیشی شاکارێکی تـرە و هەر خوێنەر و توێژەرێک لە پرۆسـەی خۆدروسـتکردن و

خۆناسینی خۆیدا، پێویستیی بە خوێندنەوەیان هەیە. ئەو جگە لە کاراکتەرە مەعنەویەکەی لە بواری ڕۆشنبیریی و هزرین بە زمانی کوردی، هەمیشە و لە هەموو قۆناغەکان و لەگەڵ هەموو کێشە مرۆیی و سیاسی و نەتەوایەتیەکاندا، ڕۆڵی بیرمەندێکی لە شرۆڤەی سیاسی و مێژووییدا بینیوە و داکۆکیکەرێکی هەمیشەیی بووە لە ئاست ئەو زوڵمانەی لە کورد و مرۆیبوونەکەی کراون.

مامۆستا نەبەز، بەردەوام بە بۆچوونە مێژووییەکانی و توانا سەرسامکەرەکەی بۆ شییکردنەوە و پێکەوە بەستنەوەی ڕووداوەکان لە ئاستی هاوکاتی و مێژووییاندا، زەخیرەیەکی گەورەی بۆ کوردەکان خستووە تا لە ڕێگەیەوە بەرگریی لە مەزلوومیەتی خۆیان بکەن. پرۆسەی چێکردنی شوناس، بەرجەستەکردنی کەسایەتی کورد، زمانەکەی، کاراکتەری سیاسی و مرۆیی، لەلای ئەم زانا بیرمەندە، بە توێژینەوەیەکی مێژووییدا تێپەڕ دەبێت، کە کەمترین پەرچەکرداری پێوەدیارە و کردەی بیرکردنەوە، خستنەڕووی فاکت و داتای مێژوویی، ئەو فیلتەرانەن کە ئەو لە میانەیاندا باسی مافی کوردەکان دەکات. کوردبوون لەلای ئەو، بوونێکی چالاکە و بوونێکە لە ژێر چەپۆک و چەوسانەوەدا، بۆیە چالاکییەکەی زۆرجار پێویستی بە داکۆکیکردن و ڕەواندنەوەی تەم و غوباری ناحەزان هەیە، کە لە میانەی مێژوودا ویستویانە نغرۆی بکەن. بۆیە کوردبوون لە بیری ئەودا کەمتر نیە لە مرۆڤبوون لە بەرگی هەر جۆرێکی دیکەی شوناسی نەتەوەییدا. جەمال نەبەز، بە پێچەوانەی هاوتەمەنەکانی خۆیەوە، لە سیاسەتی پراکیتکیدا، هەرگیز خۆبەکەمزانی و شەرمنیی سیاسی نەکردە پیشەی. هەرگیز بۆ ڕازییکردنی ئەوانیتر، پاشەکشەی لە دواکاریی بۆ مافی کوردەکان نەکرد. هەرگیز کەمێ نەچووە دواوە بۆ ئەوەی ئەوانیتر

بهێنێتــە پێشــەوە و هەگیزیش بۆ داکۆکیکردن لــە کوردبوونەکەی نەکەوتە غەدر و تۆمەت هەڵبەســتن بۆ ئەوانیتر و لە هەموویشــی گرنگتر: هەرگیز خۆی بچووک نەکردەوە بۆ ئەوەی ئەوانیتر لەخۆی گەورەتر بکات.

بەڵام بەداخەوە، لەگەڵ ئەم هەوڵە بەردەوام و زۆرانەشدا کە قەڵەم و هــزری ئەم مرۆڤە بەتوانایە بەرهەمی هێنــاون، زۆر بە دەگمەن نەبێــت گوێی بۆ نەگیراوە و گوێی لێنەگیــراوە، بەتایبەتی لە کایەی سیاســیی کوردیدا، کــە بێگومان ئەوەش بێئاگایی، یــان کەمئاگایی ئــەم کایە سیاســیە لــە ناوەڕۆکــی بەرهــەم و بۆچوونەکانی ئەو، دەسەلمێنێ.

ڕەنگــە دووریی ئەو لە واقیعی کوردســتان، ڕەتکردنەوەی بۆ هەر پۆســت و ئیمتیازێک، یان هەر بەڵگەیەکــی دیکەی نەزانراو، کە من نازانم چین، لە پشــت ئەم فەرامۆشــکارییەوە بن، بەڵام بوونی ئەو لــە نزیکایەتــی پنتەکانی دەســەڵات و بەشــداریی لــە گەڵاڵەکردنی بۆچوونێکــی کوردیانــە و مێژووییانــە لە ئاســت ڕووداوەکاندا، بە تونــدی هەســتیپێدەکرێت. مامۆســتا نەبــەز، بەو پیــوارە (غیابەی) بۆشــاییەکی گەورەی لە فیکری سیاسی، بە تایبەتمەندیی کوردیانە و بــە لەبەرچاوگرتنــی ڕەهەندیــی مێژوویی و کولتووریی کێشــە سیاســیەکان، چ لــە ڕووی پراکتیکــی و چ لــەڕووی تیۆرییــەوە دروستکردووە.

مــن یەکجار لــە کۆپنهاگن، لە ســەرەتای نەوەدەکانــدا بە خزمەتی گەیشــتووم، کراســێکی نیوقۆڵــی گوڵگوڵی ڕەنگ شــینی لەبەردا بوو، دەنگێکی ڕوون و تۆنێکی خۆشــی قســەکردن. ئەو یەک جارە بــەس بــوو، هەگیز ئەم مرۆڤــەم بیر نەچێتەوە، ئەگەرچی بە قســە نەیگەیشــتمێ. بۆ گەنجێک لە ئەوســای تەمەنی منــدا، گەر بیەوێت

مامۆستا جەمال نەبەز وەک توێژەرێکی ناوازە بناسێت، پێویستە کتێبەکانی لەمەڕ زمانی یەکگرتوو، توێژینەوەکانی لەسەر ئاییزاکان و ئەفسانەناسییەکەی و ئەو نامیلکەیەی لەسەر قۆناغی ژیانی لە کەرکووک، بخوێنێتەوە.

هەرچەندە ئەو لە ڕووی تەمەنەوە، نابێت گلەیی لە ڕۆژگار بکات، کە نزیکیی خستۆتەوە لە تەمەنی نووح، (چونکە نزیکبوونەوەی مرۆڤی کورد لە حەفتا ساڵی، بۆخۆی تەمەنێکی نووحیانەیە)، بەڵام ئەو بە بەرهەم و کارەکانی، وەڵامی ڕۆژگاری داوەتەوە و هەرگیز مرۆڤێکی مشەخۆر نەبووە بەسەر مێژوو و سەردەمەکەی و مرۆڤایەتیەوە. ئەم ئەستێرەیە هەرچەندە لە ئاسمانی غەریبایەتی تاراوگە بووە، بەڵام درەوشانەوەی ڕاستەقینەی لە ئاسمانی کوردستاندایە.

٢٠١٢



من نازانم **(زامدار)**
ئێستە لە کوێیە..

ئــەو یەکێ بــوو لەوانەی خــودا لە مێژ بــوو پەشــیمانیی خۆی لە دروســتکردنی دەربڕیبــوو. ڕەنگــە ئادەمێکــی تر بوو‌بێــت و نەک گوناهێــک، بەڵکــە دەیانجار و یەک تەمەن مرۆبوونی خۆی خســتە مەترسییەوە بۆ ئەوەی سنوورەکانی مرۆڤبوون تاقییبکاتەوە. بەڵام هەگیز ئەســەف و داخی بۆ بەهەشــتێکی ونبوو نەخوارد، ئەو باش دەیزانی بەهەشت و دۆزەخ پێکەوە لێرەن، لەسەر عەردێکی بریندار و لە مرۆڤیش تەنیاتر لە ژێر ئاســمانەکاندا، هیچ ئاژەڵێکی کۆڵەوارتر دروستنەبووە. بۆیە لە دەرکردن و سزادان نەدەترسا.

ئەو بە هەڵە وەک کورد هاتبووە دنیاوە: زامدار مرۆڤێکی جەهەندەمی بــوو، لــە بەرەی ئیبلیــس و یاخیبوون و بێ ڕیایی. ئەو فریشــتەی ئەقڵــی مرۆیــی و یەکەمین گوناهکەرەکەی «کانــت» بوو کە خۆی خســتە بەردەم تاقیکردنەوەیەکی ئەبەدی، کە هیچکامێک لە نەوەی پێشخۆی و هاودەمی خۆی و پاشخۆی نەیانوێرا تخونی بڕیارەکانی

بکەون. زامدار بۆخۆی بە تەنیا هەولێرێکی کولتووریی و مەعنەویی، تایبەت بوو. هەولێر حەوت هەزار ساڵی تریش زامدارێکی تری وەکئەو بەخۆیەوە نابینێت، بگرە کورد نایبینێتەوە. من ئێستا کە ئەم وشە سادانە بە ڕۆحێکی زامداریانەوە لە وەسفی ئەودا دەنووسم، سەر لەسەر قازانێکی کۆنینەی ناخی تایبەتی خۆم و سەر لەسەر قابلەمەیەکی پڕی مێژوویی هەڵدەدەمەوە، کە پڕە لە کەسەر بۆ کۆچ و تاقانەیی زامدار.

هەموومان کاتێ قسە لەسەر زامدار دەکەین، پڕ دەبین لە ترسنۆکیی خۆدەربڕین و خۆسانسۆر کردن. ئەو هەرگیز ئەمەی نەکرد، هەمیشە لە خۆدەربڕین و قسەدا، بوێر بوو. ئەو لە یەک کاتا کۆسمۆپۆلیتان و لە هەمان کاتدا مرۆیەکی لۆکاڵی و خۆمانەیی و خاکیی و هەولێرییەکی تەمام عەییار. گەردوون و کوردبوون لەودا یەکیان گرتبوو، ئەو لە ڕووبارەکەی هیراکلیتۆسی فەیلەسووفی پێشسوکراتی دەچوو، کە بەردەوام ڕەوان و بەردەوام دەگۆڕا: هەرگیز هەمان زامدارت نەدەبینیەوە، زامدار لە گۆڕانێکی بەردەوامدا بوو. گۆڕان لەودا بەردەوامی و هەموو ئێستایەکی ئەو هەنگاوێک بوو بەرەو بوونێکی تر، یان بوون لە ئاستێکی تردا. ئەو یەکایەتییەک بوو پڕ لە فرەیی و ئەو فرەییەک بوو لە تاقانەیی و یەکایەتیدا: ئەو هەمیشە خودی خۆی بوو، ئەو لە پرۆسەیەکی بەردەوامی بوون بەخۆیدا، زەحمەتترین دۆخی بوونی مرۆییانەی خۆی ئەزموون دەکرد. بەخودبوون لە پێگەی ژیان و ئەو کولتوورەی زامداری تیا دەژیا، ئاسان نەبوو: کولتوورێکی خود فرێدەر، بێڕێزیکەر بە تاکایەتی، کولتوورێکی تاکسڕەوە، مێژوویەکی پڕ لە شوانپەرستی و ڕەعیەتبەخێوکەر، بۆ ئاغا و خان و سەرۆک و پێشەوا و ڕابەر ملکەچ، چۆن بە ئاسانی جێگەی خودێتی دانسقەی مرۆڤێک دەکاتەوە،

کە هەموو ڕووخساری ڕۆح و جەستەی لە درکەکانی ئەم کۆمەڵگا و مێژووە هەڵسووە و بە برینداری دەیەوێت دانسقە و ئۆرگینال و بێنمونە بێت!.

لە ئەودا ئاشتبوونەیەکی مرۆڤ لەگەڵ گەردوون هەبوو، ئاشتبوونەوەیەک لەسەر حسابی بەخودبوونی مرۆڤ و چێژوەرگرتن لە گەردوون، نەک سەرسامی و بوون بە کۆیلە و پەستیار و بچووکبوونەوە لە بەرامبەر گەردووندا. زامدار، نەیدەویست مرۆڤبوون دابەزێنێتە سەر ئاستی پەرستن و کۆیلایەتی، ئەو چێژبین و یاخی و تەنافبازێکی مەزن بوو، کە نەیدەویست دەست بە هیچ پەتێکی ڕزگاربوونەوە بگرێ، چونکە دەیزانی بایی ئەوەی بۆ ڕزگاربوون پەنا بۆ هەر شتێک ببەیت، ئەوەندەش تەسلیمی دەبیت و پێوەی پابەند. بۆیە کەوتنەخوارەوە و بەربوونەوە بەلاوە چێژبەخشتر بوو وەک لە ژیانی کۆیلایەتی و مانەوە بەهەر نرخێک. ئازادیی بۆ ئەو بەدیلی نەبوو.

زامدار دەستی لە هەموو شت بەردا بوو. لە یاسا و ئەخلاقی باوی کۆمەڵایەتیەوە، ئەو شتەی هەموومان ملکەچ و لە ئاستیدا بچووکین، دەستپێکرد. تەنیا یەک شت زامداری دەکردەوە بە مرۆڤێکی ئاسایی: خوێندنەوە. لە خوێندنەوەدا کەس نەیتوانیوە بۆڕی بداتەوە، بە تاقیی تەنیا هێندەی یەک نەوە، بیست ئەوەندەی گشت مامۆستایانی زانکۆکان، سەدانجار لە ئاپۆرەی گشت ڕۆژنامەنووسانی کورد، هێندەی خەباتی گشت سەرکردە کوردەکانَ و هێندەی موچە و سەرمایەکانیان، کتێب و وتار و نامیلکەی خوێندنەوە. ئەو لە هەمووان دەوڵەمەندتر بوو. زۆرجار بە زمانی کتێبەکان دەدوا. ئەو کۆی گەردوونی لە کتێبەکاندا جینجە کردبوو، ئەو لە فێرگەیەکدا بوو کە تەواوبوونی نەبوو. مرۆڤێکی هیراکلیتۆسیی بوو، دەیویست

خـۆی لە لۆگـۆس و ئەقڵە بچووکەکـەی مرۆڤبـوون ڕزگار بکات و خۆی بگەیەنێتە ئاسـتی لۆگۆس و ئەقڵی گشـتی. ئەو دەیوسـت نەخشـەی جیهان و بوون لە دەسـتی خواکان بسـتێنێ و بیداتەوە دەسـت مرۆیەکان: پرۆمیسیۆسـی کورد بوو، ئاگردزێکی خانەدان و پیاوێکـی نەبیـل و بە ویقار. ئەو جـارێ وەک گلگامێش بۆ گیای نەمریی دەگەڕا و بەسـەر ئەنکیدۆدا شیوەنی دەکرد، ئەنکیدۆی ئەو مەرگـی جوانی بوو، مەرگـی ئازادیی تاکەکەسـی. جارێکش وەک حامووڕابی، بوونی لە یاسـادا کورتدەکردەوە و بۆیاسـاش ملکەچ. تاقە شـتێ زامداری هێشـتەوە، وشە بوو، هەر وشەش کوشتیان و بردیانەوە بۆ جیهانەکەی خۆیان..

ئێمە ماوەی سـێ ساڵ زیاتر هاوسـێ بووین. بە بیجامەوە دەمدی و لـە ماڵەکـەی خۆیـدا، چەندجارێکـی کـەم سـەردانیم دەکـرد. هەمیشـە خوێندەوار و هەردەم پڕ قسـە و پڕ مانا. بەڵام سەرەتای سـەرەتاکان، من لە بەغدا ناسیم، لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابـردوودا، کاتێ لە ڕێگـەی خزمەکانی دایکمـەوە، لە خۆرهەڵاتی کوردسـتانەوە چەند دەستنووسـێکی شیعریی (سـەیفولقوزات)ی شەهیدی کۆماری کوردسـتانم، بەدەست گەیشتن و بە تێگەیشتنی ئەوسای هەرزەکارانەم، ساخمکردنەوە و مانای هەندێ لە وشەکانم لێکدانـەوە لەگەڵ ژیاننامەی شـاعیرەکەدا، بردمن بـۆ زامدار، تا لە یەکێـک لـە گۆڤارەکانـدا بڵاویان بکاتـەوە. هەرگیز چارەنووسـی ئەوانەم لێنەپرسییەوە.

کـە سـاڵی دوو هـەزار هاتمـەوە هەولێـر، زامـدارم بینییـەوە و چەندجارانێـک لە خزمەتیدا دادەنیشـتین و جارێکیش سـەیرانمان کرد و چەندجارێکیش سـەفەری شـاران لە بۆنە و فیستیڤاڵەکاندا، بـە تـەواوی لە زامداریـان نزیکخسـتمەوە. کاتێک بیسـتبووی من

لێکۆڵینەوەکەم لەسەر نالی پێشکەش بەو کردووە، سووپاسی کردم و ئیتر تا دەهات، نێوانمان خۆشتر دەبوو. هەمیشە کە لە کۆڵانیی خۆمان بە خزمەتی دەگەیشتم، بە گەرم وگوڕیی باسی دوایین بەرهەم و نووسینی دەکردم کە خوێندبویەوە. وەکئەوەی نانێکی گەرمی بەدەستەوە بێت و ئەمبەراوبەری پێبکات، ئاوا باسی وتار و بەرهەمەکانی دەکرد. بۆ فەنتازیای خواردنەکەم، جارێک لەسەر جادە پڕی دامێ و لەگەڵ جوینێکدا، تێر تێر ماچیکردم و گوتی: ئەوە شاکارە. جارێکیش، فێری کردم کە هەگیز لەوپەڕاوپەڕی مێزی دانیشتن و خواردن و خواردنەوە، دانەنیشم، چونکە: «ئەوە جێی کەرانە».

زامدار لەو دیو ئەزموون و تەمەنەوە، قسەی دەکرد و هەرگیز هەستت بە خۆجیاکردنەوە و لوتبەرزیی نەدەکرد. جدییات و ڕەسمیات بۆ ئەو سانسۆرێکی کوشندە بوو، زیندانییەک بوو بەناوی ئەخلاقی باو و پەسەندکراوی کۆمەڵایەتییەوە، کە ئەو نەیدەویست دەستەمۆی ئەم ئەخلاقە ببێت و بچێتە ناو بەندیخانەی کولتوورەکەیەوە. ئەو بە ڕەسمیات بۆگەنی دەکرد، ئەو ڕسمییاتی لە پێ دەکرد.

من نازانم ئێستە زامدار لە کوێیە! بە ڕاستی نازانم، ئەو لە بەهەشتە یان لە دۆزەخ. ئەگەر چوونە بەهەشت بە دەستی کولتوورە باوەکەی کۆمەڵگای کوردی بێت لەم هەرێمەدا، ئەوە لە دۆزەخ بۆی بگەڕێن! ئەوەتا لە قەراخ مێزێکی ئاگرینەوە دانیشتووە و مەجلیسی گوناهکارانی خۆشکردووە و قاقایان دەگاتە ئەوپەڕی دیوارەکانی بەهەشت. بەهەشتییەکانیش هەموویان گوێیان بەو دیوارەوە ناوە بزانن ئەوە کێیە، خۆشیی بۆ دۆزەخیش گێڕاوەتەوە. بەڵام ئەو هەرگیز بۆ بەهەشت هەوڵی نەدا، نەیدەویست، چونکە بەهەشتی ڕاستەقینەی ئەو لێرە و لەم سەرزەوییەی نیشتیمان

بوو. دانیشتنەکانی ئێوارانی هاوین، ئەویان سەراپا دەکردە شەپۆلە دەنگێک و خاک و عەردی لەگەڵ خۆی دەجولاند. بەهەشتی ئەو ئێرە بوو، دۆزەخیشـــی هەر ئێرە. بەڵام ئیتر ئەو لێرە نیە، لە نیشـــتیمان نیە و لە هەولێریش نیە. بۆیە من دڵنیام لەهەر شوێنێک بێت، ئێستە بۆنی خۆشـــیی و قاقای پێکەنینی ئەوی لێدێت، ئەو شـــوێنەش هەر جێیەک بێت، بەهەشتی ڕاســـتەقینە و ئاوەدانیە. لەوێ دەیدۆزنەوە، زامـــدار ئەوەتا لەو مێژوو و یادەوەریانەدا کە پێکەنین و شـــادیمان بیـــر دەخنـــەوە: بۆیە زامدار لە غیابی خۆیشـــیدا، هەر خەمی ئێمەی بوو، نەیدەویست بە خەمباری بمرین و تەنیا. ئەو پێکەنین و نوکتەی زۆری بۆ بەجێهێشتین تا هەست بە تەنیایی نەکەین.

من لە مەراسیمی مردنەکەیدا بەشداریم نەکرد، لێرەبووم و دەمتوانی، بـــەڵام ویســـتم میتـــۆدی زامـــدار خۆی بـــەکار بهێنم و تەســـلیم بە ڕێوڕەسمە ئایینی و کۆمەڵایەتیەکان نەبم. یاخیبوون بۆ من بەشێک بوو لە میراتی ئەو، دەمویســـت لەگەڵ ئەودا تەنیا بم. ئەو بەڕاستی مێژوویـــەک و ڕۆحێکـــی گەنج و مۆدێرنیســـتێکی تاقانە بوو. ئەگەر ڕۆژگارێ پەیکەرێکی بۆ چێکرا، پێویستە ئەو پەیکەرە لە دەروازەی هەولێـــر بێت، پێویســـتە ئەو پێشـــوازیی لە ڕێبواران و گەشـــتیاران بکات، چونکە تەنیا ئەو شـــایانی ئـــەم پێگەیەیە. ئەو بۆخۆی بەتەنیا شارێک بوو لە پێکەنین..

٢٠١٢



شار، لە گێڕانەوەی (مەنگوڕی)دا..

میـرزا محەمــەد ئەمیـن مەنگـوڕی (١٩١٠-١٩٨٠)، نووســەرێکی لەبیرچووی کوردە، خەڵکی پەراوێزی شــار و بە ژیانێکی ســەخت و ناهەمــوواری سیاسـیدا تێپەڕیــوە. ئــەو ڕۆژە بەســەرهاتەکەیم خوێنـدەوە و چــاوم پڕ بــوو لە فرمێســک، دواجار فرمێســکەکانم کۆکردنەوەو بەمجۆرە بۆی گریام. بۆ مرۆڤێک کە هەتا بڵێی زەمان لەگەڵیـدا دڵڕەق، کۆمەڵگا دڵڕەق و سیاســەت دڵــڕەق. بەس منیش وەک ئــەو لە گوندەوە چوومە شــار، ویســتم لێرەوە، لە گۆشــەی منداڵییەوە، یادێکی بکەمەوە.

ئــەو ڕیبوارێـک بــوو ژیان خســتیە بــەردەم هەموو ناخۆشـیی و تاقیکردنەوەکانی خۆی. لە شۆڕشــی مەهابادا هاوکار و پشــتیوان و لــە نزیکیشــەوە دۆســتایەتی لەگەڵ مــەلا مســتەفای ڕەحمەتیدا پەیدا دەکات و شـێخ مەحموودی حەفید لە بەهەڵە لێکحاڵیبوونێکدا ویســتویەتی بــە خەنجەرەکەی خۆی بیکوژێـت و حکومەتی ئێران

بەتاونگەلێـک کە نەیکردوون، بۆی دەگەڕێت و لەناو پۆلیسـخانەی سلێمانیدا حزبێک دروستدەکات تا لەهەر کاتێکدا بیانەوێت سنوور بۆ ئەو دەسەڵاتانە دابنێن، کە دەیانەوێ ڕۆحی کوردایەتی لە کۆمەڵگای کوردیـدا بکوژن. لەلایەن ئاغاکانی قەڵادزێ و رانیەوە دەبێتە میرزا و نازنـاوی مەنگـوڕی هەڵدەگرێ، بەبێ ئەوەی سـوودێکی دیکەی دەستبکەوێ.

لـەدوای شکسـتهێنانی باوکی لەکاری کشـتوکاڵدا، ناچـار بەکاری توووتنفرۆشـی روودەکاتـە بەغـدا و مەنگـوڕی و داییکـی بە تەنیا جێدەمێنـن. تـا ئەو تەمەنە مەنگوڕی لـە قوتابخانە و لەلای مەلا بە ئاکامێکی ئەوتۆ ناگات و دووچاری گەلێک کێشـە و سزا دەبێتەوە، کە هیچیان لەگـەڵ تەمەن و ئەزموونی ئەودا ناگونجێن. لە تەمەنی چواردە ساڵێدا بە ڕەزامەندیی دایکی و بۆ سۆراخکردنی باوکی، کە بۆ توووتنفرۆشـی چۆت بەغدا، بۆ یەکەمجار لە قەڵادزێوە سەفەری شـارۆچکەی کۆیە دەکات و تووشی سەرسوڕمان دەبێت. ئەمە لە سـاڵی ١٩٢٤دا ڕوویداوە. لێرەشـەوە، شـوێنگۆڕکێ بۆ ئەو مانا و دەلالەتێکی تایبەت وەردەگرێت و یەکسـەر کاریگەریی دەکاتە سەر ناخ و کەسایەتیی و پرسیاری لەلا دروستدەکات:

(لەسـەر ڕەزامەندیـی دایکـم چوم بـۆ کۆیە. هەر کە پێـم نایە ناو شاری کۆیە سەرم سوڕما، چونکە شاری وا گەورەم نەدیبوو. کۆیە بە نیسـبەت قەڵادزە نیمچە لاهورێک بـوو، لەبەر خۆمەوە ئەم وت تۆبڵێی هیچ شارێک لە کۆیە گەورەتر بێ؟)

ئەم دێڕە پڕمانایانەی لە کتێبی (بەسەرهاتی مەنگوڕی)دا نووسیون، کـە بۆخۆی شـاکارێکە لە بواری بەسـەرهات نووسـیندا. ئەو لەم کتێبەیـدا هەنـدێ بەسـەرهاتی گرنـگ و ماناداری هەڵبـژاردوون، کـە پڕن لـە ئەزموونی مرۆیی و ئـەو پرۆسـە مەعنەوییەی کە لە

میانەی گێڕانەوەکانیدا پێیدا تێپەڕ دەبین، مرۆڤ تووشی تاسان دەکات. مەنگوڕی بێکۆتا جوان دەنووسێ و گۆشەنیگای نزیک بۆ گێڕانەوەی ڕووداوە دوورەکان هەڵدەبژێرێ و بەمجۆرەش خوێنەر لە ئەزموون و ڕابردوو نزیک دەخاتەوە. ئەو نووسیارێکە کار لەسەر نزیکخستنەوەی ئەزموونی تایبەت و ئەزموونی گشتی دەکات..

شار بۆ مەنگوڕی جیگەی حەپەسان و دیاردەیەکی نوێیە. ئەو دوو وێنەی شارمان بۆ دەکێشێ، کە یەکێکیان شاری کۆیە و ئەویتریان شاری بەغدایە. لە وەسفەکانی ئەودا وێنەیەکی سەرەتایی شار هەیە، کە مایەی تێرامانە و وەسفەکانی ئەو بۆ شار، نزیکن لە ڕوانگەیەکی دیاردەناسانەوە. لەو پەرەگرافەدا لە ڕووی ئەخلاقییەوە، پابەندێتی خۆی بەدایکییەوە ئاشکرا دەکات و تا کۆتایی کتێبەکە وەفادارانە باسی ئەو پەیوەندییە و دایکی دەکات.

شوێن، لە نووسینی مەنگوڕیدا تایبەتمەندیی خۆی هەیە و دەبێتە جێگەی سەر سوڕمان و هەڵگری دەلالەتی تایبەت و ئەمەش پرسیاری لەلا دروستدەکات. لەلای مەنگوڕی شار شوێنێکی نوێیە و ئەو بەسەریدا دەکەوێ و ئەمەش بە قووڵیی دەیهەژێنێ. لێرەوە، لەلای مەنگوڕی پەیوەندییەک لە نێوان شار و بیرکردنەوە، شار و بەراووردکردن و شار و خودێتی پێکەوە بەرجەستە دەبن. ڕەنگە مەنگوڕی یەکێک بێت لەو یەکەمین نووسەرە کوردانەی بۆ یەکەمجار گوزارشێکی مۆدێرن لە دیاردەی شار، ئەتمۆسفێری شار لە شێوە سەرەتاییەکەیدا دەکات، کە بۆ من زۆر جێگەی بایەخدان و بیرکردنەوەیە. مەنگوڕیی بەچاوی منداڵێکی هەرزەکارەوە شار دەبینێ و سەرنجەکانی خۆی لەسەر تۆمار دەکات.

ئەو لە شاری کۆیە دەبێتە مرۆڤێکی تر، یەکەمجار سەری دەسووڕمێ و زمانی پرسیاری دەپشکوێ. دووەمینجار، دەکەوێتە بەراوورد

کردن و نرخاندن لە نێوان شار و ناشاردا، چونکە گەورەیی و شوێن، لە شـێوەی شاردا بۆ ئەو دەبێتە پرسیار و (گەورەیی و قەبارە) لە بیچمی شـاردا دەبینێ و ئەمەش وای لێدەکات بەراووردیی قەڵادزە و کۆیە بکات و دوووەمیانی وەک نیمچە لاهوورێک، دێتە پێشچاو.
لە دوای ئەوە شـار بۆ ئەو نیشانەی ناسینەوە و ئامادەیی دەوڵەت و دەسـەڵاتە: ئەو کە پێشـتر پۆلیسـی نەبینیوە، پۆلیسـی لێدەبێتە نیشـانەی دەسـەڵات و بە مرۆڤگەلێکی (چارەقوورس)یان وەسـف دەکات و لە ڕێگەی وەسـفکردنی پۆلیسەوە، شتێکمان لەسەر جەبر و سـتەمی دەسـەڵات لەلای کورد و لە ڕوانگەی ئەم میللەتەوە بۆ ڕووندەکاتەوە.:
(کە چاوم بە پۆلیس کەوت، واقم وڕما، ئەمووت ئەبێ کەس بتوانێ پتر لەم چارەقورسـە ناشـیرینیانە بڕوانێ و زراوی نەچێ. چونکە پۆلیسم نەدیبوو، زۆریان لێ ئەترسام نەمدەویست بیانبینم بەتایبەتی نیشانەی سێدارەکانیان شتێکی زۆر بەسام بوو).
بنەمای ناسینی مەنگوڕی بۆ دەسەڵات، کە لە هەمان کاتدا نیشانەکانی بنەمای گشـتیی ناسـینی مرۆڤی کوردی لەو قۆناغەدا بۆ دەسەڵات لە خۆی گرتووە، تەماشـا و بینینە. ئەو لە ڕێگەی تەماشـاکردنەوە وێنەیەکی سایکۆلۆژی لەسەر دەسەڵات بە وردبوونەوە لە کەسایەتی پۆلیس، لە مێشک و زەینی خۆیدا دادەڕێژێت و ترس لەلای دروست دەبێت.
ئەم وێنەیە بۆ دەسـەڵات، لەلای کورد تا ڕادەیەک وێنەیەکی جێگیر و گشـتێنراوە، کە مەنگوڕێ لە شـێوە سـەرەتاییەکەیدا گوزارشی لێکـردووە. ئـەو وەکـو منداڵکارێـک، نایـەوێ پۆلیس و نیشـانەی سێدارەکانیان ببینێ و لێرەشەوە، شار ڕەهەندێکی بێزارکەری خۆی بۆ ئەو ئاشـکرا دەکات. مەنگوڕی لێرەدا بەیادهێنەرەوەی سوارەی

ئێلخانیزادەیە، بەڵام وێنەی مەنگۆوڕی بۆ شار، لەسەر بنەمای وێناکردنی دەسەڵاتەوەیە و بنەمای وێناکردنی ئێلخانیزادە بۆ شار لەسەر وردبوونەوەی لە ماشێن تەکنەلۆیا..

سێیەمین خەسڵەتی شار لەلای مەنگوڕی، بریتیە لە قەڵەباڵغی و شلووقی و جەنجاڵی. ئەو بە پەیسەر و سۆراخکردنی هاوڕێیەکی باوکیدا و لە کۆلانێکی کۆیەدا ڕێگای لێتێک دەچێت. ونبوون ئەنجامێکی شیاوی سەرلێتێکچوون و ڕێگا ونکردنی ناو قەڵەباڵغیە. ئەمە ئەو ساتەوەختەی منالیمان بیر دەخاتەوە، کە هێشتا جەستە بە شوێنی نوێ ڕانەهاتووە و گونجان لە نێوان شوێن و بکەردا دروستنەبووە. شوێن بە جەستە نامۆیە و جەستە بەردەوام ڕووبەڕووی سنوورەکانی شوێن و شتەکان دەبێتەوە. ساتەوەختێکی بنیامینیانە لە وەسفیدا بۆ تەنیایی مرۆڤ لە شار و ڕۆحیی گەڕیدە ئاسای، کە هاوشانە بە سەرسووڕمان و نامۆیی..

چوارەمین خەسڵەتی شار، بریتیە لە فرەیی و جیاوازیی و هاوکاریی نێوانیان. مەنگوڕی لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانیدا، وێنەیەکی فرە کولتووریانە و فرە نەتەوەییانەی عێراق و کوردستانی ئەوسامان بۆ دەکێشێ بە هەموو ڕەهەندە ئەتنیکی و ئاییني و کولتوریی و تەنانەت جوگرافیاییەکانیشیەوە.

(بەیانی بەهۆی (مالموک) ناوێکی جولەکەی کۆیی کە ئاشنای کاسبی بوو لەگەڵ باوکما، تەلەگرافێکم بۆ باوکم لێدا..)..

مەنگوریێ لە مانەوەیدا لە کۆیە، وەک یەکەمین شار کە ئەوسا و لەو تەمەنەدا بینیویەتی، گۆڕانیی گەورە بەسەر کەسایەتیدا دێت، کە تەنیا شار دەتوانێ لە مرۆڤدا دروستیبکات. ئەو لە حوزنی دووریی باوکەوە، لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە دەپەڕێتەوە بۆ چاوکراوەیی و تەماعی بینین و ئەزموونی زیاتر دەیگرێ. ئەو پێشتر بۆ هاتنە

کۆیــە مۆڵەت لە دایکی وەردەگرێ، بــەڵام مانەوەی لە کۆیە بەرەو جۆرێ لە ســەربەخۆیی و بڕیاردانی دەبات و ئازادانە بڕیار دەدات بچێت بۆ بەغدا. ئەم ســەفەرانە لە پاشاندا و لە پرۆسەی نووسینی مەنگوڕیدا، بە تایبەتی لە شــاکارەکەیدا (گەشتی ئەستێرەی مەریخ)، ڕەنگدانەوەی خۆیان هەیە. مەنگوڕی دوایئەوەی گەشتەکانی لەسەر زەوی لە شــێوەی شــوێنگۆڕکێدا بە ئەنجام دەگەیەنــێ، دەکەوێتە کەلکەڵەی گەشت بەرەو مەریخ، بەرەو ئەستێرەیەکی تر..

لەگەشــتەکەیدا بەرەو بەغدا گەلێک ڕووداوی سەرسووڕهێنەر، کە هەموویان بەڵگەن لەسەر سرووشــتی یاخیگەرانە و بەرگریکەرانە و لە هەمان کاتیشــدا دڕندانەی مــرۆڤ، باس دەکات. لەوێدا بۆمان دەردەکــەوێ، کە مرۆڤی ئەم دەڤەرە لــە قووڵاییەکی ڕەگاژووەوە، کەسایەتی خۆی لەسەر بنەما عەقیدەیی و ئایدیۆلۆی و خورافییەکان بیناکردووە و ڕق و بێگانەپەرستی و ململانێی مەزهەبی و ملکەچی و خۆبەکۆیلەکردن، بەشــێکی جیانەکراوەن لە کەســایەتی عێراقی. لەگەڵ ئەوەشدا، مەنگوڕی بە نیگایەکی هەرەزەکارانەی پاکەوە، کە بەیادهێنەرەوەی یەکەمجاری چوونە بەهەشتی مرۆڤە، دەگەڕێتەوە سەر باسکردنی دیاردەناسانەی شار، ئەمجارەیان شاری بەغدا:

(ئێوارەیــەک کتوپــڕ گەیشــتینە ناو شــاری ئەلئەعزەمیــە. ئای لەو ســەیرانگە سەرســوڕهێنەرە، تۆ بڵێی ئێرە بەغدا بــێ یان وڕێنەی برسێتی ئەوەم نیشان ئەدا؟ خۆ ئێرە لە کۆیە گەورەتر و خۆشترە، بەم سەرســامییەوە کەڵلەکەمان لە خوار نەخۆشخانەی مەجیدیە لەنگــەری لادا، لــە کەڵەکەکە دابەزیم، ئەوە هــەوەڵ جارە کە چاوم بــە ئۆتۆمبێــل و عەرەبانە ئەکەوێت. ئای بە خوا شــتیکی ســەیرن، هەر ئەوەندەم زانی لەناکاو گڵۆپی ئەلەکتریکەکانی بەغدا داگیرسان،

بەڕاستی ئەو چاوئەندازەیەم بەلاوە شتێکی سەیر بوو کەوا وێنەی گڵۆپەکان لەناو ئاوی دیجلەدا ئەتروسکانەوە، ئێرە لەکوێ و قەلادزەی پڕ لە وەحشیەت و نەزانین لەکوێ؟ دەمم بووبوو بە تەڵەی تەقیو، هەرچەندم ئەکرد نەمدەزانی سەیری چی بکەم، لام وابوو لەژێر ئاویشا هەمان شار و کارخانە و ئەلەتریک هەیە، نەمزانی کە وا وێنەی کارەبا و خانوو حەزەڕاتی سەر زەوییە و ئینعیکاسی بۆ ئاو و هەواو شەپۆل کردووە و ئەیان جووڵێنێ..).

ئەم دێڕانە سەرسامبوونێک پیشاندەدەن لە یەکەم بەریەککەوتنی سۆژەی کوردی لەگەڵ دنیای شێوەمۆدێرن و جیهانی مۆدێرنیزاسیۆندا. جیهانێک کە هاوکاتە لەگەڵ لەخۆتێگەیشتنێکی نوێ و دروستبوونی هەستی دواکەوتوویی و نامۆبوونی خود لەگەڵ واقیعیی خۆیدا. ڕەنگە ئەم دێڕانەی مەنگوڕی گوزارشێکی دیکەی هەمان هەستکردن بن، کە لە کاتی خۆیدا و لە پێش ئەودا، هەر یەک لە نالی، حاجی قادری کۆیی و پیرەمێرد لە شام و ئەستەمبووڵ و حیجاز، پێیدا تیپەڕیبوون. گوزارشێک، کە مرۆڤی بیرکەرەوەی کوردی لە دنیای پێشمۆدێرن و کۆگەراییەوە دەگواستەوە بۆ جیهانێک، کە تیایدا خود هەست بە بوونی خۆی بکات و لەهەمان کاتیشدا ئەزموونی لەخودنامۆبوون تەی بکات. مەنگوڕی نووسەری ساتەوەختێکی گرنگە لە مێژووی ڕۆحیی و بیرکردنەوەی ئێمەدا، کە تلاوتلی ڕۆژگار ڕێی ئەوەیان لێنەگرت، تەعبیرێکی ڕاستەقینە لە خۆی و سەردەمەکەی بکات..



نازانم بۆ لەبیرمان کرد؟

## مەهدی خۆشناو

پیاوێـک بـوو لە پەیمان و کارکردن، لەبەر ئەوە هەمیشـە پڕکار و ماندوو، لە دوو شـوێنی جیاوازدا کاری دەکرد: بارەگای پارێزگای هەولێر و بارەگای یەکێتی نووسـەران، کە پاشـتر لەو دوو شوێنە کەسیتر نەیتوانی جێگەی بگرێتەوە و بگاتە ئاستی ئەو.

من لەسـەرەتاکانی ساڵی دوو هەزارەوە، مەهدی خۆشناوم ناسی، بـەڵام زۆر زیاتر لە ناسـینی تایبەتی و لـەو پێگەیەی ئەو هەیبوو، لەڕێگەی دکتۆر زەردەشـتی کوڕییەوە، خۆشمویست. هەردووکیان بـۆ مـن جێگـە و پێگـەی تایبەتیـان هەبـوو، هەردووکیشـیانم لە کارەسـاتێکی دڵتەزێنی ئەم شـارەدا لەدەسـتدا. مەهدی خۆشـناو پیاوێکـی ئیداریی بوو، کە لە ڕووی سیاسـییەوە وەفاداریی پارتی دیموکرات بوو، بەڵام ئەو بۆخۆی خۆی پەروەردە کردبوو. نازانم لە ناخی خۆیدا چۆن بیریی دەکردەوە، بەڵام من هەمیشە هەستمدەکرد ڕێزێکـی زۆرم لێدەگرێـت و ئەمەش دوو لایەنـە بوو. جگە لەوەی

لــە ماڵەوە ســەردانی دەکردم، ئاواش بۆ هەمــوو کۆڕ و بۆنەیەکی یەکێتــی نووســەران بۆخۆی بانگهێشــتی دەکــردم و زۆرجاریش، وێڕای ئیلیتیزامە سیاسی و ئیدارییەکانی، دڵی خۆی بۆ دەکردمەوە. جگە لەوەی دڵســۆز و بوێر بوو، ئەو شتێیشــی بەدەستەوە دەهات، قســە و بڕیاری یەک بوون و ئەگەر وەعدێکی پێدەدایت، جێبەجێی دەکــرد. جگە لە ســەیرانەکان و کۆڕەکان، چەند جارێک ســەردانی ماڵەوەییــم کــرد و هەرجــارێ تەلەفۆنــم بــۆ کردبــا بــەو پــەڕی حورمەتەوە پێشــوازیی لێدەکردم، ئەمە جگە لەوەی بۆ هەموو کۆڕ و چالاکییەکانم دەهات و تەنانەت دەمبیســتەوە کە خۆی خەڵکی بۆ سەمینارەکانم بانگهێشت کردووە. پێشئەوەی خۆشناوی ڕەحمەتی بناســم، هەرگیــز نەچووبوومە ناو پارێــزگای هەولێر، کاتێکیش کە چــووم ئەو حورمــەت و ئەتەکییەت و کرانــەوەی لێدەباری. دوای شەهیدبوونیشــی، دوو جــاری تر چوومەوە، کە هەرگیز نانووســم بە چ مەبەســتێک! هۆکاریی سەردانەکەم ئاشتکردنەوەی بوو لەگەڵ کەســێک، کە مــن خۆشمدەویســت. دەمزانیی کەســانیتر پێش من چووبوونە ئەوێ و بە قســەیانی نەکردبوو. منیش پێشئەوەی بچم، پرســم بە یەک دوو لە هاوڕێکانم کرد و گوتیان بچۆ بە قســەی تۆ دەکات. کاتێ دانیشــتینەوە، تەماشای قووڵایی چاومی کرد و گوتی: «دەزانم شــتێکت لە دڵدایە، تەنیا ئەوە نەبێت، هەموو شــتێکی ترت بە گوێ دەکەم». منیش گوتم، «هاتووم تا ئەوەی لە دڵمایە بهێنیتە دی». چاییمان خواردەوە و تەزبیحمان بادا و چەند تەلەفۆنێکی بۆ هات. قاتێکی خۆڵەمێشــیی لەبەردا بوو، قوومێکی تری لە چایەکەی دا و کەمێک وەستا و ئەمجارەیان کەمێ جیدیانەتر تەماشای کردم و هاتە لامەوە: «دڵت ناشکێنم، بەڵام ئەو ئەمە ناهێنێ..». من ساڵەها لەوەدوا تێگەیشــتم، نەدەبوو ئەو تکایەی لێبکەم، ئەو کەسەکەی لە

من زۆر باشتر دەناسی و بەڕاستیی ئەوەی نەدەهێنا.
مەهدی خۆشناو مرۆڤێکی ڕاشکاو بوو. شار و ناوچەی خۆی خۆشدەویست، بەڵام نەک لەسەر حسابی شار و ناوچەکانیتر. ئەو یادوەرییەکی زۆر زیرەکانە و زیندووی هەبوو، خەڵکی دەناسی و ناو و شوێنەکانی لەبیر نەدەچوون. لەگەڵ ئەوەشدا قسە لە ڕوو بوو. لە کاتی خۆیدا و دوای سەبرێکی زۆر و خۆ خواردنەوە و دانبەخۆداگرتن و کۆکردنەوەی بەڵگە و دووبارەبوونەوەی هەڵوێستە چوونیەکەکان و ئەزموونە هاوشێوەکان لەسەر کەسێک، یان کەسانێک، ئەوجا بەسەریدا و بەسەریاندا دەتەقییەوە. زۆر کەم کەسم بینیوە، لە تووڕەییدا ئەوەندە یادوەریی لەکارا بێت و ئەوەندە بە شێوەیەکی لۆجیکیانە و ڕیزبەندییانە هۆکاریی تووڕەییەکەی خۆی لە بیر بێت و بتوانێ دەریببڕێت و لە هەمان کاتیشدا ئاگای لەو دەوروبەرەی خۆی بێت، کە قسەی تیا دەکات.
جارێکیان لە شوێن و کاتێکی تایبەتدا، خۆشناو بەسەر یەکێک لەوانەدا تەقییەوە، کە دووزمانیی و دووڕوویییەکی زۆری نواندبوو. ئەو هەموو ئەو حاڵەتانە و شوێنانە و کەسانەی وەبیر هێنایەوە، کە تیایاندا ئەو شتانەی کردبوو و گوتبوو، کە نەدەبوو بیانکات و بیانڵێت و خۆیان پێوە شیرین بکات و هیچیشیان ڕاست نەبوون. من بارودۆخەکەم بەلاوە پەسەند نەبوو، گوتیشم نەدەبوو ئەوە ڕویدابایە، بەڵام مەهدی خۆشناو، هەنگاوێک گەڕایەوە دواوە و ماچی کردم و هاتە نێوان من و کابرای سەرکۆنەکراو و دەستی خستە سەرشانی هەردووکمان و گوتی: «منیش حەزم نەدەکرد، بەڵام ئەگەر یەک شت لەوانەی بەم برادەرەم گوتووە، ڕاست نین، با بۆخۆی قسە بکات». ئیتر هەر لەوێ دڵی نیشتەوە و دامرکایەوە و داوای لێبووردنی کرد. نازانم خەڵک چۆن لێی تێدەگەیشتن و

دوایــی چۆنیان باس دەکرد، بەڵام من ئــەوم وەک مرۆڤێک دەبینی کە ئاسان هەڵدەچوو، بەبێ ئەوەی هیچ شتێ لە دڵ بگرێ و هەرگیز باکی نەبوو لەوەی دەمودەســت دەســتت لە مل بکات و بکەوێتەوە گێڕانەوەی بەرسەرهات و نوکتە و قسەی خۆش.

خۆشــناو ڕێــزی میــوان و خۆیــی لابــوو. مرۆڤێــک بــوو دڵنیایی پێدەبەخشــیت، لە پارتییە کاربەدەســتەکانی هەولێردا کەســیتریان هێنــدەی مەهدی خۆشــناو بۆ نووســەران و ئەهلی فیکــر و قەڵەم ڕاســتگۆیانە و بوێرانــە و بەبــێ چاوەڕوانیــی و جیاوازییکــردن، خزمەتی نەکرد. دەکرا حســابیی لەســەر بکەیت و هەمیشە هەستت دەکــرد ئەوت لــە کەنارەوەیە. لــە بۆنەکاندا بێ فیــز و لوتبەرزی، لەوســەرەوە دەهات و ئەملاولای ماچدەکردی و هەمیشە بۆنخۆش و ڕیش تاشــراو و پۆشــتە و پەرداخ. زۆر گوێــی نەدەگرت، بەڵام ئــاگای لێــت بــوو، هیچ هەڵوێستێکیشــی بیــر نەدەچــۆوە. زووش خەڵکــی دەناســی و بۆی دەردەکــەوت بایی چەندن. ئەو هەمیشــە وزەیەکی زۆری لە برادەرایەتی نووسەران و شاعیران وەردەگرت، بە کۆچکردنیشــی ئەهلــی قەڵەم، نەک لە هەولێــر، بەڵکو لەهەرێمدا پشــتیوانێکی چــالاک و بوێــر و دڵســۆزیان لەدەســت دا. مەهــدی خۆشــناوبوون بۆ مەهدی خۆشــناو خۆش و ئاســان نەبوو: دڵنیام ئــەو ئەوەنــدەی بــۆ کەســانیتری دەکــرد، بۆخۆی ئەوەنــدەی بۆ نەدەکرایەوە، هەندێکمــان تەنیا ئەوکاتە ئەومان بیر دەکەوتەوە، کە کێشــەیەکمان بۆ پێشــدەهات، کەچی ئەو هەمیشە هەموانی لە بیر بوو. لەســەروەختی لێدانی ڕژێمدا، کە شــار چۆڵ و هۆڵ ببوو، من بە خۆم و ڕیکۆردەر و جێب چیرۆکییەکەمەوە، دەهاتم و دەچووم. زۆر بــە دەگمــەن خەڵکم دەبینــی. کتێبفرۆشــییەکەی (کاک خالید) لەسەر شــەقامی مەحکەمە، دەکرایەوە و ســەردانیم دەکرد. جاری

وا هەبوو لە بارەگاکانی پێشمەرگەی دەرەوەی شار، پێشمەرگە دەستیان لێڕادەگرتم و دەیانگوت بمانبەرەوە بۆ هەولێر. ئەوان لە چاوەڕوانییەکی بێهوودەدا ڕۆژەکانیان تێدەپەڕین. لەسەرەتاوە گومانی ئەوە دەکرا، ڕژێم لە تۆڵەی کەوتنیدا لە بەغدا و ناوچەکانیتر، دەستێ لە هەرێمی کوردستان بوەشێنێ و کیمیایی بارانمان بکات. لەو چاوەڕوانیانەدا، پێشمەرگەکان تینووی دیدار و ماڵ و خێزانیان بوون. لەو سەروەختانەدا بوو، ڕۆژێکیان خۆشناوی نەمر زەنگی بۆ لێدام، (ئەو کوڕەک تیلەکۆمە لەو کاتەدا فریشتە بوو)، خۆشناو تەنیاییەکەمی شڵەقاند و زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی لەناو شار ماوم. لە تەلەفۆنەکەدا هاواریی دەکرد: «چیت دەوێ لەبۆت بنێرم، هەرچیت پێویست بوو بە من بڵێ..ها». دڵسۆزیی لە گەرووی دەباری و من دەمزانی ئەو بە چ سووربوون و حەماسێکەوە قسان دەکات.

من نازانم ئایا ئەو لەبیر کراوە یان، نا؟ نازانم کێ ئەوی لەبیر کردووە و کێ بیریی دەکات؟ بەڵام من دڵنیام ئەو لە ژیانی ڕۆشنبیریی و ئیداریی و سیاسیشدا جێگەی خاڵیی و دیارە و کەسیش نەبووە جێگرەوەی. ئەو پیاوێک بوو لە دەرەوەی گەندەڵی و دزی و غەدر. ڕەنگە کەسانێک بە هەڵە لە کەسایەتی ئەم پیاوە تێگەیشتبن، بەڵام دڵنیام ئێستا بەخشیویانە. من دڵنیام ئەو لە ژیاندا بمابایە، زۆرینەی ڕووداوە دڵتەزێنەکانی ساڵانی پێشووی ئەم شارە، ئاراستەیەکی تریان وەردەگرت، ئاراستەیەکی ئاشتیخوازانەتر و مرۆڤانەتر. دڵنیاشم پارکەکان جوانتر و عاشقانەتر دەبوون. زۆر حەزم دەکرد لەگەڵ دکتۆر زەردەشتی کوڕیدا پێکەوە بیانبینم، بەڵام دڵتەزێن و ئازاربەخش بوو پێکەوە شەهیدبوونیان و هەرکات بیرم دەکەونەوە، حەزدەکەم دەستم بخەمە ناو دەستە گەرمەکانی زەردەشت و

ڕوومەتە نەرمە بۆنخۆشــەکانی خۆشــناو ماچ بکەم کە بەو لەهجە تایبەتەی دوو قسـەی بە بناگوێتا دەدا..



بیرکەرەوەیەکی دانسقە..

**مەسعود محەمەد:**

بیرکردنەوە لە زمانیی کوردیدا مەترسییەکی گەورەیە: بیرکردنەوە لەم چوارچێوە کولتووریی و زمانییەدا هەتا ئێستاش نەریتێکی ڕەگاژووی دەوڵەمەندی نییە و ئەمەش وایکردووە، بیرکەرەوەکان لەم کۆمەڵگایەدا زیاتر گۆشەگیر و بەخۆدا ڕۆچوو و دوورەپەرێز بن. ڕەنگە ئەمە سرووشتی بیرکردنەوەی جیدی خۆیشی بێت، نەک سرووشتی بیرکەرەوە خۆی.

ئەو پیاوێکی کەم نەبوو، مرۆڤێک بوو ناتوانیت بەئاسانیی بەلایدا تێپەڕیت: بڕواناکەم کوردێک لە هەرێمەکەی ئەودا هەبێت و هاتبێتە ناو جیهانی ڕووناکبیرییەوە و پێویستیی بەوە نەبێت مەسعود محەمەدی مامۆستا و بیرکەرەوە بناسێت. ئەو کەسایەتییەکە، نە دەتوانیت لە دوورەوە خۆشتبوێ و نە لە نزیکەوە دوژمنایەتی بکەیت. نە بە ئاسانی دەبێتە دۆست و نە ساکارانەش بۆت هەیە ڕەتیبکەیتەوە. لە هەردوو حاڵەتدا پێویستە بیناسیت و هۆشی خۆت

بخەیتەکار. ئەو زمانێکی هەیە دەربڕی هۆشێک و بیرکردنەوەیەکی تایبەتە.

هەرگیــز لە نزیکەوە نەمبینیــوە، جگە لە جارێک، کە لە هوتێلێکدا بە تەنیا و لەســەر کورســییەک دانیشــتبوو، کاتێکیش بەدوایدا چووم، پێیانگوتــم: چاوەڕوانیی کەســێک دەکات. ئەمە بــووە هۆی ئەوەی ڕێگــە بەخۆم نــەدەم بچمە خزمەتی. بەلام لە مێژە ئاشــنایەتییەکی سادەم لەگەڵ نووسینەکانیدا پەیداکردووە، بگرە من لە خوێندنەوەی وتارەکانییەوە بە زمانی عەرەبی و لە سالی هەشتاکاندا، کە زۆریشم لێنەدەزانی، دەستم پیکرد. دواجاریش سەر لەنوێ لە ئەوروپا هەندێ بەرهەمی دیکەیم خوێندەوە، وەک بیرەوەریەکانی، حاجی قادرەکەی و نالیەکەی.

وتارەکانی ئەو درێژ و بە عەرەبییەکیش کە قورس بوو، دەینووسی. ئەمەش وەک گوتم، دەگەڕێتەوە بۆ ســەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابــردوو. بەلام ئەوەتەی هــەم، هەر ئەوەندەم چــاک کردووە، کە بەوجۆرە لەگەڵ مامۆستا مەسعود محەمەددا ئاشنا بووم و پەیامیشم بۆ ئەو کەســانەی دەیانەوێ ئەم مرۆڤە بناســن، هەر ئەوەیە کە لە خۆیەوە دەستپێبکەن و بەرهەمەکانی بگرن و بیانخوێننەوە.

ساڵەکان و تەمەن فێریان کردم دوو مەسعود محەمەد لەیەکتر جیا بکەمەوە: یەکەمیان ئەو پیاوەی بیری دەکردەوە و بیرکردنەوەکانی بەو ســتایل و زمانە دەنووســینەوە، کە لە بەرهەمەکانیدا دیارن و پێموایە ڕۆژگارێک دێت پێویستیی ڕۆشنبیریی ئێمە بە گەڕانەوە بۆ ئەم پیاوە، زیاتر بێت.

دووەمیشــیان مەســعود محەمەدێــک بــوو لەنــاو قســە و باســی شــوێنکەوتوو و بڕوادارانیــدا. مــن ئەمەی دواییان باش ناناســم و زۆرجاریــش گەلێک بیــروڕای ئەو مامۆســتایەم بەجۆرێکی دی لە

زمان ئەوانەوە گوێ لێبووە کە شـەیدای بوون و لە نووسـینەکانی خۆیدا نەمبینیون. ئاسـاییە مرۆڤ تا سـنووری شێتیی و شەیدایی ئاشـقی نووسـەرێک بێت، بەڵام مەترسـیدارە بۆ ئەو نووسەرە کە ئەوانیتـر بیانەوێ بیـروڕا و بۆچوونەکانی خۆیان بەوجۆرە بخەنە ڕوو، کە هی نووسـەرەکەن، نەک خۆیان. نووسەرێک، هەر تەنیا لە بیروبۆچوونەکانی خۆی بەرپرسیارە و پێویستە لە چوارچێوەی ئەو شـێوازەدا کە پێی دەنووسێ و ئەو سیستەمە زاراوەییەدا کە بیری تێدا کردۆتەوە، هەڵبسـەنگێنرێ. هەڵسەنگاندنی لەبەر ڕۆشنایی ئەو بیروڕایانەی خەڵکانیتر بەو جۆرە خسـتوویاننەتە ڕوو، وەکئەوەی هی نووسـەرەکە بن، کارێکی دادەوەرانە نیـە، بەتایبەتی کاتێ ئەو ئیتر بۆخۆی لە ژیاندا نەمابێت. خوێنەران وەک ئاوێنەیەک وان، کە هەریەکەیان لە ئاستی کەسایەتی و تێگەیشتن و ئەزموونی خۆیاندا، بابەت و کەسـایەتی و بیرکردنەوەی نووسەران پەرچ دەکەنەوە و ڕەنگدانـەوەکان جیاواز دەبن. ئاوێنـەکان جیاوازن، چ جای ئەوەی ڕاستگۆش نین.

بۆیـە من بەردەوام دەگەڕێمەوە سـەر ئەزموونـی خۆم و ئەوەی لـە ئەنجامی خوێندنەوەوە، لەو مرۆڤە تێگەیشـتم. لەم میانەیەشـدا بـەردەوام پرسـیارێکم لە خۆم کـردووە، کە دەمـەوێ لێرەدا ئەو وەڵامە نیوەناچڵییەش بخەمە ڕوو، کە تا هەنووکە پێی گەیشتووم: چـی لە مەسـعود محەمەد دا هەیە بـۆ ئەمێسـتاکە گرنگە و چۆن نەوەی داهاتوو بۆی بگەڕێتەوە؟

مەسعود محەمەد بە ستایلێکی قورس دەینووسی، لە بواری هزر و بۆچوونی فەلسـەفیی و پرسیاری گرنگدا دەینووسی و دووردرێژ دەینووسـی و سەرچاوەکانیشـی بـە دەگمەن ناو دەبـردن. بەڵام ئەو بەردەوام لە قوڵاییدا مایەوە. داڕشـتن و ستایل و زمانەکەشی

بەجارێـک لەمەدا هاوکاری بوون و ئەو دەیتوانی هەمیشـە وێنەی بیرکەرەوەیەکـی جیـدی و مرۆڤێک کە ژیان بە ئاسـانیی ناگرێت، لەسـەر خۆی بەرهەم بهێنێت. بۆیە لە خۆتەرخانکردن بۆ شێوازی ئـەو، ئەرکـی خوێنەر گران و کەم و ئاسـان نییـە. ڕێکردن لەگەڵ بەرهەمەکانی مامۆسـتایەکی وا گەورە و پەی بردن بە ناوەڕۆکیی کارەکانی و دۆزینەوەی هۆکاری ئەو تەرزە بیرکردنەوەیە، ئەرکێکە پێویستە خوێنەر بیگرێتە ئەستۆی.

مامۆستا مەسعود محەمەد، مرۆڤێکە لەسەردەمێکدا ژیا و بیریکردەوە و نووسی، کە هیچ شتێک وەک ئەوەی پێویست بوو، نەدەنووسراو ئەوەی بیریی لێدەکرایەوە، ئەوە نەبوو کە دەنووسـرا. دەسەڵات و سانسـۆر، خۆسانسـۆری و یاخیبوون، زمانی ئامـاژە و خۆلادان، وێناکردنـی میتافۆریانـەی خوێنەر کـە خۆی تێدەگات مەبەسـتی نووسەر چییە، بەشێک بوون لە ناوەڕۆکی نووسینەکانی مامۆستا. ئـەو نەوەی مەجازیانەی حاجی قادری کۆیی بوو، کە زۆری قسـە لەدڵا بوو، بەڵام لە بەختی کەچ و زەمانەی زاڵم، هەمیشـە نووکیی خامە دەشکا.

بۆیە لە نێوان بەرهەمەکانی ئەم مرۆڤە و خوێنەردا، هەمیشە کەلێنێکی بەدحاڵیبوون و بەهەڵە تێگەیشـتن ئامادەیە، کە کات و سەردەمەکە لەناو تێکسـتدا بەرهەمی هێناوە. گووشـاری کات و سەردەمەکە و سانسـۆری باو، زۆرێک لە بیرۆکەکانی مامۆسـتاکەمانی لە پێچ و دەورانی نووسـینەوە، ئاڵاندووە و ئەوەی دەکرا زۆر بە ئاسـانی و ڕوونتر دەربڕدرابا، ئاڵۆز بووە و ڕێگای کورتی بۆ درێژکردوینەتەوە. هانـدەر و ئەنگیزەی ئەمەش باڵادەسـتیی سانسـۆر و تامەزرۆیی نووسەری بیرمەندە بۆ بەردەوامبوون.

وێڕای ئەوە، مامۆسـتا مەسـعود محەمەد بەردەوام شتێکی پێیە لە

خۆماڵیبوون و ڕەسەنایەتی و دانسقەیی. بەردەوام ئاماژەیەکی هەیە بەوەی کە بەڕاستیی کوردستانی و کوردییە و خاکەڕا و خۆماڵی. چ لە زماندا و چ لە بابەت و ناوەڕۆکی زماندا. ئەمە جگە لەوەی زۆرجار زمان بۆخۆی دەبێتەوە ناوەڕۆکی خۆی و سەرنج و وردبینی مامۆستاکەمانی لەسەر چڕ دەبێتەوە، بەجۆرێ کە قسەکردن لەسەر زمان، وەک سەفەرێکی کولتووریی لێدێت بەناو مێژوو و شارستانیەتی کوردا. زمان یەکێکە لە کێشە و بابەتە هەرە گرنگ و چارەنووسسازەکانی نەوەی مەسعود محەمەد، کە ئەو بەخشین و زیادەی زۆری خستە سەر.

مەسعود محەمەد، کورتکەرەوە نەبوو، بیرکەرەوەیەکی مۆدێلخواز نەبوو، گرێی خستنەڕووی دوا مۆدێلەکانی فیکری نەبوو، بیروڕای کتێبی کەسانیتری بەناوی خۆیەوە کورت نەدەکردەوە، وەکئەوەی هەندێک کەسانی دی لە نەوەی پاش ئەو دەیکەن و کردوویانە. ئەو بیروڕای کەسیتریشی کۆپینەدەکردە و دەرخواردی خوێنەری بدات. ئەوەی کە هەیەتی، مۆرکی بیرکردنەوەی خۆی، زمان و داڕشتن و زاراوەسازیی خۆی پێوەیە، پاش تێگەیشتن و تێرامان. ئەو یەکدەستە و نوسینەکانی لە ڕەهەندی باش و خراپدا هاوبەشن. ئەمە نیشانەی ئەو مۆرکیی کەسایەتی و شێوازە تایبەتەی ئەوە.

من بەڵگەیەکی ئەوتۆم دەستنەکەوتووە، کە بەشێوەیەکی سیستەماتیک بەرهەمی بیر و هزری فەیلەسووفە خۆرئاواییەکانی خوێندبێتەوە، بەڵام ئاگاداری بەشێکیان بووە و بەبێ سەرنج و ڕەخنەش بەلایاندا تێپەڕ نەبووە. نە بتی زەینی لێداتاشیون و نە پێویستییەکیشی بەوە هەبووە بەهۆی ناوهێنانی بەردەوامیانەوە، پێگە و دەسەلاتی ڕۆشنبیریی خۆی بەسەر هاوتەمەن و هاوکاتەکانیدا بسەپێنێ. ئەو لەگەڵ مۆدێلی فیکری و مۆدەی فیکریدا نەبووە و

نەبۆتــە شــوێنکەوتەی هیچ بیرمەنــد و فەیلەســووفێک، ئەگەرچی جاروبار بە ڕێزەوە ناویان دەهێنێ.

ئەو، بابەندبوو بە کۆمەڵگای کوردییەوە، چ لە ڕەهەندە مێژوویی و چ لە ڕەهەندە رۆشــنبیرییەکەیدا. بەرهەمەکانی، هەم سەرنجدانێکی فراوانیــان تێدایە لە ئاســت گوزەرانــی کولتووری و ڕۆشــنبیریی کوردەکاندا و هەم چوارچێــوە مێژووییەکەی ئەوەی پەیوەندیی بە وڵاتــی خۆیەوە هەیە، لەبیر ناکات. نازانــم بە تەواوی مانا مۆدێرن ویســتبووە، یان نا، چونکە ڕەگــەزی جۆربەجۆر لە بۆچوونەکانیدا هەن و ستایشکەرانیشی وێنەیەکی تایبەتیان لەسەر دروستکردووە، کــە زیاتر بۆنی پیرۆزکــردن و بەدەر لە ڕەخنەی تێدا باڵادەســتە، بەڵام ئەو هەروەکچۆن مەیلێکی جەوهەریانەی تێدایە بۆ تێگەیشتن و حاڵیبوون لەو دیاردە و بابەتانەی بیریان لێدەکاتەوە و لەبارەیەوە نووســیون، ئــاواش بڕوای بە جــۆرێ لە کرانەوە و سیســتەمێکی لیبراڵیانــە هەیــە. ئــەو یاخیگەرێکــی پارێزخــوازە، زیاتــر لــەوەی شۆڕشگێڕ بێت. شــکۆی بنەماڵەکەی و بوونی ڕۆحێکی نەبیلانە لە کەســایەتیدا، ڕێگەی نەدەدا یاخیگەرانە بنووســێ، بەڵام یاخیگەرانە بیری لە ســەردەمەکەی خۆی دەکردەوە، ئەمەش تا ئەو سنوورەی کــە بیروڕای گەلێک لە هاوتەمەنەکانی خۆی و نەوەی دوای خۆی، وەرسی دەکرد..

ئەو، ئەنتی زانستیی نەبوو، بەڵام دژی خستنەڕووی سیستەماتیکیانە و بۆچوونــی ئەکادیمیکیانە بوو، لەگەڵ ئەوەشــدا هەموو شــتێکیی لە زانســتدا کورت نەدەکردەوە. زانســت بۆ ئــەو تەنیا دەریچەیەک بوو، کەلێن و دەلاقەیەک و بۆچوونگەلێکی لەسەر دنیای ماتەریالی بەدەست دەهێنا، بەڵام ژیان و بوون بەلای ئەوەوە هەر تەنیا کورت

نەدەکرانەوە لە ماتەریالیەتدا. بڕوای ئەو فراوانتر بوو لە ئەنجامگەلێکی زانستیانە و ئەکادیمیکیانە. ئەو بەمکارەی جیاکارەیەکی دیاری لە نێوان خۆی و نەوەی پێشخۆی، دروستکردبوو.

زۆر زۆرم پێخۆشە کە لەسەردەمی ئێستادا نەژیا و دوور لە کەشوهەوای ڕۆژانەی کوردی عێراقەوە ژیا. ئەم کەشوهەوایە بۆ ڕۆشنبیریی ڕاستەقینە و بیرکرەوەی شێلگیر، ژەهراویە و کەم کەس دەتوانێت بە حورمەتی خۆیەوە، لە هرووژمی ناکەسان و لاساییکەرەوە و دەروێشانی هزر، ڕزگاری ببێت. ئەگەر وا نەیابە و ئەو لێرە و لە کەش و هەوای شێوە ئازادانە و بەناو دیموکراتیانەی هەرێمدا ژیا با، ئێستا مەسعود محەمدێکمان نەدەبوو، کە لە کەناڵ و میدیا و تۆڕە کۆمەلایەتییەکانەوە، سوکایەتی پێنەکرابێت.



قەڵا گەورەکەی ژنان:

## ڕووناک خان..

پێش دە ساڵ، یەکەمجار لە سلێمانی و لە ئۆفیسی کارکردنیدا ناسیم و بە دیداری شاد بووم و هەگیز بیرم ناچێتەوە. سادەیی و حیکمەت و شەونخونی و دڵسۆزیم لە سیمایدا بینییەوە. ئەو خانمێکی ڕێک و پێک و جوان، قسە ڕەوان و بە ویقارِ، بەڵام هەر زوو زانیم چیتر چاوەکانی هاوکاری نین بۆ خوێندنەوە، ئەگەرچی پێیانگوتم کە هاوکارەکانی وتار و کتێبی بۆ دەخوێننەوە و ئەویش بە وردی گوێ دەگرێت. جگەرە؟ نامەوێت باسی بکەم، چونکە ئەو بەبێ جگەرە هەست بە تەنیایی دەکات. دڵم نەهات پێی بڵێم: لێی دوور کەوە، چونکە دەمزانی تەنیایی ناخۆشە.

من باسی ڕووناک خان دەکەم، ڕووناک ڕەووف، یان دایکی دکتۆر بەرهەم. سالانی سەرەتای دوو هەزار بوو، گەرمەی خەباتی ژنان و دالدەدان و دەیەی بەدەنگەوەچوونی ژنانی لە عەشرەت و خێڵ و پیاو هەلاتووان و دەیەی فەریادڕەسی ژنانی بێچارە. ئەو لە ڕیزی

هەرە پێشەوەی ئەو دالدەدەرانەیە، کە نەک ئێستا بەڵکو سەدان ساڵیتر تەنیا لەبەر ئەوە، نەک هەزاران کاری تر کە کردوویەتی، ناوی بە درەوشاوەیی دەمێنێتەوە.
دکتۆرەکانی چەندینجار پێیان گوتبوو، پێویستە پشوو بدات و لە شوێنی قەرەباڵغی دوور بکەوێتەوە. بەڵام ئەو پشوودان نازانێت و ماڵ و ئۆفیسەکەی کردبووە شوێنی ئیشکردن و پێشوازیی لە خەڵک: لە کۆنە ناسیاوان و لیقەوماوان و خاوەن کێشە و هەژاران. کارڕاییکەر بوو، بە شەویش هەر ماڵەکەی جمەی دەهات..
زۆر لە مێژبوو سەفەری دەرەوەی نەکردبوو، بۆیە پێشنیارم پێکرد لە خزمەتیدا بچینە بناری سیوەیل و شارباژێڕ. ئەوێ دەناسێ و بە ئاوارەیی و کار لە ڕابردوودا ئەو ناوەی بینیبوو. هیچ دوودڵ نەبوو، یەکسەر بڕیارماندا و هەفتەیەک لەوە دوا بە کاروانێکی دوو سەیارەیی بە ڕێکەوتین. ئەو زۆر جوانپۆش و خانم بوو. ژنێک مەگەر بتوانین بە دووەمین حەپسەخانی نەقیبی سلێمانی ناوی ببەین، بەتایبەتی لە خۆنەویستی و ئامادەیی بۆ بەخشین و هێورکردنەوەی بارودۆخە گرژەکان و بینینی کێشەکان لە گۆشەنیگای ژنانە و دایکانە و کوردیانەوە. زۆرجاریتر بە دیداری شادبوومەوە. هیچ کاتێک لە ناسینی ئەم کەسایەتیەی کۆمەڵگاکەمان، کە جێدەستی ڕۆژگار و ژنبوون و کوردبوون بە هەناسەکانییەوە دیارە، پەشیمان نەبوومەوە. زۆربەی جار و بە هەمیشەیی هەستمکردووە ڕووناک خان، ڕووناکترمان دەکاتەوە و ڕووبارێکە بۆ فیتنەکوژاندنەوە و هێورکردنەوە. لەم ڕووەوە بەرهەم ساڵح جگە لە لێهاتوویی خۆی، بەتەواوی پەروەردەی ئەم ژنەی پێوە دیارە، چ لە ڕاستگۆیی و چ لە ڕاشکاوی و چ لە پاکیدا. من هەر زوو زانیم ئەم خانمە بۆ هەمیشە دایکی ئەو سیاسەتمەدارەیە و وەهام بە بیردا دەهات کە لە کۆی

ئەو پۆستانەی د. بەرهەم لەم دە ساڵەی دواییدا پێی سپێردراون، ڕووناکخان وەک دایک و وەک ڕاوێژکار لەپەنایەوە ماوەتەوە. من جێدەستی بیرکردنەوە ئاشتیخوازەکانی ئەوم بە بڕیارەکانی ئەمیانەوە بینیوە. ئەو نمونەی ئەو دایکانەیە کە هەمیشە بەدوای ڕاییکردنی کێشەکان و ئاشتەواییدا دەگەڕێت.

پێش ئەوەی بەرێکەوین، لە چەندین شوێنەوە تەلەفۆنیان بۆ کردبوو، لە ئەمەریکاوە و لە بەریتانیاوە، ئاخۆ ڕاستە گەشتێک دەکات و ئاخۆ ئەو سیحربازە کێ بێت کە قەناعەتی پێکردووە بۆ ئەو گەشتە؟ کەس بڕوای نەکردبوو، ئەو بچێتە دەرەوە و کەمێک پشوو بدات. بەڵام ئەو بڕیاری دابوو بچێت خزمەکانی ئەو بنارەی سیوەیل بەسەر بکاتەوە. کاتێ گەیشتینە گوندیی (بارێی بچووک)، وڵاتەکەمان بە قۆناغی وشکەساڵیدا تێپەڕ دەبوو، بەڵام لەو ناوچەیەی ئێمەدا، هاوینێکی فێنک بوو، چونکە دەستی وشکەساڵی نەگەیشتێ و درەختەکان کەسک و جوان دەیاننواند. سرووشت، سرووشتێکی تایبەت بەخۆی هەیە و پێویستە لێی تێبگەین چونکە ڕاستەوخۆ لە ژێر فەرمانی دروستکەرەکەیدا کار دەکات.

ئەو دوایی پێگوتم: هەتا نزیک و نزیکتر بووینەتەوە هەستی بەوە کردووە قورساییەک لەسەر دڵی لا ئەچێ و هەست بە ئاسوودەیی دەکات. بۆیە کاتێک گەیشتینە ئەوێ، حەزی نەکرد بە جلی فەرمییەوە دانیشێ و کردی بە ماڵی خۆی. ئەمەش ئەوی ئەوەندەی تر خۆشەویست کرد. حەوت دەروونناس هێندەی ئەوَ لە سایکۆلۆژیای مرۆڤی کورد نازانن. سرووشتێکی ئەنترۆپۆلۆژیانەی بەرزی هەیە و لە هەموو شوێنێک و لەگەڵ هەمووان خۆی دەگونجێنێ و هەر زوو بڕیار دەدات تێکەڵ ببێت و بکەوێتە قسەی خۆش و نەزیلە گێڕانەوە. هەرزووش فەرمووی، «من ئەم شەو لەم شوێنەیا ئەخەوم،

لە ژێر ئەم کەپرەیا، بە ساقەو بم». ئەم دەربڕینەی زۆر دووبارە دەکاتەوە، بە ئەندازەیەک دەتوانم بڵێم هیچ کوردێکی نەبینیوە ئەگەر جارێک خۆی بەساقە نەکردبێت! ئەو دایکە، داییک..

ئێواریٚ، مەجلیسەکەی هێنایە پێکەنین. هەر لەسەر سفرەی نانخواردن یەک دوو قسەی ئەوەندە خۆشی کرد، کە هەمووممان ئیشتیامان کرایەوە. هیچ تەشریفاتی نەبوو، سادە و کوردانە. لێرەدا بۆ ئەو کەسانەش دەیانەویٚ ڕۆژگاریٚ کتێبێک و باسێک لەسەر خواردنە کوردییە کۆنەکان بنووسن و ئەو بۆنانە بزانن کە ئەو خواردنانەیان تێدا پێشکەشکراون، پێویستە ڕووناک خان ببینن و لێوەی فێربن و زانیاریە زۆر و دەگمەنەکانی بکەنە سەرچاوەی خۆیان. ئەو هەمیشە پشتی بەخۆی بەستووە. کۆی ئەو کچانەی لە دەوروبەری بوون و لەگەڵیا ژیاون ئەم خەسڵەتەیان لەوەوە وەرگرتووە. هیچکات خۆی لە خۆی نەگۆڕاوە و ئیشەکانی بەدەستی خۆی کردوون. هیچ پلەوپایەیەک ئەویان لە دایکایەتی و سادەیی و قسەحازری نەخستووە. هیچ سەرکردەیەک نەیتوانیوە گوێی لێنەگرێت. ئەو هەمیشە ڕووناک بووە و ڕووناکیبەخش..

ڕووناکخان، ژنێکی زمانپاراو، هاندەر و ستایشکەرە. ئەو ستایشی ئەو کەسانە، بەتایبەتی ئەو خانمانەی دەکرد کە لە هەرێمدا و بۆ بەرژەوەندیی ژنان کار دەکەن. بۆ ئەو ژن لە هەر شوێنێک ستەمی لێبکرێت وەک یەکە و هەرکەسیش هاوکار و پشتیوانی بێت، جێگەی ڕێز. گەلێک لەو خانمانەی لە بوار و ژینگەی کارەکەیدا ناسیمن، ئەویان وەک دایکێکی نمونەیی و پشتیوانێکی پۆڵایینی ژنان لە وڵاتدا دەبینی و خۆشیاندەویست. دەتوانم بڵێم ئەو لە سەردەمی دوو ئیدارەییشدا خەمی ژنانی هەولێر و ناوچەکانیتری هەبوو. هەربۆیەش ئەوکات بوێرانە سەنتەریان کردەوە و بەو پەڕی زرنگییەوە کاری

خۆیان بردە پێش. هەر زوویش لێرە پەیوەندییەکانیان پتەوکردن و خانمانی چالاکوانی بواری ژنانی لەم شارەدا لە دەور کۆبوونەوە. بیرکردنـــەوەی ڕووناکخـــان ڕۆشـــنگەرانەترە لـــەوەی کۆمەڵـــگای کوردســـتان پەســـەندیی دەکات، بـــەڵام ئـــەو لـــە جیاتـــی ســـازش لەگـــەڵ کۆمەڵگادا، ســـووربوون و جەختکردنـــەوەی هەڵدەبژارد بە خۆبەدوورگرتن لە هەرجۆرە بارگرژییەک. وام بە بیردا دێت ئەگەر کێشـــەیەک هەبایە و بەهیچ کەس چارەسەر نەکرابا، ئەو ئومێدێکی چارەسەربەخشی بۆ دەبینیەوە، نەک بە قسە بەڵکو بە کردەوە. هیچ شتێک ئەوی هێندەی دواکەوتوویی هزری کۆمەڵایەتی و توندوتیژی ئازار نەداوە، بەڵام ئەوەش واقیعە کە دواکەوتوویی و نەریتخوازیی کۆمەڵایەتی لەهەر ئان و ساتێکدا بەرهەمدەهێنرێنەوە.

دوای ئـــەو ســـەفەرە لە زۆر بۆنەی تردا بە دیداری شـــادبوومەوە. لە کۆڕێکی ئەوســـای بزووتنـــەوەی ڕیفراندۆمدا پێی گوتم: «حەزم نەکرد برۆم پێشـــئەوەی گوێم لە ســـمینارەکەی تۆ بێت، بەســـاقەو بـــم..». دواجار، کاتێ لە ئاهەنگی یەکســـاڵەی گۆڤـــاری (والاپرێس) دا بینیمـــەوە، کەمێـــک مانـــدوو بـــوو، بـــەڵام خەمەکانـــی کۆمەڵگای کوردستانی بیر نەچووبۆوە.

ئـــەو نموونەی ئەو ژنانەی کوردســـتانە، کە لـــە ئاوارەیی و کۆڕەودا ڕێـــی کەوتە خۆرهەڵاتی کوردســـتان و لەوێش دۆســـت و هاوڕێی دۆزینەوە، کە هەتا ئێســـتاش بە پێچەوانەی زۆربەمانەوە، کە چیتر میوانداریـــی و داڵـــدەی کوردانی خۆرهەڵاتی وڵاتمـــان بیر نەماوە، وەفـــادارە بـــۆ ئەوانەی لـــە خەمیدا بـــوون. ئەمێســـتا چاوەکانی کز بوون، بەڵام دڵەکەی وەک هەمیشـــە لە جاران گەورەترە. هیوادارم هەر لەناوماندا بێت بە لەشـــی ساخ و تەمەنی درێژەوە، چونکە ئەو ڕووناکیە بۆ وڵاتەکەمان پێویستە. دایکم لەسەرەتای ئەم بەهارەدا، لە

ئاواییەکەمانەوە (بارێی بچووک)، تەلەفۆنی بۆ کردم و فەرمووی تا بڵێی ئێرە خۆشە، بۆچی ڕووناکخان بانگهێشت ناکەیت لە خزمەتیدا بیـن؟ ئەویش ماڵی خۆیەتی، هەرکات حەز بکات با بفەرموێت، بەهار بەبێ ڕووناکایی شتێکی کەم دەبێت..

زۆرجار کە شـــتێکم لەســـەر کەسێکی سرووشــت توند و تەبیعەت شـــەڕانی خوێندۆتـــەوە، یـــان کتێبی نووســـەرێکی تـــووڕە و پڕ لە هەراوهۆریـــام بەرچاو کەوتـــووە، بەدوای ئەوەدا هەســـتمکردووە شـــەڕانییەت و توندوتیـــژی و هەرچـــی گـــوزارە زمانییەکانـــی ئەو کەلتـــوورەی ئـــەو نووســـەرانە قســـەیان لێوەکـــردووە، لە منیشـــدا شـــەپۆلی داوە و زۆریشـــی ویســـتووە تاکو خۆمی لێـــڕزگار بکەم و ببمـــەوە بە مرۆڤێک، کە لە ســـادەیی خەیاڵەکانـــی خۆیدا، بۆ مانا جوانـــەکان و بەهـــای ژیـــان دەگەڕێـــت. نازانم ئـــەوە پەیوەندیی بە بوونی شەڕانییەتێکی زگماکیانەی مرۆڤەوە هەیە، یان بە کاریگەریی خێـــرای توندوتیژی بۆســـەرمان و زوو بێداربوونەوەی خرۆشـــانە دەروونییـــەکان، کـــە وادەکات ئێمە لە ئاســـت هێزە شـــەڕانییەکاندا ئەوەنـــدە زوو بێینـــە وەڵام، یـــان پەیوەندیـــی بـــە ترســـەوە هەیـــە لەوشـــتانەی سرووشتی و ئاسایی نین و وامان لێدەکەن، بەدوایاندا

ویـڵ بین بەنیـازی ئاشـکراکردن و ڕەواندنەوەی ترسـەکانماندا؟ بەهەرحاڵ، قورسـە پەروەردەبوون لـە کۆمەڵگایەکی توندوتیژاوی و پـڕ لە تۆڵە و ڕقدا کە زمانێکـی ئەڵتەرناتیڤ نەبێت بۆ گفتوگۆ و قسـەکردن لەسەر بوون و ژیان. لەوەش قورستر بوونی ئەدەبیات و زمانێکـی میزاجیانەیـە لە ئەدەب و نووسـیندا کـە ئەم ناکۆکەی نێـوان بـوون و ژیان و نێوان تاکە مـرۆڤ و دەوروبەری و نێوان ناخی کـەس و خەیاڵەکانی قووڵتر بکاتـەوە. ئەمجۆرە کۆمەڵگایانە و کەلتـووره توندوتیژاویەکـەی ناویان، کاریگەرییەکی سـەراپایی لەسەر پەروەردەکردنی هەستەکانی تاکەکەس هەیە و بەبێ ئەوەی بەخۆمان بزانین لە شـتە نەرم و نیان و جوانەکان بەتاڵ دەبینەوە و پڕدەبین لەو شـتانەی کە بۆ مرۆڤبوونـی ئێمە و بەختەوەریمان پێویسـت نیـن، ئەگەرچـی مرۆییـن. لـەم کۆمەڵگایانەدا، هەسـتی گوێگرتن و بیسـتن و تێگەیشـتن زۆر لاوازە. هەروەکچۆن هەستی بۆنکردن و بینین و دەستێوەدان هەژار دەبن و مرۆڤ لە چێژی ئەو جۆرە هەستکردنە خۆی بێبەش دەکات. ئێمە ئیتر زۆر کەم باوەش بەیەکتـردا دەکەین، زۆر کەم بە قووڵیی تەماشـای یەکتر دەکەین، ماچ و مووچ ڕۆی، زۆر کەم بۆنبەیەکترەوە دەکەین و ئیتر دەنگ و تۆن و مۆسیقای ئاخاوتنەکانمان سەرنجمان ڕادەکێشن. توندوتیژی و حەماسـە، سیاسـەت و کێبڕکێ و ناکۆکییە یەکبەدوای یەکەکان بواری پەروەردەکردنی هەسـتە ورد و ناسکەکانی ئێمەیان کوشت. تـازە ئێمە لـە تەنیایی و ڕەنگە پاییزییەکان، لە پیاسـەی شـەوان، چوونە بەرباران و گوێگرتن لە دەنگە سرووشـتییەکان دەترسـین و خۆمانیان لێدەدزینەوە. پەیوەندیمان بە ژنەوە زۆر سـنووردارە: چـی دەربارەی مێینەیی ژن دەزانین؟ هیـچ. لەمەدا زمانی هەوەس و داگیرکردن بەسـەر زمانی بۆنکردن و بینین و گوێبیستیماندا باڵا

دەستە. ئەگەر ژن بە چوکلێتێ بچوێنین، ئێمە یەکسەر دەیخۆین بەبێ ئەوەی بۆنی بکەین و هەستی پێبکەین و بیبینین. کەلتووری توندوتیژی بەهای هەموو شتێ لە دوو خاڵدا کورتدەکاتەوە: یا هەموو شتێ بەهای مەسرەفکردنی هەیە، بەهای خواردنی هەیە چونکە مانەوەی ئێمەی لەسەر بەندە. یان ئەوەتا هەر شتێ کە سوودی بۆ مانەوەی ئێمە نیە، بەهای لەناوبردن و خاپوورکردنی هەیە. ئەگەر شتێ شیاوی خواردن نەبێت، فڕێیدەدەین. ئەگەر ژنێکمان بۆ داگیر نەکرێت، پێستەکەی، جوانییەکەی، قژی، قاچی، جل و بەرگی، بۆن و بەرامەی، ڕەنگی، ئامادەیی، کەسایەتییەکەی، تاکایەتیەکەی، گەورەییەکەی، حەرام دەکەین. ویستی خاپوورکردن و نغرۆکردن و لەناوبردن، لە توندوتیژییەکی بێوەنەوە سەرچاوە دەگرێ، کە زادەی ژیان و کەلتوورێکە کە شاعیرییەتی خۆی لەدەستداوە.

هەروەک سەردەم و بارودۆخیی ئێستا، لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا، کە ئەو دەم، هەم من لە سەرەتاکانی هەوڵدانمدا بووم بۆ لە خۆتێگەیشتن و هەم لە دنیا حاڵیی بوون، پێویسیم بە دەنگێک هەبوو، کە بتوانم لە ڕێگەیەوە کەمێ دنیام لەوە زیاتر خۆشبوێ، کە خۆشمدەویست و هەم شتێکیش هەبێت ڕامکێشێتە ناو زمان و خەیاڵ و خۆشەویستییەوە، تا لەوێدا پتر بەخۆم ئاشنابم، کە جیاوازبێت لە زمانی پڕگریی سیاسەت و توندوتیژی. حەمە عومەر عوسمان دەنگی هەشتاکانی خۆشەویستی و سەدای هەمیشەیی زمانی شیعرە، کە نمونەیەک بوو هات و هەرگیز ئاوا نەبوو. لە نەوەیەکدا سەریهەڵدا و بووە شاعیر و دەنگی گشت نەوەکانی پاش خۆی. لە شارێکەوە پەیدا بوو، دواتر بووە کوڕی شاران و لەنامەی عاشقانەی گشت نەوەکاندا فرمیسکی بۆ خۆشەویستی ڕشت: ئەو

لە گەرمیانەوە بۆ کوێستان و لە دەشتی شارەزوورەوە بۆ دەشتی بێتوێن و بۆ قەڵای هەولێری داگیرکرد. حەمە عومەر عوسمان، دیدی زۆربەمانی لەسەر (گەڵا) و (زەردیی) و (پاییز) و (جوانی) و (جودایی) و (لووڕەی گورگ) و (گڤەی با) و، (ئێوارە) و (پیاسە) و (باران) و (دیدار) و (مەرگ) و (گۆڕستان) و (کێڵ) و (زێوان) و (گۆڕ) و (چاوەڕوانی) و (پیاسە) و (دارستان) و (ئەستێرە) و (هەور) و (ئاسمان) و بە گشتیی لەسەر سرووشت، گۆڕی و سەرلەنوێ هەستەکانی ئێمەی پەروەردەکردنەوە. ئەو لە شارێکەوە پەیدا بوو، کەچی بووە کوڕی گشت ئاوەدانییەکی ئەم نیشتیمانە. لەهەرشوێنێ دڵ هەبێ و زیندوو بێ و عاشق بێ، حەمە و شیعرەکانیشی لەوێن و نایەنەوە. پاشان سنووری وڵاتانی بەزاند و هەر لە هەشتاکانەوە، لە کۆچی گەورەی نەوە بریندارەکەی سایەی بەعسەوە تا کۆچی نەوە نائومێدەکەی دوای ڕاپەڕین، (لەغوربەتا)یان بەبای کۆچدا بردە هەندەران و لەوێ نیشتیمانیان پێدروستکردەوە و لەوێشەوە دیسانەوە هێنایانەوە نیشتیمان. بەبێ ئەو، بەبێ ئەوەی ژەنراڵێکت لەگەڵ بێ، شەڕی تەمەن و شەڕی غوربەت کۆتایی نەدەهات. بەجۆرێ چیتر ناوی ئەو، وەک ناوی نالی و حاجی کاک ئەحمەدی شێخ و مەولاناخالیدی نەقشبەندی و هەردی، لەناوی کوردبوون و غوربەتی وڵات و حوزنی ڕۆح جیا ناکرێتەوە. حەمە لە پێگەی شیعریی خۆیەوە، بۆ نەوەی نوێی هەشتاکان، ڕێبازێکی ڕۆحیی و تەریقەتێکی مەعنەوی بوو زیاتر لەوەی تەنیا شاعیرێک بێت، شارەزا لە کێشی پەنجە و هونەری چوارینە نووسیندا.

سەرەتای سەرەتاکانیم بیر نییە، بەڵام کە بەیەکتر ئاشنابووین هەردووکمان نامۆ و هەردووکمان ماندوو و هەردووکمان وزەیەکی زۆرمان تێدا بوو، بەڵام ئەو زۆر شاعیر و زۆر لە منیش بە

ئەزموونتر، لەگەڵ ئەوەشـــدا سەرەتای پەیوەندییەکی هاوڕێیەتیمان دامەزراند کە کتێب و شیعر و هەندێ وردەڕاز و گلەیی لە زەمانە و ناڕەزایەتییەکی زۆر لە دەسەلات، ناوەڕۆکەکەی بوو.

حەمــە عومــەر بۆخــۆی فیگەر و کەســایەتییەکە، بــەلای منەوە لە شیعرەکانی جیا ناکرێتەوە: زۆرجاران ئەوم بینیوە، دەنگی هەڵبڕیوە، تۆراوە، زویر بووە، هاواریی کردووە، بەلام هەرگیز وەک مرۆڤێکی توندوتیژپەرســـت و توندڕەوخواز نەمناســـیوە. ئەو تەڵقینی گەلای زەرد دەدات و بانــگ بەگوێــی گۆپکــەدا ئەدات تــا بوونە خونچەی بیرخاتەوە.ترسی لەباران و شەوانی تەنیایی و سەردانی گۆڕستان و چوونـــەوە ناو یـادوەری و وێنەکانی و بە بیرهێنانەوەی نیگار و ئەزموونە خۆش و ناخۆشە کورتخایەنەکانی لەگەڵ یاردا نییە. حەمە عومەر هەمیشـــە پەروەردەکەری ئەو بەشـــەی هەستەکانی مرۆڤە کە کەلتووری شـــەڕانییەت و توندوتیژی، دەیانسڕێتەوە و لەناویان دەبات. ئەو کەســـایەتییەکە، پێویســـتە بەردەوام بگەڕێیینەوە لای تا لەناو هەزاربەهەزاری زمانە نەرمەکەی و مۆســـیقا و کێشـــی شیعر و وێنــە پاییزییەکانییەوە، هەســـتەکانمان لە هێزی لەبیرچوونەوە و لەناوچوون ڕزگار بکەین.

لەسەردەمێکدا، کە چ ئۆپۆزیسیۆن و چ دەسەلات قسەیەکی خۆشیان لە زمانی تۆڵە و ڕق و کینە بۆ نەوەی نوێی گەنجان زیاتر پێنەماوە و کەلتـــووری هەســـتکووژی و توندوتیـــژی و نغرۆکۆدنی یەکتر و داگیرکردنەکان بلاو دەکەنەوە، حەمە عومەر عوسمان شاعیرێکە بە بیرماندەخاتەوە، کە زمانی ئەڵتەرناتیڤی ئۆپۆزیســـیۆن و دەسەڵات، زمانـــی هەســـتپەروەری و ڕۆچوونەوەیە بـــەرەو دۆزینەوەی ئەو پەیوەندییە ناسک و ورد و هەستیارەی نێوان تاکەس و دەروبەر و نێـــوان دیمەن و بینین و نێـــوان خود و یادوەری و نێوان ئەزموون

و کۆستکەوتن و بەردەوامیدا. حەمە عومەر شارانگەڕێکە سەر بە هەموو کۆلانێکدا دەکات و مالانگەڕێکە لە هەموو دلێکدا میوان. ئەو پتر لە هەر سەرۆک و سەرکردە و دەسەلاتدارێکی ئەم ولاتە، بەدەسەلاتتر و خۆشەویستتر، بەجۆرێ کە ئەگەر لە هەر هەلبژاردنێکدا خۆی هەلبژێرێ، بۆری هەر هەموویان دەداتەوە. حەمەگیان لە هەرکوێ هەی، ئەمجارەیان خۆت هەلبژێرە تا نەوەکان دەنگت بۆ بدەن، چونکە دەنگدان بە تۆ، دەنگدانە بە ئەو جوانیانەی کە هەرگیز لە مرۆڤدا کۆن و ناشیرین نابن: دەنگدانە بۆ "لیستی لە غوربەتا"..



ژنی لەوبەری تاراوگەوە،
لەم نزیکانەی نیشتمان..

**نەزەند بەگیخانی**

هیچم لەبارەیەوە نەدەزانی بەڵام ناوەکەی بۆمن سەرنجڕاکێش بوو، کە ناوی یەکێ لە قارەمانانی بەیتە کوردییەکانی بیر دەهێنامەوە. یەکەمجار نازانم لەکوێ یەکترمان ناسی، بەڵام لەبیرمە جارێک لە شارێک لە دانمارک، ساڵی ١٩٨٩ یان ٩٠ لە بازاڕی شارەکەدا، یەکێ لە هاوڕێکانم ئاماژەی بۆ خانمێک کرد و گوتی: ئەوە (نەزەندبەگیی خانی)یە.

ئەو شۆخ و شەنگ و باریک، چاووبرۆ کورد، باڵا بەرز. بەڵام من لەیەکەم نیگاوە خۆشم نەویست، چونکە وشکایەتییەکم تێدا بەدیکرد و ئەمەش وایلێکردم حەزنەکەم زیاتر بیناسم. من هەمیشە لەم بڕیارانەمدا بەهەڵەدا دەچم و ڕەنگە لەو دنیا بەتایبەتی لەسەر ئەم کارەم، سزایەکی جەهەندەمی بدرێم کە دیمەنەکەی بەمجۆرە دەبێت: من بە ڕووت و قووتی بە تەنافێکی باریکدا، کە ڕەوڕەوەیەکی لێبەستراوە، سەربەرەوخوار هەڵواسراوم و دەست

و قــاچ بەســتراو، هەموو ئــەو خانمانەی بەوجۆرە و لــە ئەنجامی گەمژەییەکانمەوە، حوکمم بەسەردا داون، ڕیزیان بەستووە و یەکی قامچیەک بەدەستەوە. بەهۆی ڕەوڕەوەکەوە، من بەبەردەمیاندا دێم و ئــەوان تەماشــایەکم دەکەن و یەکی یەک قامچیــم بە ئارەزووی خۆیان پێدا دەکێشن. کاتێ دەگەمە بەردەم هاوسەرەکەم، دڵی نایەت و قامچییەکە دادەنێ و بەئارەزووی خۆی باوەشــێکم پیا دەکات و ئەمجــا یەک زللەی قاییم بە لاقوونمدا دەکێشــێت و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بە خێرایی بەبەردەمی ڕیزێ لەو ژنانەی بە قەمچییەوە بــۆم وەســتاون، تێپــەڕم و دواجــار لەبەردەمــی نەزەنبەگیخانیدا دەوەســتمەوە. ئەویش بزەیەک دەیگرێ و لەکاتێکدا قامچییەکەی بە شلیی گرتووە، پێمدەڵێ: قەیناکا، ڕێبوار گیان دەتبەخشم. تۆ پیاویت و پیاویش نەزانن!

بەمجۆرەش من بەو ئاسمانەوە، لە پیاوبوونی خۆم تەریقدەبمەوە و لەوسەرەوە، خوای گەورە فەرمان دەردەکا: بیبەخشن، مادام ئەوان بەخشییان..

ئــەو ئێوارەیــە لەماڵمــان بــوو، ئێــوارەی خۆڵبارینەکــە. پێشــتر تەلەفۆنیکــرد و گوتی: لەگەڵ دوو میــوان دێینە ماڵتان، خواردنێکی خۆشــمان بۆ لێبنێ. هەر لە حەوشــەکە دانیشتین و تا درەنگانێ بە گفتوگــۆ و قســەکردن و پێکەنیــن، تێمان پەڕاند. لەبــەر میوانەکان زۆربەی کات زمانی هاوبەشــمان بە ئینگلیزی و دوایی بە کوردیی بــوو. ئینگلیزیەکەی من جگە لەوەی دووکــەڵ دەکا، ئاواش ئەوەی لە میشــکمدایە بە زمانێکی وێنەیی دەیکەمــە ئینگلیزی بەبێ ئەوەی وشــەی گونجاوی بۆ بەکار بهێنم. کاتێ هەستمدەکرد خۆشم باش نازانم ئەڵێم چی، کەچی ئەوان بۆیان دەسەندمەوە و هەر بەو زمانە شــیعری و میتافۆرییەی من درێژەیــان دەدایی و قاقا پێدەکەنین و

منیش لە ناخەوە بەخۆمم دەگوت: بزانە کوو تێیاندەگەیەنی! ئەو هەندێ کات بێدەنگ بوو. بەڵام هەمیشە دەم بەخەندە. قسەکانمان لەبارەی مافی مرۆڤ لە هەرێم بوو. پاشان باماندایەوە سەر مرۆڤ و ژن. ئیتر بەردەوام بووین. من خەمی ئەوەم نەبوو لە گفتوگۆکەدا دەتوانم بەگریی لە بۆچوونەکانم بکەم، یان نا، خەمی ئەوەم بوو دوایی لەسەر ئەو قسانەی کردومن، دایکی منداران هەڵوێستی چیی دەبێت. بۆیە هەر لەسەرەتاوە، ستراتیجی خیانەتکردنم لە پیاوبوون دارشت، هەتا بتوانم هەم دنیا و هەم قیامەت بەرمەوە..

لەدوای ئەو یەکەمجار بینینەی دانمارک، ئیتر نەمبینیەوە، هەتا پاریس. بەڵام ئیتر هەردووکمان لە گۆڤاری (یەکگرتن)دا، کە هاوڕێمان هەڵکەوت عەبدوڵا و گەلاوێژخان و زریان کاکەیی و لوقمان تاڵەبانی بڵاویان دەکردەوە، دەستمان بە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانمان کردبوو. ئەو زیاتر شیعرەکانی تێدا بڵاو دەکردنەوە و شیعرەکانیشی سەرنجی منیان ڕادەکێشا. بەڵام کاتێ، هاوڕێمان، ئەحمەدی مەلا وتارێکی لەسەر شیعرەکانی (یەکگرتن)، نووسی، لە باسی ستایلی شیعری نەزەندبەگیخانیدا هەندێ شتی ئەوەندە جوانیی نوسیبوو، کە منی هاندا بۆ دووبارە خوێندنەوەی ئەو شیعرانەی. هێشتاش شیعرێکیم لە بیرە، کە ناوەڕۆکەکەی باسی چوونە کەنار دەریایەک دەکات، ئەو یاداشتێک لەسەر لمی کەنار دەنووسێت. شیعرەکە باسی پێکەوەبوونێک دەکات، کە پڕە لە تەنیایی. لەمەشەوە تێگەیشتم، کە شیعری نەزەندبەگیخانی پتر لەوەی لە ڕێگەی وێنەکانەوە بدوێ، لە ڕێگەی فۆرمێکی زمانییەوە دەدوێ کە بەرجەستەکەری زەینییەتێکی مێینەییە. زمان، لەو شیعرانەی ئەودا بەرجەستەکەری شوناسێکە، کە پێشتر لە شیعری کوردیدا نەبووە، یان زۆر لاواز بووە، ئەویش شوناسی مێیەتی و چارەنووسی

ژنبوونە لە وڵات و کولتوورێکدا کە مێبوون، وەک کەمیی و لاوازیی و شکستێک لێکدەداتەوە. نەزەند لەگەڵ ئەم شکستە لەدایکبوو، بەڵام هەرگیز ئەو لێکدانەوە باوە کۆمەلایەتی و کولتووری و سیاسییەی بۆ مێینەیی پەسەند نەکرد و خۆی نەدا بەدەستییەوە. ئەو و هاوڕێ کچەکانی، تا ئەندازەیەکی زۆر توانیان لەناو زمانی شیعریی باوی کوردیدا، کە لە باشترین بارودۆخدا نوێنەرایەتی مێینەیی و ژنێتی دەکرد، زمانی ژنێتی و شوناسی مێینەیی بەرجەستە بکەن.

سەرەتای نەوەدەکان ئەنیستوتی کورد لە پاریس، بە هەوڵی فەرهاد پیربال، بورسێکی خوێندنیان بەمن بەخشی، بەڵام لە چاوپێکەوتنەکەدا بەو هۆیەی لە دانمارک نیشتەجێم، بورسی خوێندنەکەیان وەک ڕێزلێنان بۆ کردم بە ساڵێک خوێندنی زمان. من سوپاسم کرد و نەمویست. شەوێک نەزەندبەگیخانی کە شوێنێکی دوور لە پاریس دەژیان، لەگەڵ پیربال داوەتی کردین. ئێمە درەنگ گەیشتین و زوویش گەڕاینەوە. بەڵام نەزەندم ڕێک پێچەوانەی ئەو دیدارەی دانمارک بینی، کە ڕۆحی دایکایەتیەکی مەزنی تێدا بوو.
لەگەڵ یەکەم دانیشتنی گۆڤاری (رەهەند) پەیوەندیم پێوەکرد، ئەو نەیویست بچێتە هیچ گرووپێکەوە. خودهووشیاریی ژنانەی ڕێگەی پێنەدەدا ببێتە بەشێک لە گرووپێک، کە بەلای ئەوەوە تەعبیری لە شوناسی ئەو نەدەکرد. پاشان لە لەندەن چەندجارێ یەکترمان بینییەوە و باشتر یەکترمان ناسی. لە ئاهەنگەکان و بۆنەکاندا بینیمەوە و هەمیشە لە لاوە گۆرانییان پێدەگوتم. بەتایبەتی گۆرانییەکانی حەمەی ماملێ و عومەر دزەیی. هەرچەندە ناوەڕۆکیی ئەو گۆرانیانە بەدەر نیە لە مانا پیاوسالارییە باوەکان و لە ڕوانگەیەکی نێرانەوە باسی ژن دەکەن، بەڵام ئیقاع و میلۆدیی گۆرانییەکان کاریگەرییان

هەیـە بۆسـەر قووڵاییەکانی بوونی مرۆیی ئێمـە. ئەمەش هۆکاری ئەوە بوو کە ئەوان پێیانخۆش بوو، گوێیان لە گۆانیەکان بێت..

ئەو ئێوارەیەش لە ماڵی خۆمان داوای لێکردم گۆرانییان بۆ بڵێم. من دەمویست، بەڵام بۆم نەدەگوترا. سەرەتا بەبێ بیرکردنەوە، گوتم، من لە وەرزی زستاندا زیاتر حەزم لە گۆرانیی گوتنە. نەزەندبەگیخانی یەکسـەر گوتی: لەوەرزی تریشـدا گوێم لیتبـووە! بەهەر حاڵ من نەمگوت. ئێمەی پیاو هێشتا نەگەیشتووینەتە ئەو ئاستە کولتوورییەی کە تیایدا میوانداریی بەمانا بەرزەکەی بکەین. ئەتەکیەتی میوانداریی پەیوەندیی نیە بە سفرەبڵاویی و مەسرەفکردنەوە، پەیوەندیی هەیە بە بڕوابەخۆبوون و ڕازییکردنی دۆستان تا ئەوپەڕی چێژوەرگرتن لە کاتی پێکەوبوون. دڵنیام ئەمجارە گەر بەسەر تەنافەکەوە بچمەوە بەردەمی، لەسەر ئەو گۆرانی نەگوتنە، قامچییەکی قاییم لێدەدا..

ئەو سـاڵەهایە لەپاڵ تەواوکردنی دکتۆرا و شیعرنووسین، خەریکی توێژینەوەیـە لـە بارودۆخی ژنان و فۆرمەکانـی توندوتیژیی دژی ژنـان. من لـە کابینەی شەشـەمدا زۆر بۆ ئەوە دەچـووم، بکرێتە وەزیـر، ئەوە ڕوویندا، بەهەمان شـێوە لە کابینەی حەوتەمیشـدا هەمـان چاوەڕوانیم هەبوو. بەڵام ڕوویندا. ئەمە پتر ماهییەتی ئەم حوکمە نێرانەیەمان بۆ ئاشـکرا دەکات، نەک نەبوونی کەسی شیاو بۆ شوێنی شیاو..

دواجار، کتێبی (شەرەف)ی بۆ هێنابووم کە لەگەڵ کۆمەڵێ توێژەری دیکـەدا، نووسـیویانە و بـە بوودجـەی حکومەتی هەرێـم چاپ و بڵاوکراوەتەوە. بۆ ئەمەیان دەبێت دەستخۆشی لە هەمووان بکرێ. لەناو ژنانی ناوداری وڵاتەکەماندا، نەزەندبەگیخانی کەمدووترینیانە، ئـەو زیاتـر کار دەکات، تا قسـە. زیاتر پەیوەندیی دروسـتکەرە تا ڕاگەیەنەری پەیوەندیی. سرووشتی کارەکانی نەزەند بیرخستنەوەی

ئەو شـتانەیە کە ڕاگرتنی تای تەرازووی یەکسـان لە نێوانیاندا، بۆ داهاتوو سوودبەخشن. تەنانەت لە نووسینەوەی مێژووشدا. ئەو بە منی گوت، پێویسـتە لە زنجیرە وتارەکەتدا لەسەر (ڕەهەندییەکان)، باس لە نایەکسـانیی جینـدەری بکەیت. ڕاسـتدەکات، منیش ئەوەم گوتـووە کـە ئێمـەی ڕەهەندییـەکان هەموومـان لـەو خێزانانەدا پەروەردەکراوین، کە ئامادەیان کردووین بۆ ژیانێکی نێرانە.

نەزەند پێیەکی لە کوردسـتانە و پێیەکی لە ئەوروپا. بەشێکی لەناو فـەزای ژیانـی کۆمەڵایەتی و بەشێکیشـی لەناو کەشـی زانکۆییدا. لایەکی ئەوەتا لە کولتووری مۆدێرن و لایەکی ئەوەتا لە باوەشـی کولتـووری نەریتخـواز و پەیوەندییـە نەسـەبیەکانی کۆمەڵـگای کوردسـتاندایە. ئەو لە یەک کاتـدا، دایک و کورد و خۆرهەڵاتیە و لەهەمان کاتیشـدا مێباوەڕ و فیمینیسـت، (لە جۆرە میانڕەوەکەی)، ئەکادیمـی و تاراوگەییەکـە. ئەو نمونەی ئـەو تاراوگەکراوانەیە کە زیـاد لە شوناسـێک و زیاد لـە سـیمایەک و زیاد لـە پێگەیەکیان هەیـە، بـەڵام بەهەمان جەهـەری مرۆڤدۆسـتیی و خەمخۆرییەکی جیهانگەرایانەوە.

لە لەندەنیش جارێک بۆ ئێوارەخوانێک بانگهێشتی کردمەوە: خواردنە سـەرەکیەکەم بیر نەمـاوە، بەڵام ئەو زەڵاتەیەی دروسـتیکردبوو، زۆر سـەرنجڕاکێش بـوو: گـەڵای کاهووەکە بەدەسـت لەتکرابوو، بەبێ ئەوەی بڕاکێ. کاتێ هۆکاری ئەمەم لێپرسـی، گوتی: حەزم لە لەتوپەتکردن نیە! من سـاڵەها لەوەدوا بەبێ ئەوەی قسەکەی ئەوم بیرمابێ، ناخودئاگایانە لە شیعرێکدا نووسیم:

پەنجەکانت ڕابێنە،

با کراسی سپیی کەلەم بکاتەوە.

(کاتێ بە لێو دەخورێ کەلەم



زانست و کوردایەتی:

# پرۆفیسۆر کامیل حەسەن بەسیر

دەڵێن لە کاتی خۆیدا ناویان ناوە تەها حسێنی کورد. بێگومان ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، لە بەرزنوڕییان بۆ ئەو نووسەرە گەورەیەی میسر و لە خۆشەویستیانەوە بۆ کەسایەتیی و داهێنانەکانی ئەمەی خۆمان بووە. بەڵام لەوەدا کە بەراووردکارییەکە بەراووردیی کەسایەتییەکی پێکراوە کە لە بواری خۆیدا هیچ لە تەها حسێن کەمتر نەبووە، غەدرێکی بچووکیان لێکردووە. ڕەگێکی دیکارتیانە و ئەقڵانییەتێکی میتودیک لە هەردووکیاندا هەیە، بەڵام ڕۆشنبیرییە ئینسکلۆپیدیاییەکەی تەها حوسێن، لە هاوشانە کوردەکەیدا، دەبێتە پسپۆڕیی و وردەکاریی زانستیانە.

ئەو کاتەی لە دانمارک بووم، پەیوەندیم لەگەڵ چەند دەزگایەکی مەغریبی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب، دروستکردبوو. هەر چەند مانگ جارێک بە نامەدا بڕێک لەو پارەیەی کۆمدەکردەوە

بـۆم دەنـاردن و ئەوانیش بە ئەمانەتەوەو بـە ڕەچاوکردنی ئەوەی من قوتابیی بووم و بە چاوپۆشـین لە نرخی کتێبەکان، زنجیرەیەک کتێبیـان بـۆ دەناردم و کەمتر لە هەفتەیەک بەدەسـتم دەگەیشـتن. منیش هەموو جارێ لەگەڵ کردنەوەی کارتۆنی کتێبەکان، وتارەکەی واڵتـەر بنیامینم دەخوێنـدەوە، کە تیایدا باسـی کۆکردنەوەی کتێب دەکات. ئـەم ئەخلاقـی داشـکاندنەم لـە کتێبفرۆشـە کوردەکانیش بینییەوە، کاتێ دەزانن تۆ کتێبویسـتی، چاو پۆشـیی لە نرخەکەیان دەکەن و داشـکاندنت بۆ دەکەن.. هەندێکیشـیان بە پیچەوانەوە، بە چەنـد قـات پێت دەفرۆشـنەوە، چونکە دەزانن تـۆ ناچاریت لەوانی بکڕێـت، بـەڵام خۆیان گێل دەکـەن لەوەی کە تـۆ دەزانیت غەدرت لێکراوە. هەمیشـە حەزدەکەم لە دژی ئەمانە شۆڕشـێکی خوێنەرانە بەرپا بکەم و کتێبەکانیان لێوەربگرمەوە، کە ئەوان جگە لە نرخەکەیان هیچ بەهایەکیتریان بۆ قاییل نین. ئەم دەسـتەیە لە بازرگانانی کتێب، هیچیـان کەمتر نیە لەوانەی سـامانی وڵات بەهـەدەر دەدەن، بەڵام ئەمانە بەختیان هەیە کەکەس باسیان ناکات، جارێ بەختیان هەیە.. جارێک لەو جارانە کە خەریکی کردنەوەی پۆسـتی کتێبەکان بووم، ئـەو کتێبـەم بۆ هاتبوو کـە لە لیسـتەکەی خۆمدا داوایـم کردبوو: توێژینەوەکانـی ڕەخنە و فەلسـەفە لەبارەی چۆنیتی گواسـتنەوەی ڕۆشـنبیریی یۆنانی بۆ جیهانی مسـوڵمان نشین، کە تیایدا وتارێکی دکتـۆر کامیـل بەسـیری نەمری تێـدا بوو، کـە لەو کۆنفرانسـەدا بەشـداریی پێکردبـوو، لـە شـوێنێکی شـیاوی کتێبەکەشـدا بـڵاو کرابۆوە. بۆ من ئەمە دووجار خۆش بوو، چونکە من کورد بووم و دکتۆری نەمریش شانازی پێدەبەخشیم کاتێ وەک کوردێکی زانا لە کۆنفرانسێکی ئاوا ئاست بەرزدا بەشداریی کردبوو. ئەم بەشدارییەی ئەو، کەمێ لەو هەستی خۆبەکەمزانییەی کە لەو دەمەدا کوردبوونی

منی داگیر کردبوو، کەمکردمەوە بە شانازیی و متمانەبەخۆکردن پڕدەکردەوە.
شەیدایی من بۆ نووسینی ئەم مرۆڤە بەرزە زۆر پێشتر دەستیپیکردبوو، ئەوکاتەی هێشتا مێردمناڵ بووم و لە سلێمانی دەژیام و خولیای ڕەخنەی ئەدەبی لە سەرمدا بوو، کتێبە گرنگەکەیم بینیبوو بەناوی (ڕەخنەسازی: مێژوو و پەیڕەیکردن). بەڵام بەبێ ئەوەی بتوانم زۆر لێی تێبگەم، هێندە نەبێت دەمزانیی لەبەردەم بەرهەمێکی نەوعیی و بابەتێکی گرنگدام، کە ئەو وەک قرتاڵە چنیبووی و نەیهێشتبوو درزێکی زیایەی تێکەوێت.
لە ساڵەکانی دواتردا، هەرگیز دەستم لە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی بەرنەدا، بەتایبەتی ئەو کتێبەی کە پێشتر ناوم برد و بەرهەمەکانیتری. لەم ساڵانەشدا کاتێک توێژینەوەکانی بەناوی (وێژەی کوردی و ڕەخنەسازی) بە هەوڵی هاوسەرە بەڕێزەکەی (دایکی گیان)، بڵاوکرانەوە، بەتەواوی تێگەیشتم لەبەردەم چ قەڵەمێکی دانسقە و چ داهێنەر و ڕەخنەناسێکی مەزنیی گەلەکەمدام.

نازانم ئەو خەڵکیی کوێیە و لە کوێ لە دایک بووە و کێ پەروەردەی کردووە و چۆن ژیاوە و چۆنی خوێندووە! ڕەنگە هیچکامێک لەوانەش بۆ ئەو گرنگ نەبێت، چونکە شوناسی ئەم قەڵەمە دانسقەیە وەکئەوەی بۆخۆی دەستنیشانی کردووە، لە هەموو ئەوانە گەورەتر و بنەماییترە:

کوردم: ئەمەوێ بڵێن کورد بووە
بۆ کوردایەتی مۆم و پرد بووە
ئەگینا هەرچەند بانگم کەن زانا
بێ وشەی کوردی پووچە و بێ مانا

ئەمە ئەو شیعرەیە کە لە سەرەتای کۆوتارەکانییەوە چاپ و بڵاوکراوەتەوەو تیایدا کوردبوونی خۆی دەخاتە خزمەت کوردایەتییەوە تا وەک مۆم بسوتێ و ڕووناکیی ببەخشێ و وەک پرد ڕایەڵ بێت و پەیوەندیی دروست بکات. من کە ئەم پیاوە دەخوێنمەوە، حەزم دەکرد باوکی من بێت و ئێستا شانازی بە دانایی و کۆی ئەو سیفاتانەیەوە بکەم، کە تێپەڕینی کات و لە بیرچوونەوەی بەرهەمەکانی لە پانتایی ڕۆشنبیری کوردیی و جیهانی ئەکادیمیی ئێمەدا، نەیانتوانیی درەوشانەوەی ئەم بیرمەند و مرۆڤە گەورەیەمان بیر ببنەوە. بە دڵنیاییشەوە دەڵێم: هەتا ئەم ساتەوەختەش لە بواری ڕەخنەسازیی کوردییدا جێگرەوەیەکی دیکەی پرۆفیسۆر بەسیرمان نیە، چ لە ناوەو چ لەدەرەوەی زانکۆکانیش..

ئەو پرد بوو، چونکە لە کۆی بەرهەمەکانیدا هێڵێک هەیە سێ پانتایی و شارستانییەت پێکەوە دەبەستێتەوە و لە بەرزترین ئاست و بە شێوازێکی پوختی ئەکادیمیانە و زانستی، بیروڕاکانی خۆی دەخات ڕوو. ئەو سێ پانتاییەش بریتین لە ڕەخنەسازیی یۆنان و ڕۆمان، ڕەخنەسازیی عەرەب و ڕەخنەسازی کوردی. بە درێژایی یەک تەمەن، ئەم مامۆستا گەورەیە لە هەوڵی دروستکردن و مەحکەمکردنی ئەو پردەدا بوو بەو ئامانجەی لە ڕوانگەی گەشتە زانستییەکانی و قووڵبوونەوە لە بابەتەکانیەوە، ڕووناکیی بخاتە سەر کوردایەتی بەهۆی شیکردنەوە و سەرنجدانی زمان و ئەدەبەکەیەوە.

بۆیە لە ئەنجامی خوێندنەوەی بەرهەمەکانییەوە، هەر زوو دەگەینە ئەو بڕوایەی کە زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پرۆفیسۆرەکەمان هەڵگری ماک و هەوێنی کوردایەتییەکی ڕەسەنە و ئەمیش لە میانەی خەباتێکی دوورودرێژی بەراووردکاریانەو دەستنیشانکردن و بە

کێشـەکردنی پرسـیار و دروسـتکردنی گریمانەدا، لـەو پەیوەندییە قووڵەی نێوان شوناس و نەتەوە، خود و ئەویتر دەکۆڵێتەوە.
ناونیشانی زۆربەی بەرهەمەکانی مامۆستاکەمان هەڵگر و نیشانەی ئـەو ڕوانگە ڕەخنەیی و فەلسـەفییەن کە دانەرەکەیان قسـەی لێوە دەکات: ئەو لە سـەرەتادا ڕەخنەی ڕەخنەگرانی پێشخۆی لە ڕێگەی ڕەخنـەی زانسـتییەوە وەلا دەخـات و لـە هەنـگاوی دووەمیشـدا هەوڵدەدات بناخەی ڕەخنەسـازییەکی تایبەت، چ لە ئاستی تیۆری و چ لە ئاسـتی ئەوەی خۆی پێیدەڵێت: پەیڕەویکردن، لەناو ڕۆشنبیری و بە کەرەسـتەکانی زمانی کوردی، دابمەزرێنێ. کتێبەکەی (زانستی ئاوەڵوەتـا/١٩٨١) یان میتافۆر، یەکێکە لەو شـاکارانەی کە تیایدا بە تەواویی ئەم پرۆژەی هەڵوەشـاندنەوە و دووبارە سـازدانەوەیە لە ڕێگەی گەشتێکی شیکارییەوە بەناو ڕەخنەسازیی یۆنانی و ڕۆمانیی و عەرەبیی و ئەورووپییەوە بۆ ڕەخنەسازیی کوردی ڕەنگیداوەتەوە.
کامیل حەسەن بەسیر، ئاراستەیەکی تیۆری و پەیڕەکارانەی ڕەخنەی ئێمەیـە، کە تەواو لەو گرووپـەی ئەکادیمیسـینەکانی ئێمە جیاوازە کـە لە قوتابخانەی سـۆڤیەتیی جاران و بەپێـی مەنهەجی فیلۆلۆژی خوێندنیـان تەواو کردووە. بەسـیر، پسـپۆڕێکی دەگمەنی زمان و خاوەن ئاراسـتەیەکی ڕەخنەیی شـیکارییە لە بواری ڕەخنەسازیدا. ئـەو جگە لـەوەی شـارەزاییەکی وردی لـە ئەدەبیاتی فەلسـەفیی یۆنانیدا، بەتایبەتیش بەرهەمی ئەفلاتوون و ئەریستۆتالیسـدا هەیە، ئاواش شارەزایەکی وردی ڕەخنەسازیی ڕۆمانیی و عەرەبییەو ئەم پێشـینە مێژووییەش لە بەرهەمەکانیـدا وەک ڕێچکەیەکی میتۆدیک، درێژ دەبێتەوە تا زەمینەی شیکردنەوە و ڕەخنەکانی لەو مێژووە بۆ بڕەخسـێنێ و پاشـان بە دۆزینەوەی بابەتی ڕەخنەکاریی لە بواری پەیڕەویکردنـدا، پەنـا بـۆ ئەدەبیاتی کوردیی کـۆن و نوێ دەبات و

چەمک و تیۆرە و بۆچوونە زانستییەکانی بەسەردا تاقیدەکاتەوە. ئەو بە شـێوازێکی ڕوون و لە دووتوێی زمانێکی تۆکمەی زانستیی و بە چنینێکی ئەکادیمیکیانە دەنووسـێ، بەڵام هەمیشە بە قووڵیی و وردیی بیر لە بابەتەکانی دەکاتەوە.

پرۆفیسـۆر بەسـیر، لـە دوتوویـێ نووسـینە ڕەخنەییەکانبدا هیچ ڕەهەندێکـی سـایکۆلۆژیانە کـە لەپشـتییەوە، خۆهەڵکێشـان، پێشـڕەوایەتی، خۆبەهەمووشـتزان، ڕەتکردنەوەی بـێ بەڵگە و بێ ئامانج ناخاتە ڕوو. ئەو هەمیشە لە گفتوگۆ و بەراووردکاریدایە و لە ئەنجامی ئەمەشەوە مەبەستەکانی خۆی دەباتە پێش و بەردەوامیش بە لێکدانەوەی نوێ و زانسـتیانە، کە ڕەگییان لە سـەرچاوە کۆن و نوێکاندا داکوتاوە، خوێنەر بەسـەر دەکاتەوە. لە سـتایلی بەسـیردا، توخمە ئەکادیمیەکان باڵادەسـتن، بەڵام بەبێ وشکبوونەوەی مانا و گوزارەکان.

شارەزاییە زۆرەکەی ئەو لە ناوەڕۆکی بابەتەکانی و دەستنیشانکردنی میتۆدیـی شـیاوی شـیکردنەوە و هێنانـەوەی نمونـەی زیندووی پێویسـت و گونجاو بۆ سـەلماندنی بۆچوونەکانی و لە سـەرووی هەموو ئەمانەیشەوە، کوردییە ڕەوان و دەگمەنەکەی، ئیستاتیکایەکی تایبەتیـان بە بەرهەمەکانی بەخشـیوە، کە ئەم تایبەتمەندییانە لەلای نـەوەی ئەکادیمییەکانـی سـەردەمی خۆی و تەنانـەت دوائەویش، دانسقەن.

لـە کتێبـی (ڕەخنەسـازی: مێـژوو و پەیڕەویکـردن/١٩٨٣)دا، پرۆفیسـۆرەکەمان چەندە لە خەمی چەسـپاندنی ڕەهەندیی تیۆریی باسـەکەیدایە، ئەوەندەش کۆشـش دەکات بۆ هاوسەنگکردنی نێوان تیۆریی و پراکتیزەکردنی ڕەخنەیی بەسـەر دەقی ئەدەبیی کوردیدا. هەرچەنـدە ئەم کتێبەی بەسـیر، لە رووی سـەرچاوەی تیۆرییەوە،

چەند تێکستێکی مەزنی ڕەخنەی ئەدەبیی وەک بەرهەمەکانی ئەریستۆتالیس و هۆراس، لەخۆی دەگرێ، بەڵام هێشتا قەبارەی کتێبەکە دەمانخاتە بەردەم چاوەڕوانیی سەرچاوەی زیاتر لە نووسەرەکەی. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم کتێبە نمونەی هەوڵدانێکی جیدیی بیرمەندێکی کوردە بۆ بناخەدارشتنی بنەوانەکان و ڕەگوڕیشەکانی ڕەخنەی ئەدەبیی و کردنیان بە کوچەڕێیەک بۆ قسەکردن لەسەر ڕەخنەی ئەدەبی لە چوارچێوەی زمانیی کوردیدا. بەسیر کاتێک لە شیعرەکەیدا دەڵێت: (بۆ کوردایەتی مۆم و پرد بووە) مەبەستی ئەم ڕەهەندەی کارکردنیەتی، کە چۆن لە ڕێگەیەوە هەموو دانایی و زانیارییەکی کەڵەکەبوو دەخاتەوە خزمەت کوردایەتیەکەی..

لە شێوازیی ڕەخنەی مامۆستا نەمرەکەماندا، خاڵێکی جەوهەری و لە هەمان کاتیشدا ئاکاریانەی ڕەخنە هەیە، کە بۆ ئەمرۆمان لە هەر کات زیاتر سوود مەندە. لەلایەکەوە، ئەو ڕەنج و کۆششی ئەوانیتر ناخاتە پەراوێزەوە و تووڕیان هەڵنادات لەبەر ئەوەی شتگەلێکیان وتوە و نووسیوە، کە هەڵەیە، یان بە دڵی ئەو نیە. مامۆستاکەمان لە وتنەوەی بیروڕای ئەوانیتردا بیلایەنانە و بابەتیانە و ڕاستگۆیانە زانیارییەکان دەگوێزێتەوە و خوێنەر حاڵیی دەکات کە ئەوانیتر بۆچوونیان لەسەر بابەتەکان چییە و پاشان هەڵەکانیان دەستنیشان دەکات و دوایئەوەش گفتوگۆی زانستیانەیان لەبارەوە دەکات.

لەلایەکیترەوە، بەرپەرچەدانەوەی مامۆستاکەمان بۆ ڕەخنەگر و توێژەرانی تر، ئاستێکی پرۆفێشناڵیانە بەخۆیەوە دەگرێت، بەجۆرێ کە بوار بە ڕەهەندی سایکۆلۆژیای تاکەکەسیانەی خۆی و پەرچەکردارە دەروونییەکان نادات سێبەر بەسەر لۆژیکی گوتە و فۆرم و دارشتنی ڕستەکانیدا بکەن. بەمجۆرەش بە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی بەسیر و بەتایبەتیش ئەو نووسینانەیدا کە ڕەخنەکاریی کەسانیتر دەکات،

لە ڕووی ســایکۆلۆژییەوە ناخرۆشیین و نووسەرەکەیان لە ڕێگەی بەکارهێنانی زمان و وشــەی نەشیاوەوە، هانمان نادات لەوسەرەوە وەکــو دڕندەیــەک بێینــە دەرەوە. ئــەم تایبەتمەندیە لــە کاری ئەم پیــاوە مەزنــەدا، ڕووکاری پەروەردەیی و ئاکاریانــەی بیرکردنەوە و نووســینی ئەومان بۆ ئاشکرا دەکات. ڕووکارێک، کە لە نووسینی ڕەخنەیی ئەم سەردەمە و زاڵبوونی زمان و دارشتنی فەیسبووکیانە بەسەر دەقی ڕەخنەییدا، تەواو نادیارە. ئەمە جگە لەوەی ساتەوەختی پرۆفیســۆر بەســیر لە نووســینی ئەکادیمیانــەی کوردیدا شــایەتە بەســــەر پەیوەندییەکی قووڵی نێوان ڕەخنە و ئاکار، زانست و ئاکار و رەخنەی زانستیی و جیاکردنەوەی لە پەرچەکرداریی سایکۆلۆژی خودیــی ڕەخنەگــر و ڕەخنەلێگیــراو. بە بڕوای مــن هەموو ئەمەش لــەو ڕێزە زۆرەی بەســیری مامۆســتاوە بۆ خوێنەر، بــە تایبەتیش خوێنەری کوردەوە هاتووە.

دوایین پرسیار بە مێشکمدا دێت، ئەمەیە: ئایا مامۆستا کامیل بەسیر لە دوا ئەنجامدا، بە دوای چیدا وێڵ بوو؟ بێگومان ئەو ڕەخنەناسێکی ئەکادیمیک بوو. پەیڕەویی لە شێواز و ڕەوتی ئەکادیمیانەی نووسین دەکرد، بنەماخوازیی ڕەخنەیی لە کاری ئەودا ئامادەیی تەواوی هەیە، بەتایبەتی کە لەســــەرەتای باسەکانییەوە، بە پێناسە و شیکردنەوەی زاراوەکان دەستپێدەکات. ئەو تەسلیمی ساتەوەختە شپرزەکەرەکانی پرۆسەی رەخنەگرتن نەدەبوو، ئەوەی بیری لێدەکردەوە، دەیسەلماند، ئــەوەی ڕەتیدەکــردەوە، قەناعەتپێکــەر بــوو، بەتایبەتی لــەو نمونە بەرچاوەیدا، کاتێ شــەرحی زاراوەی ئاوەڵوەتا لەبەرامبەر خوازەدا دەکات، مرۆڤ دڵخۆش دەبێت. هەموو ئەمانە بە ئاشکرا لە دووتوێی نووســینەکانی ئەودا بەرجەستەبوون، بەڵام هێشتا بەردەوام شتێک شــاراوەیە، نەگوتراوە، نادیارە لە بەرهەمەکانی ئەو بیرکەرەوەیەدا.

ئەو شتە چییە؟

من لەو بڕوایەدام ئەوە هەمان حەسرەت و خەونی حاجیی قادریی کۆییە، کە لە لای بێکەس و قانعیش دووبارە بۆتەوە: حەسرەتی هووشیاریی بەرامبەر بە دواکەوتویی میللەتەکەیی و دەرککردنی بە پێویستیی بیرکردنەوەی زانستیانە و دوورکەوتنەوە لە بیرکردنەوەی هەڕەمەکیی لەبارەی شتەکان و بابەتەکانەوە. کامیل حەسن بەسیر بە هەمان تێگەیشتنەوە، لە بوارەکەیدا قاڵدەبێتەوە و بەئاراستەی ئاسۆیی و ستوونیدا، دیالۆگێک لە نێوان شارستانیەتە خاوەن نەریتە ڕەخنەییەکاندا دروستدەکات، بۆ ئەوەی دەستنیشانی پێگەی کورد و ئەدەبەکەی لەو نێوانەدا بکات. ئەو لەسەر کاغەز کوردبوونی خۆی و ئینتیمای بۆ مرۆڤایەتی لە ڕێگەی ڕەخنەسازییەوە، دروستدەکات و خۆی دەنووسێتەوە. ئەو دەیویست لە ڕێگەی ڕەخنەی ئەدەبیەوە نەتەوەکەی دروست بکات..

٢٠١٢/١٢/١٨

ناوێک بۆخۆی لە شیعر دەچێت و کۆڵەکەیەکی بارقورسیی شیعری نوێـی کوردیــە. کۆڵەکەیەک بەتەنیـا هەڵگری نەریتێکە لە شــیعری ئێمــەدا کــە ئەوەی کولتووری نێرســالاری قەدەغــەی کردبوو، ئەو لــە دەروازەی وشــەوە کردیــەوە بەناو ماڵەکانی هەســت و ڕۆحدا و لەگەڵێشــیدا کـۆی ئەو نەریت و هەســتە غەریزەیی و مرۆییانەی ئێمەی بەخشییەوە بە مرۆڤی کورد، کە سەرەتای بەرجەستەبوونیان دەگەڕێتەوە بۆ یەکەمین هەستبەخۆکرنەکانی مرۆڤی نیاندەرتاڵی..

ئــەوە مرۆڤی نیاندەرتاڵ بوو کە بۆ یەکەمجار بوێریی ئینســانیانەی خــۆی لەناو ئەشــکەوتەکاندا نواند و لەگــەڵ یەکەمین جووتبوون و هێنکەهێنکــی ئیرۆتیکیانەدا، ئێمــەی لێکەوتینەوە. ئێمە لە نەوەی ئەو بەریەککەوتنە جەستەیی و ئیرۆتیکییەین، کە لە ئەشکەوتەکاندا دەنگیی دەدایەوە و گەردوون و جیهانی پڕکرد لە خۆشەویســتی بۆ ژیان و مانەوە. ئێمە نەوەی ئەو جەستە ڕووتانەین، کە چیدیی نەیاندەتوانی

ترس بکەنە پێوەر و بە تیروکەوان و بەردی تیژ، بەرگریی لە ئاست درندەیی جیهانی دەرەکیی و وەحشییەتی سرووشتدا بکەنە پێوەر بۆ مانەوە. قوباد پەیکەرسازی جەستەیەکە، کە دەبوو هەبێت و ژیان لە مانا ئیرۆتیکیەکەیدا نۆشـــی گیان بکات. من هەر کاتێ شیعری قوباد دەخوێنمـــەوە، یەکەمیـن بەریەککەوتنـی مرۆییانەی دایـک و باوکە مێژووییەکانم بیر دەکەوێتەوە، کە پاشـــان بووە دوژمنی سەرەکیی کولتووری نێرسالاری و یەکەمین سانسۆرەکان و ستەمکارییەکانی سەر جەستەی مرۆییان وەدیهێنا..

شـــیعری قوباد، هەمیشـــە شـــیعری ئەو هەســـتە نەمرەی مرۆڤە بۆ پێکەوەبوون و جووتبوون و ئەڤین، کە پاشـــان ترســـی ئایینەکان و کولتوورەکانی لە ئاست خۆیدا بێدار کردەوە و ئیرۆتیکای لە ڕۆژی ڕووناکەوە، گواســـتەوە بۆ تاریکاییەکانی شەو و بەدزییکردنی کردە بەشـــێ لە ژیانی جەســـتەییمان و پێکەوەبوونـــی ژن و پیاوی کردە کردەیەکی سێکسیی ڕووت..

لێرەوە لە هەموو خۆشەویســـتییەکدا بۆ شـــیعری قوبـــاد، تەمەننای گەڕانەوە بۆ ئەو هەستە پاکەی مرۆڤ و لە هەموو ڕقێکدا لە شیعری ئەم شـــاعیرە، ترسێکی کولتووریی دەبینمەوە، هاوکات بە درۆیەکی گـــەورەی مرۆڤ لە ڕەتکردنەوەیدا بـــۆ ئیرۆتیزم و ڕووتبوونەوەی جەســـتە، کـــە لە ئێســـتادا ژمـــارەی ئەمانـــەی دواییان ڕێـــژەی ئەو شـــەڕانییەتە بەرجەســـتە دەکات، کە لە کۆمەڵگادا هەیە و بەهۆیەوە کۆنترۆڵی کولتوورە مرۆییەکەی دەکات. بەڵام ســـوور دەزانم، ئەمە درۆیەکـــی گەورەی کولتووریەرســـتانی باوکســـالارە لەگەڵ خۆیان و لەگـــەڵ کۆمەڵـــگا، چونکـــە دەزانم ئەو ستایشـــەی قوباد لە ڕۆژی ڕووناکیی ناو تێکستەکانیدا بۆ جەستەی مێینە بەتایبەتیی و مرۆڤ بە گشتیی دەیکات، لە شەوی تاریکیی نێرینەیی کولتورخوازاندا، دەبێتە

عیبادەت و چۆکدادان لەبەردەم لەشی ژن و ئەندامی مێینەییدا. قوباد، بانگ لە کولەکەدا ناڵێت، بەڵکو لە مینبەری ئەڤین و خۆشەویستیی بۆ ژنەوە، مەمک ستایش دەکات..

قوباد ڕقی لە بەرزیی و لوتکە و دووند و بڵندییە، بە مانا جوگرافیایی و تۆپۆگرافییەکەی. لە شیعری قوباد دا، بەرزیی چیا و لوتکەی شاخ و دوندی کێوانمان بیر ناکەوێتەوە، بەڵکو ئێمە بە خوێندنەوەی وشەی بەرزی و لوتکەکانی قوباد جوانیی و باڵاو شکۆی مێینەییمان بیر دەکەوێتەوە. هەر بۆیەشە ئەم نەوەیەی نیاندەرتاڵییەکان، هەموو بەرزایی و لوتکەیەک وەک گۆی مەمک وێنا دەکات.

لێرەوە، قوباد بە تێکشکێنەری شەرمێک دەزانم کە (گۆران)ی شاعیر لە شیعرەکانیدا بۆ جوانیی ژن، لە سێبەری جوانیی سرووشتدا، دەیشاردەوە. قوباد بە گوێزەرەوەی ئەم شەرمەی گۆران لە شیعری کوردیدا وێنادەکەم، کە لە جیاتی ڕوانین بۆ ژن لە ئەنجامی ڕوانینەوە بۆ سرووشت، دەکاتەوە بە ڕوانین بۆ ژن خۆی.

قوباد، گەمەی شاردنەوەی ژنی لە بەرگیی جوانیی سرووشتدا واز لێهێنا و نیگای ئێمەی بردەوە سەر ڕوانینە نیانەدەرتاڵییە نەمرەکە بۆ ژن. ئەو بە ڕووتیی و بە کۆی هەستە مرۆییە سەرەتاییەکانەوە، ترسیی ئێمەی لە ژن و جوانیی مرۆییانەی شکاند و بردینیەوە بەردەم تاقگەی ئەشکەوت و ژێر سێبەری درەختەکانی (ئاڤاتار).

لێرەشەوە، عەشق و ئیرۆتیک لە شیعری قوباددا، ویڕای هەموو ئازارەکانی و تێکشکان و ڕەچاوکردنی سانسۆرەکان، بۆوە بە بەشێک لە ڕۆح و نیگا و هەستەکانمان..

من، ئەو لە (تەمتومان)ەوە دەناسم، بەڵام تا گەڕانەوەم لە تاراوگە، نەمبینی و نەبووە هاوڕێم. بەڵام کەمجار هەبووە بە خوێندنەوەی شیعرەکانی، یان بە گوێگرتن لە خۆی، سارێژنەبمەوە لە هەستێکی

پاکیی مرۆیی کە زۆر زیاتر لە هەر شۆڕشـێک بۆ مانەوە، پێویستم پێی نەبووبێت و سـاختەیی هەموو مانا شۆڕشگێڕییەکانی شۆڕشم بۆ دەرنەکەوتبێ. هەر بۆیەشە کاتێ شیعرێکی شۆڕشگێرانەی قوبادم خوێندبێتـەوە، ڕقم لێی هەسـتاوە و وامزانیوە ئـەو بۆ ڕازییکردنی ڕۆ ژگار و کولتووری باو، نوسیویەتی..

قوباد نە بە چەک و تفاقی جەنگ و نە بە چوونی بۆ بەرەی پێشەوەی جەبهـە و تەسـلیمبوونی بـە حەماسـەی شۆڕشـگێرانە و ئەدەبی بەرگریی، لەلای من شـاعیر نەبووە، هەروەکچۆن شاعیرێتی هەندێ کەسیتریشم لە وشە ڕێزکردینیادا بۆ جوانیی ژن، نەبینیوە، هێندەی ئـەوەی شۆڕشـی ڕاسـتەقینەی قوبادم لـە ڕووتووقووتیـی ئەودا بینیوەتەوە، کاتێ لەگەڵ زماندا بۆ بەرجەستەکردنی جوانیی ژ ن ، کەوتۆتە جەنگەوە. قوباد لە شێوەی سەربازێکی بێ ڕم و خەنجەر، بـێ چـەک، بێ مەتاڵ و زرێ دەبینم، کە بە ڕووتیی سـەرەتاییانەی نیاندەرتاڵیانەوە لە هەموو جەنگێکیدا بۆ ژیان و مانەوە، ژنێکی لەگەڵە. ژنێک، کە سەرچاوەی ژیان و مرۆڤبوون و کوردبوونیەتی..

بەم دیدەگایەوە، قوباد لەسەر دەمێکدا بەرجەستە دەبێت، کە مرۆڤی کۆمەڵگای ئێمە و بەتایبەتی نێرینەی شۆڕشگێڕی ئێمە، خۆی پڕچەک و تفـاق دەکات بـۆ چوونە جەنگ و خۆبەکوشـتدان و پیرۆزکردنی شەهادەت. شیعری قوباد، ڕاکردنێکی بەردەوامە لەم شۆڕشگێڕێتیە بۆ ئەوەی شۆڕشـێکی تر بەرپا بکات، کە شۆڕشـە سیاسـیەکان و حەماسـەی کوردایەتی، لە ئێمەدا چەپاندیان و خستیانە پەراویزەوە. هەر لێرەشـەوە، گرنگیی شـیعری قوباد بۆ من لەوەدایە، کە ئەوەی شـۆڕش لە ژیانی هەستەوەریی ئێمەدا چەپاندیی و سەرکوتی کرد، هێنایەوە ناو زمان و شعوری ئێمە، تا پاش ئەو هەموو توندوتیژی و ستایشی کوشتنە، زەخیرەیەکمان هەبێت بۆ بوونەوە بە مرۆڤ، نەک

چەقبەستوویی لە قاڵبی نێرییەتی و پیاوبوون و قارەمانبووندا..
ئەدەبیی ئێمە هەرگیز دابڕ نەبووە لە ئیرۆتیزم و ئیشتیاق و سوێبوونەوە بۆ جەستە و لەش. فۆلکلۆر و شیعری کلاسیکی و فۆرمە ئەدەبییەکانیتر و بەتایبەتیش گۆرانیی کوردی، پڕ پڕن لە ستاییشکردنی ڕووتیی و جوانیناسی ڕووتیی جەستە. جیاوازیی شیعری قوباد لەگەڵ بەشێکی زۆری ئەو ئەدەبیات و فۆلکلۆرەدا لەوەدایە، کە لەو نەریتە و لە زۆرینەی فۆرمەکانیدا، (تەماشا) زاڵە بەسەر (بینین)دا. تەماشا میکانیزمێکی جەستەیە بۆ وێناکردن و بە بابەتکردنی جەستە وەک شتێکی مادیی، کە لە ئەنجامی ئەمەوە، نیگای بینەر دەچێتە سەر بەشە وورووژێنەرەکانی لەش، نەک ناوەوەی و جەستە وەک بەشێک لە ئیدراک و بەرجەستەکەری بوونی مرۆیی.
لە تەماشاکردندا، ئێمە جەستە وەک چەندپارچەیەکی میکانیکی دەبینین، کە هەندێکیان وورووژێنەر و هۆکاری دروستبوونی ئاڵۆشن لە لەشی تەماشاکەردا. بۆیە تەماشا ئەو جۆری بینینەیە کە حەزە غەریزەییەکانی ئێمە بۆ ماوەیەکی کاتیی دەبزوێنن و لەگەڵ تەماشاکردنی لەشێکی تردا، ئەوانەی پێشوومان بیر دەباتەوە. ڕەنگە (نالی) ڕیزپەرێک بێت لەم نێوانەدا. بەڵام شیعری قوباد، شیعری بینین و ئیدراکیی مرۆڤە بە جەستە وەک بەشێ لە مرۆڤبوونی مرۆڤ، نەک فۆرمی لەشەکان بە تەنیا. قوباد جەستە دەبینێ و لەش فەرامۆش دەکات، لەبەر ئەوە لەگەڵ شیعری قوباددا ئێمە لە جەستە بە پارچەپارچەیی نابینین، بەڵکو وەک یەکەیەکی پێکەوەبەستراو دەیبینین و دەرکیی دەکەین. لێرەشەوە، ئیرۆتیزم و خۆشەویستی بۆ ئەویتر، جێگەی حەزلێکردن و تەماعی داگیرکاریانە بۆ لەشی ئەویتر، دەگرێتەوە. بەم مانایەش، شیعری قوباد لە پەروەردەکردنی

هەستەکیانەی ئێمەدا کاریگەریی خۆی هەیە، نەک لە مەسرەفکردنیی سێکسیانەیدا بۆ دامرکاندنەوەی حەزە تێپەڕیوەکان..

ئەو ژنانەی شـیعری قوبادیان خۆشـدەوێ و کاریگەریی لەسەریان هەیـە، بیر لە خەوتن و چوونە جێگا لەگەڵ شـاعیرەکەیان ناکەنەوە تا لە وێنەی دۆنژواندا وێنای بکەن. خۆشەویستیی ژنانە بۆ شیعری قوباد، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەسـتە قووڵـەی ئیدراککردنی ژن وەک مرۆڤێک. ئەمەش بۆتە هۆکاری ئەوەی ئێمە بە هەڵە لە قوباد تێبگەین و وەک مرۆڤێکی تینوو، وێنا بکرێ، نەک وەک عاشقێک..

قوبـاد، بـەر لە هەموو شـتێک عاشـقە، بە پلەی یەکەمیش عاشـقی ژن، بەڵام نەک تەنیا بە شـەوی تاریـک و لە ژێر لێفەوە، بەڵکو ئەو بە ڕۆژی ڕووناک، بە هەمان شـێوەی باووباپیرە نیاندەرتاڵییەکانی ستاییشی ژن دەکات وەک بەشێک لە ستاییکردنی ژیان..

٢٠١٢



## قوربانییەکی سۆزەی بێوەفا:

# فەرهاد پیربالْ

پێشـئەوەی لە کوردسـتان بچمە دەرەوە، ناویم لە برادەرەکانمەوە بیسـتبوو. وابزانـم شـێرزاد حەسـەن یەکێک بوو لەوانـەی ڕۆڵی سەرەکیی هەبوو لە ناساندنی پیربالدا بە نەوەی من. ئەگەرچی من ماوەیەکی زۆر ناوی فەرهاد و شـاعیری غەزەلنووسـی هەولێری: پیرپاڵ مەحموود کە زۆربەی کات لە گۆڤاری کارواندا شیعرەکانی بڵاو دەکردەوە و زۆر جوانیش دەینووسین، تیکەڵ دەکرد. لە نێوان ئەم دوو پیربالەدا پەیوەندیی نەسـەبیم دروستکردبوو، بەڵام دوایی کە بیسـتم شـاعیرە پیربالەکەمان کۆچیی دوایی کـردووە و کاتێ لە هاتنەوەشـمدا بـە خزمەت پیربالی باوکی فەرهاد گەیشـتم، بۆم دەرکەوت سالەهایە من بەهەڵە لە نەسەبی فەرهاد تێگەیشتووم.

بەڕاسـت نەسـەب و تەباری فەرهاد پیرباڵ لە چییـەوە پەیدابووە، کە ئاوا بەناو ڕەوتی سـالەکاندا درێژبۆتەوە و بۆتە دیاردەیەک لە

کۆمەڵـگای ئێمەدا بە جۆرێ کە گرتە ڤیدیۆییەکانی بەناو گەنجان و نەوەی نوێدا بڵاوببنەوە و کەم دانیشتن هەبێ باسی ئەم فەرهادەی تیـا نەکریـت و کەم بەرنامە و کۆڕ هەبێت ئەو تیایدا دانیشـتوان و گوێگـران و بینـەران نەکات بە دوو لەتی تەواوە: لەتێکیان قسـەی پێدەڵێن و لەتێکیان ستایشی دەکەن!

ئەم دیاردەیە پێش هەموو شتێک ڕەگێکی عاشقانەی هەیە بۆ زمان. مەبەسـتم لە زمان تەنیا وشـە و ڕسـتەکان نین، فەرهاد دەگمەنە نووسەرێکی کوردە کە توانیویەتی پانتایی زمان لە چوارچێوە فراوان و ئاماژەیی و تەنانەت ناخودئاگایانەکەی خۆیدا بەکار بهێنێ و تەنیا لەناو دەسـتووری زمانی نووسـین و ڕسـتەکاندا قەتیس نەخوات. فەرهـاد لەمڕووەوە عاشـقی فۆرمـە جیاوازەکانـی خودەربڕین و عاشـقی قەدەری ئەفسـانەیی خۆیەتی: هیچ فەرهادێک نیە، لە تاقی بێسـتوونێکدا، شیرینێک بەرجەستە نەکات و خۆی نەکاتە قوربانیی و دواجـار بـۆ ئەوانیتر و مێژوو نەبێتە نموونـە. لەمڕووەوە فەرهاد لـە دیدی منـەوە، هێندەی هەمـوو کابینەکانـی حکومەتی هەرێمی کوردسـتان خزمەتی بەم کولتوورە و بەشـاری هەولێر کردووە و ئیتر شوناسـی ئەمشـارە، بەم قۆناغەیدا دەناسـرێتەوە کە فەرهاد پیربـاڵ تیایـدا ژیاوە. ئەم قسـەیە بۆیە دەکەم، چونکـە تازە نە من پێویستم بەوەیە مەدحی بکەم و نە ئەویش لەو تەمەنە بایۆلۆژییەدا ماوە، کە تووشی غرووری بکات..

یەکەمجـار لە تاران، لەسـەر شـەقامی ئینقلاب (شـۆڕش) بینیم و هەردووکمان برسـی و هەردووکمان کـەم پارە و هەردووکمان لە جیهانـی نۆسـتالیژیانەی خۆماندا: بە جەسـتە لە تـاران و بەدڵ لە کوردسـتان! بەڵام هەردووکیشمان عەوداڵ بەدوای کتێبی نایاب و شـیعری مەزندا. من ڕۆمانی (سوور و ڕەش) بالزاک لە جانتاکەمدا

و ئەویش (فەرووغی فەرووغزاد). هەردووکیشمان هەتا ئێستاش لە نێوان واقیبگەرایی بالزاکیانە و خەیالگەرایانەی فەرووغدا ماینەوە. ئەو کاتەش پیربال دەستپێشخەر بوو: کات دەمەونیوەڕۆ و دەمەی نانخواردن، ئەویش لە من شارەزاتر. پێشنیاری چوونە خواردنگەیەکی کرد و گوتی داوەتت دەکەم. من شەرمێکم تیابوو، ئەویش بۆ ئەوەی شەرمەکەم بشکێنێ، گوتی با پێشبرکێی خواردن بکەین. نیو کیلۆ قیمە و هەشت هێلکەیان بۆ تێکەڵکردین. فەرهاد بردییەوە..

ئەوە یەکەمجاری نەبوو میوانداریم بکات: لە پاریسیش هەر ئەو میوانداریی کردم و ماوەیەک لە ژوورەکەیدا مامەوە و بەفرخەرەکەیم بۆ پاک پاک کردەوە. ئەو کاتە فەرهاد لە عەشقەوە هاتبۆوە و بەدەستی خاڵی. شەوانە لە کافتریا دەمایەوە و بەڕۆژیش دەیخوێند. پاریس بۆ ئەو نیشتیمانێکی تر بوو. هەر لە پاریسیشەوە ئەو نیشتیمانی خۆی خۆشویست و یەکەمین هەست و هووشارییە نیشتیمانویستییەکانی خۆی لەوێوە هەڵڕشتنە زمانەوە: دیوانی (ئیکزیل)، یەکێ لە کۆمەڵە شیعرییە پووختەکانی..

من هەرگیز ئەو سەفەرەی پاریسم بیر ناچێتەوە، چونکە هەر کە گەیشتمە وێستگەی سەرەکیی شەمەندەفەر، لە کاتی تەلەفۆنکردندا، پارە و کارتەکانیان، کە لەسەر سندوقی تەلەفۆنەکە دامنابوون و لەگەڵ فەرهاد قسەم دەکرد بۆ ئەوەی ناونیشانیماڵەکەیم بداتێ، لێدزیم..

فەرهاد لە مرۆڤە سەخیی و دەستبلاوەکانی ئەو دەمی ناو ژیانی هەمووومان بوو. ئەو بە ڕۆحێکی دایکانەوە، کە سۆزی ئەوی بۆ کوردستان تێدا بوو، یەک کرۆنی پێبوایە بە تەلەفۆن هەواڵی دەپرسین و دەیویست لە سەلامەتی هەموومان دڵنیابێتەوە. من

چەندیـن جار لــە تەنیاییەکانی دانمارکمدا، بــە زرەی تەلەفۆنەکانی فەرهــاد، ماڵ و دڵم ئـاوەدان بۆتەوە و ئەوەندەم ئومێد ڕژاوەتەوە، دڵ کە توانیومە بەردەوام بم..

فەرهاد یەکێکە لە نمونە کەسـایەتیەکانی ناو ڕۆشـنبیریی ئێمە، کە بەبـڕوای من، هەمیشــە لە هەوڵی بەرجەسـتەکردنی سـۆژەیەکی پارچەپارچــە و خودێکـی هەڵاهــەڵادا بـووە. کـەس وەک ئــەو، شـێوەژیانی کـۆن و بەهــا تەقلیدیەکانی تووڕهەڵنەدا و کەسـیش وەکو ئەو مۆدێرنیزمی ئەدەبی و ئێسـتاتیکی لە ڕۆشـنبیری ئێمەدا بەرجەستە نەکرد. ئەمەش زۆر گێچەڵی بۆ ناوەتەوە و هەرئەمەشە وایکردووە کۆمەڵگا لەســەر کەسایەتی و ڕەفتارەکانی فەرهاد ببێت بــە دوو کەرتــەوە. کەرتی وەک مرۆڤێکی زیـادەڕۆ و کەرتێ وەک نمونەیەکـی یاخی تەماشــای دەکەن. من بۆخـۆم فەرهاد بەمجۆرە دەبینم: مرۆڤێک، سـۆژەیەکی مۆدێرن کە دەیەوێت خۆی بێت. ئەو بەرجەسـتەکەری ئەو جۆرەیە لە کەسایەتی کە دەیەوێ شێوەژیان و ئەدەبەکەی، کەســایەتی و نووســینەکانی، دەرکەوتە کۆمەڵایەتی و بەرهەمــە کولتووریەکانی یەکســان و نزیکبخاتەوە. ئەو دەیەوێ لــە کۆمەڵگایەکـدا ماسـک و ڕووپۆشــەکانی تووڕهەڵـدات کە پڕە لــە ماسـکپۆش و ڕووبەند لەســەری مەجازی.. ئــەو هێندەی ڕقی ئێمــە لەبەرامبەر خۆیدا دەجووڵێنێ ئەوەنـدەش زیاتر ڕقی ئێمە لە خۆمان و ترســەکانمان بێدار دەکاتەوە، کە حەز دەکەین وەک ئەو بیـن و ناتوانین و ناوێریـن. فەرهاد ئاوێنەی ناخودئاگا و نەسـتی سـۆژەی کوردیی مۆدێرنە، کە لە نێوان ترسـی لە یاساکانی باوک و بەخودبوونـدا، لــە نێـوان ترسـی لــە کۆنترۆڵـی کۆمەڵایەتی و مەیلـی بۆ بوونە خودی خۆیدا ئەمــەی دوایی هەڵبژاردووەو خۆی لە پێناودا بەکوشـت دەدات، لانیکەم خۆبەکوشـتدانی کولتووری و

کۆمەڵایەتی.

پیرباڵ، بەردەوام قوربانیی لە پێناوی بەرجەستەبوونی سوژەیەکی بیوەفا، پێنەزان، سپڵە و ترسنۆکدا دەدات، کە بوێری بوونە خودی لێسەنراوەتەوە. ئەم نووسەرەمان ئاوێنەی پیشاندانەوەی بێ ئەخلاقیی ڕۆشنبیر نیە لە کۆمەڵگای ئێمەدا، هێندەی ئەوەی ئاوێنەی نومایشکردنی خودێکی بێکەسایەتی و ئاوێتەبوو و ملکەچی ئەو لینکەیە کە دەیبەستێ بە فەرمانە کۆمەڵایەتیەکانەوە. فەرهاد چەندە بەرجەستەکەری بێشەرمیی کەسایەتیەکی نوێیە لە کۆمەڵگای ئێمەدا، ئەوەندەش زیاتر ئاشکراکەری شەرم و ترسێکی هەمیشەیی تاکەکەسەکانە لە قەیدوبەندە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و ئایینیەکانی ئەم کۆمەڵگایەی کە دەیەوێ دیموکراسی بێت و تاکەکەسی دیموکراتی ناوێت، دەیەوێ وەک کۆمەڵگایەکی ئازاد خۆی بنوێنێ و مرۆڤی ئازادبووی ناوێت. فەرهاد ئەم لینکەی تا ئەندازەیەک پچڕاندووە و بە بوێرییەکی بێوێنەوە، پەردە لەسەر مەیلە شاراوەکانی مرۆڤی کورد هەڵدەداتەوە، سەری چەپێنراوەکان و سەرکوتکراوەکان هەڵدەداتەوەو داوەتمان دەکات بۆ ئەوەی خودی خۆمان بین. بەڵام ئێمە دەمانەوێ لەسەر درۆکردن بەردەوام بین و بە پاساوی ئەخلاقیانەی هەمە پەسەند و کۆمەڵگا ڕازییکەر، پیربال دەردەهاوێژینە دەرەوە و یەع و یەقی دەکەینەوە تا پێیبڵێین: ئێمە وەک تۆ نین، نامانەوێ وەک ئەو بین، بەڵام حەز ئەکەین بتوانین وەک ئەو بین. بەمجۆرەش، ئەو لەناخی هەمووماندایە، ئەو لە هەمووومان ئەخلاقیتر و بوێرتر و خاوێنتر و ڕوونترە، چونکە هەوڵدەدات ڕێنومایمان بکات بۆ ئەوەی خودی خۆمان بین. ئەو شۆڕش بەرپا دەکات، کە زەمینە و قارەمانی ئەم شۆڕشە جگە

لـە خودی خۆمـان، کە هەراجکراوینـە ناو بازاڕەکانـی کۆمەڵگا و کولتووره توندڕەوەیەکەیەوە، هیچتر نیە.

لـە نێوان پیربالّی هەشـتاکان و پیربالّی پاریس و پیربالّی ئێسـتادا هیـچ ناکۆکێک نابینم: ئەو لە سـەفەرێکی بەردەوامـدا بەردەوام لە پەڕینـەوەدا بـووە لە داهێنانێکـەوە بۆ داهێنانێکی تـر، بەجۆرێ لە ئێسـتادا فەرهاد وەکخۆی، وەک فیگەرێکی دیار، وەک جەستەیەکی ناسراو، بۆتە کەسایەتیەکی مەجازی، کە هەمیشە مانایەک لە خۆی زیاتر، ئاماژەیەک لەو دیو خۆیەوە دەبەخشێت. ئەو لە کەسایەتیەکی پۆسـتمۆدێرن دەچێت، بەبێ کولتووری پۆستمۆدێرن، بەبێ ئەوەی لە ترافیکی ئەخلاقی باو، نەریتی باو، یاسـای باو، کەسـایەتی باو، بوەستێ..

باو کوشـندە و بکوژی پیربالّە، بۆیە لەو شـوێنەی باو بالادەسـتە، فەرهاد خەباتێکی گەورە دەکات بۆ ئازادیی و ئازادکردنی سـوژەی کوردی. ئەو لەودیو دروشمەکانی ئەم کۆمەڵگا و سیستەمە سیاسیە نەریتپەرستەکەیەوە، عەودالّی ئازادیی ڕاستەقینەیە بۆ تاکەکەس. ئەو هەڵوێست نانوێنێ، ئەوەندەی هەڵویست دروستدەکات و دەمانخاتە بـەردەم هەڵوێسـتی جیدی لەبەرامبـەر خود و مەیلـە تێرنەبوو و نەبڕاوەکانیـدا بۆ ژیان. ئەو هەمووومانی دووچاری فەنتازم کردووە بۆ ئەوەی بەردەوام بمانەوێ لەگەڵ ئەو بەشەی ژیاندا بچینە جێگاوە و پێکـەوە بخەوین، کە حـەزی پێدەکەین، بەڵام ناوێرین. بۆیە تەنیا دەسـتپەڕ و خەیاڵی پێوە لێدەدەین. فەرهاد لەوێوە بانگمان دەکات، کـە جگە لە جیماعکردن و تێکەڵبوون لەگەڵ ژیان و هەنووکە، هیچ شتێکی تر نەماوەتەوە. نە ترس، نە ملکەچی و نە باو. بەتەنیا خودی خۆمان. بە تەنیا چێژ و نوێبوونەوەی مەیل و ئارەزوو. فەرهاد بەم مانایە مەترسیدارە، چونکە بەردەوام ئەو بەشەی بوونی کەسایەتی

خۆمانمـــان بیر دەخاتـــەوە، کە چەپاندوومانە و ترســـەکانی ئیمە لە باوک و یاساکانمان بیر دەخەنەوە. من ستایشی دەکەم..
جارێک لە ڕێگادا بەرەو ماڵی خۆیان، کە هەموومان لە سەیارەکەیدا بووین: مـــن و تـــەرزە و تنـــۆک و ڕۆدان، داوام لێکـــرد بوەســـتێ و لـــە دووکانێـــک عەترێکـــم کڕی بۆخـــۆم، بەڵام ئەو کە هێشـــتا لە ســـەیارەکەیدا بـــوو، زۆر بـــە گەرمییەوە گوتی: پێویســـتی نەدەکرد ڕێبەگیـــان، بـــەڵام چونکە هی تۆیـــە، لیت وەردەگرم. من بەخشـــیم، بەڵام کاتێ گەیشتینەوە ماڵ، عەترەکەی بە شەرمەوە و هاوکات بە بزەیـــەک کە لەودیویەوە پڕمەی پێکەنینێـــک هەبوو، بۆ هێنامەوە و تەرزە پێیگوتبوو، من بۆخۆمم کڕیوە و ئەوە بۆ تۆ نیە. لەو ســـاوە هـــەر کات مـــن بۆنی (ســـیگار) دەکڕم، ئەو دیمـــەن و پێکەنینەم بیر دێتەوە..
فەرهاد دواجار بیرخەرەوەی پێکەنینە لە کولتوورێکدا کە ستایشـــی مۆرە و خێسە و جوێن دەکات. پێکەنین لە توورەیی باشترە، چونکە توندوتیژیـــی لێناکەوێتەوە. بەمجۆرەش، فەرهادم وەکو پیرەمێردی شـــاعیر بیر دەکەوێتەوە، کە لە تاریکاییدا مۆمی حیکمەت و پەندی پێشینانی زیندوو کردەوە. ئەو بەشێکی شاکیر فەتاح و ڕووخسارێکی نەجمەدین مەلا و لایەکی حوزنی موکریانی و تێدایە، هەروەکو چۆن لە کوڕێژگەیەکی ناو ڕشـــتەی مرواری ســـەجادیش ئەچێ، کاتێ کە هەمووام ماتەم گرتوونی، ئەم دەداتە قاقای پێکەنین. فەرهاد یەکێکە لە جیدیترین نووسەرەکانی ئیمە، کە پێویستە پەیکەرێکی بۆ بکەین، چونکـــە توانیی بەردەوامیی بە ڕۆحیی ئەدەبیی و ئیســـتاتیکی ئێمە بدات و چێژی ئەدەبی ســـەدەی بیستەم ببەستێ بەم سەدەیەشەوە، کە تیایدا ئەدەب بۆتە قوربانیی تەکنەلۆژیا و پارە و قازانج..

٢٠١٢



فەیلەسووفێک بەوێنەی مانگ..

دکتۆر محەمەد کەمال

مـن ناتوانم وەک هاوڕێ کۆنەکانی باسـی بکەم، چونکە ئەوکاتەی ئەو خۆی بە فەلسەفەوە سەرقاڵکردووە، ئێمەومانان منالی لاکۆلان بووین، هەرچەنـدە لە بواری فەلسـەفەدا بەبەردەوامیی ڕێژەیەکی نەگـۆڕ لە منالیی پێویسـتە. منالی و فەلسـەفە جیابوونەوەیان نیە، ئەویش منداڵێکی مەزنە.

لە قۆناغی تاراوگەدا ناسـیم، لە گۆڤاری (مامۆسـتای کورد)، کاتێ وتارەکانـی لـەوێ بڵاو دەکردنەوە. سـاڵی ١٩٥٥ لـە بنەماڵەیەکی ناودار و نیشتمیانپەروەر لەدایک دەبێت، بەبێ ئەوەی کەس بزانێت ڕۆژگار دەیخاتـە بـەردەم چ زنجیـرە تاقیکردنەوەیـەک. بەڵام ئەو لە تاقیکردنەوەکان ناترسـێت، چونکە مرۆڤێکە نازانێت شـڵەژان و پەلەپەل چییە. لە منداڵییەوە دوو خەسـڵەت لە کەسایەتیدا هەبووە، مرۆڤێکی شەرمن و لەسەر خۆ و شەیدای فەلسەفە.

پـاش تەواوکردنی خوێنـدن لە ئامادەیـی بازرگانیی سـلێمانی، لە

گوندێکی نزیک هەڵەبجە (ئاوەکەڵە)، دەبێتە مامۆستا. کاتێ کوردستان جێدەهێڵێت، هیچ نیشتیمانێک نایگرێتەوە خۆی، بێجگە لە ژن و فەلسەفە! لە پاکستان بە هەردوکیان دەگات، لە ژیانی هاوسەریی دوو منداڵ و لە فەلسەفەش چەندین کتێبی نایاب دەخاتەوە. ئێستا لە تاراوگەیە. هەرچەندە لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە، سەرەتای تاراوگەبوونی ئەو دەگەڕێتەوە بۆ یەکەمین پرسیار: (ڕاستەقینە چییە؟) و بۆ یەکەمین کتێب کە لە هەرزەکاریدا دەیخوێنێتەوە: (دەروازەیەک بۆ فەلسەفە). ئەو لەو پرسیارە و لەو کتێبەوە دەبێت بە داوی بیرکردنەوەوە. نمونەی ئایدیالی سەردەکەمە، چەپیانە دەبێت، بەڵام ئەو بوونخوازانە بیر دەکاتەوە، تەنانەت دوای سەفەرێکی دوورودرێژیش بەناو فەلسەفەدا، بوونخوازیی هەر تێدا دەمێنێت. هەرچەندە کاتێ بیر لە یاخیبوون و خێرایی و مکووڕبوونی دوو لە بوونخوازە بەناوبانگەکانی وەک کیاکەگۆردی باوکی بوونخوازان و سارتەری دەروەستخواز دەکەمەوە، لە هێمنیی دکتۆر حەمەکەمال تێناگەم و هەستدەکەم ئەم هێمنیە جەوهەریی بنەڕەتیی بیرکردنەوەی بێت، نەک ئاراستە و قوتابخانە فەلسەفییەکان..

هیچ فەیلەسووفێکم نەبینیوە هێندەی محەمەد کەمال هێمنیی و فەلسەفە ئاشت بکاتەوە. ئەو لە سرووشتی فەلسەفیی خۆیدا، بەوێنەی ئیحسان نووری پاشایە لە کایەی سیاسیدا. هیچ کەس هێندەی یەکەمیان نازانێت هێمنی بۆ بیرکردنەوە و هیچکەسیش هێندەی دووەمین نەیزانیوە عەشق لە سیاسەتدا مانای چی. ئیحسان نوری پاشا بە درێژایی یەک تەمەن تاقانە سیاسیەکی عاشق بوو، کە ئەم عەشقەی لە ژیان، خەبات و ئاوارەیی و مەرگیشیدا ڕەنگیدایەوە. هیچ یەکێ لەم وێستگا و قۆناغانەی ژیانی ئەم مرۆیە نیە، کە تیایدا

جێدەستی عەشق نەبینرێتەوە، تەنانەت مردنەکەشی: (بەیانیەک کاتێ دەچێت بۆ کولێرە کڕین، ماتۆڕێکی ساواک لێیدەدات).

لە کاتێکدا محەمەد کەمال کەسایەتییەکی ئەوەندە لەسەرخۆی هەیە، کە هیچ شوێنێکی فەلسەفە و بەرهەمەکانی نیە، هێمنی باڵی بەسەردا نەکێشا بێت. خوێندنەوەی ئەم مرۆڤە، پرۆسە و ئەزموونێکی نەک هەر زانیاریی و دانایی بەخشە، بەڵکو ئاسوودەبەخشیش. بۆیە بڕیارمدا بەرگیی یەکەمی کتێبی کەسایەتیەکانی ژیانم، بەبێ محەمەد کەمال تێپەڕ نەبێت.
هێمنیی، بۆ مامۆستاکەمان، چ هۆکاری بیرکردنەوە و چ پرۆسەی بیرکردنەوە و چ بەرهەمی بیرکردنەوەیە. هێمنیی، وەکئەوەی دەیناسین دۆخێکی سایکۆلۆژیی، جەستەیی و هەستەکیانەی ڕۆح لەبەرە. مرۆڤ و ئاژەڵەکانیش هێمنی لە ژیانیی خۆیاندا بەرجەستە دەکەن، چونکە هێمنی جگە لە ڕەهەندە ناخەکیی و دەروونییەکەی، ڕەنگدانەوەی جەستەییشی هەیە، ئەمە وێڕای ئەوەی هێمنی زمانێکیشە کە بە ڕستەکانی خۆی دێتە گۆ، هێمنیی، دەربڕینە لە ئاست و شوێنێکی قووڵ لە بوونیی ئێمەدا. بەم مانایاش هێمنی، سەرچاوەیەکی لە فەلسەفەی ڕەواقیی و ئەپیکوریدا هەیە، چونکە پەیوەستە بە ئاسوودەیی مرۆییەوە.
هێمنی دۆخێکی ژیانەکییە، کاتێ بوونەوەر هەست بەو دۆخە دەکات و لە بەهاکەی بۆ ئامانجی ژیان تێدەگات، کە ئاسوودەییە.
هێمنی بەشێکە لە دەروەستیی مرۆییانەی ئێمە لە ئاست ژیان و بوونماندا لەگەڵ ئەوانیتر، چونکە بەبێ هێمنی ئێمە یان لە دۆخی بێ پەیوەندیداین، یان لە دۆخی گرژیی و شەڕدا. لەبەر ئەوە هێمنی پێویستییەکی بیرکردنەوە بە گشتیی و بیرکردنەوەی فەلسەفییە

بەتایبەتی.

محەمەد کەمال، یەکێکە لەو مرۆڤە بیرکەرەوانەی، کە ڕووتیکەینەوە لە هەموو سیفات و پێکهاتەکانی کەسایەتیی و هەر شتێک کە لەژیانیدا بەدەستی هێناوە، دواجار هێمنی لێدەمێنێتەوە، ئەو بیرکەرەوەیە لە دۆخیی سرووشتیی بیرکردنەوەدا: هێمنییەکی دەریایی، هێمنی ئێوارەیەکی گەردوونی، هێمنی وەک ڕستەیەک بۆ دروستکردنەوەی گەردوون لە سەرەتاوە.

بەم مانایە، ئەم پیاوە لە دنیای کوردیدا فەیلەسووفێکی دەگمەن و ناوازەیە، ئەو بیرکەرەوەیەکی ڕاستەقینەیە کە خۆی لە فەیلەسووفە پسپۆڕەکان، یان فەیلەسووفانی ئەکادیمی جیا دەکاتەوە، ئەو فەیلەسووفێکی ئەکادیمیی ڕاستەقینەیە.

فەیلەسووفێکی ئەکادیمی کەسێکە پسپۆڕییەکی ئەکادیمی هەیە لە بواری فەلسەفەدا و ڕەنگە بەشێوەیەکی پرۆفێشناڵ لە بواری فەلسەدا کار بکات و مووچە وەربگرێت و سەرپەرشتیی توێژینەوە و تاقیکردنەوەی قوتابیەکانی بکات. هەرچەندە زۆرینەی فەیلەسووفە ئەکادیمیەکان هەڵگری ناونیشانی فەیلەسووفن، بەڵام ئەوان بۆ خۆ جیاکردنەوەیان لە مانای فەلسەفە لە ناوەڕۆکە ڕۆژانەیی و باوەکەی، هەر خۆیان بە فەیلەسووفی ئەکادیمی ناونووس دەکەن. بەتایبەتیش کاتێک خۆیان لەبەردەم کەسانێکدا دەبیننەوە، کە لەبواری فەلسەفەدا کار دەکەن، بەبێ ئەوەی پسپۆڕیی فەلسەفەیان هەبێت.

حەمە کەمال بەم مانایە فەیلەسووف نیە. بەم مانایەش پسپۆڕیی فەلسەفە نیە. ئەو فەیلەسووفێکی ڕاستەقینە و ئەکادیمییەکی فەیلەسووفە، بەبێ ئەوەی فەیلەسووفبوونەکەی بکاتە قوربانیی ئەکادیمیبوونەکەی و بەبێ ئەوەی ئەکادیمیبوونەکەی وەک

گورزێک لەوانە بوەشێنێ کە لە پلەی ئەکادیمیی ئەودا نین، یان هەر ئەکادیمیی نین. هەر بۆیەشە من ئەو بە فەیلەسووفێکی ڕاستەقینە، یان فەیلەسووفێکی ڕاستەقینەی ئەکادیمی ناو دەبەم. ئەگەرچی ئەو هەرگیز ئەم ناونانەی پێخۆش نیە، چونکە خۆی بە فەیلەسووف نازانێت..

ئەم پیاوە وەک فەیلەسووف کێیە؟ کەسێ کە بە شێوەیەکی ڕاستەقینە فەیلەسووفە کێیە؟

فەیلەسووفێکی وەها کەسێکە بیری ئێمە بەرەو تێگەیشتن لە بیرکەرەوە مەزنەکان ئاراستە و ڕابەرایەتیی دەکات. بیرمەند و فەیلەسووفە گەورەکانی وەک ئەفلاتوون، ئەریستۆتالیس، دیکارت، هیوم، کانت، نیتشە، هایدەگەر و سارتەر و زۆری تریش، کە ئارگیۆمەنت و تیۆرییەکانیان بۆخۆیان و لە خۆیاندا پێگەی تایبەتیان هەیە و بیروباوەڕەکانیشیان بۆتە بەشێک لە کەسایەتی و ناخی فەیلەسووفەکەمان.

مامۆستا حەمە کەمال بەو مانایە فەیلەسووفێکی ڕاستەقینەیە، چونکە فەلسەفە مەسرەف ناکات لە پێناوی شتێکی تردا، بەڵکو فەلسەفیانە بیر دەکاتەوە و فەلسەفیانەش دەژی. ئەو فەیلەسووفێکی ڕاستەقینەیە، چونکە ترس و ڕێز و خۆشەویستیی هەیە لە ئاست ئەو دەق و تیۆریی و کتێبانەی لە گەشتەکەیدا پێیان ئاشنا بووە و سنوور بۆ حەز و مەیل و ئارەزووەکانی دادەنێن و لە بیرکردنەوەشدا ئازادی دەکەن. لە هەڵوێستەکانیدا سامێک لە فەلسەفە دەبینیتەوە، لە زمانیدا ترس لە ڕێکخستنی ڕستەکان و لە کتێبەکانیدا، سەدان کتێبی تر. ئێمە چاوەڕوانیمان لە فەیلەسووفی ڕاستەقینە ئەوەیە، کە دانا بێت، بیرکەرەوە بێت، بیرتێژ بێت، لە یەک کاتدا زانیارییەکی زۆری هەبێت و لە هەمان کاتیشدا خاوەن سرووت و پەیامی خۆی

بەبێ ئەوەی بیرکردنەوە وەک گرییەک، یان ئاڵۆزییەک بخاتە ڕوو.
من کە بەرهەمەکانی ئەم مامۆستایە دەخوێنمەوە، بەخۆم دەڵێم: ئای چەندە ئاسانە تێگەیشتن!

جگە لەمانەش، زۆرینەمان ئەو چاوەڕوانییەمان لە فەیلەسووفی ڕاستەقینە هەیە، کە خاوەنی کەسایەتییەکی تایبەت بێت، وەک خاوەنی توانایی بۆ تێگەیشتن لە کەسانیتر و خۆدانان لە شوێنی ئەوان و بیرکردنەوە لەگەڵیاندا. هەروەها فەیلەسووفی ڕاستەقینە کەسێکی پاکژ و زاهید و دەستگیرۆییکەرە و حەز دەکات یارمەتیی ئەوانیتر بدات بۆ گەیشتن بە ئاماجەکانیان لە تێگەیشتن و داناییدا، ئەگەر ڕێگاکانی عەودالبوون بەدوای داناییدا تەی بکەن. وێڕای ئەمانە فەیلەسووفی ڕاستەقینە کەسێکە لە ڕووی ئەخلاقییەوە، خاوەن ڕەفتاری بەرز، وریا و هەمیشە عاشقی دانایی. لە ڕاستیدا ئەم کەسە لە خۆیدا ئارام و ئاسوودە، هاوبەش نیە لە دروستکردنی کێشەکانی جیهاندا و بیردەکاتەوە لەو ژیانەی دەژی و دەژیی بەوجۆرەی بیر دەکاتەوە، بەڵام (مەحوی) گوتەنی: ئەو خەمی خۆی و غەمی هەموو عالەم دەخوات..

ئەم چاوەڕوانییە بەرزانە لە فەیلەسووف، زۆر پێشتر لە کتێبی (کۆمار، بەشی شەشەم)دا، خراونەتە ڕوو: زیرەک، ئازا، فێرکار، دڵفراوان، هاوڕێی باش، خۆشەویست، ئارام و بە سەبر، دادوەر و خاوەنی چەشە و یادوەرییەکی باش. هەرچەندە ئەم قسانە زیاتر لە دوو هەزار ساڵە نووسراون، بەڵام وەک سەرمەشقێکیان لێهاتووە بۆ ناسینەوەی فەیلەسووف و هیچ بەهای خۆیان نەدۆڕاندووە، ئەگەرچی زەحمەتە هەمووکەس بتوانێ وەدییان بهێنێ..

لێرەدا دەمەوێ ئەوەش ڕوونبکەمەوە، کە هیچ دژوازییەکی پێویست لە نێوان فەیلەسوفی ئەکادیمیی و فەیلەسووفی ڕاستەقینەدا نیە.

ئـەم جیاکردنەوەیە پێمان نالێت، کە فەیلەسـووفی ئەکادێمی خراپە، یان سـاختەیە و فەیلەسـووفێکی بەدکار و درۆزنە. فەیلەسـووفی ئەکادیمی بەشێکی گرنگە لە پانتایی و دیمەنی ئەکادیمی و دەتوانێ ئـەو بابەتانە چارەسـەر بکات، کـە گرنگییەکی تایبەتیـان هەیە بۆ خێزان و کۆمەڵگا و تاکە مرۆڤ.

فەیلەسـووفە ئەکادیمیەکان لـە بواری تیۆریـی و بەڵگەهێنانەوە و شـرۆڤەکردن، پێناسەکردن، ڕێکخستن و ڕاڤەکردنی بابەتیی گراندا پڕۆڤـە دەکـەن و ئەمـەش بڕێک حەز و توانا و کارێکی زۆریشـی دەوێت تا بتوانن لە کایەی فەلسـەفەی ئەکادیمیدا جێگیریی بکەن و بەهۆیەوە پلەی زانسـیی خۆیان و بەشەکەیان و بوارەکەیان ببەنە پێش..

وەلێ فەیلەسووفی ڕاستەقینە، هەرچەندە پێویستە ڕەهەند و ڕێنمایی و ڕیسـا پسـپۆڕییەکان بزانێـت و بە کارامەییەوە سـودیان لێوەر بگرێت، بەڵام وێرای ئەوانەش پێویسـتە چەندین خەسڵەتیی خودیی خۆڕسـک و ڕۆشـنبیریی تێدا بێت، کە هەرگیز لە ڕێگەی خوێندنی ئەکادیمیی و پسپۆڕییەوە بەدەست نایەن.

هەرچەندە ئەو فەیلەسووفە ئەکادیمییانەی من بینیومن و ناسیومن، فەلسەفەیان خۆشدەوێ و لە چەند بوارێکیشدا تیایدا شارەزان، بەڵام دەکرا ببنە هەر شـتێکی تر لە جیاتیی بوونە فەیلەسـووف. هەندێک لەوانە دەیانتوانی ببنە پسپۆڕیی فیزیا، یان دادوەر، مۆزیکار، وتاربێژ، یان کەشـتی دروستکەر، یاخود پزیشـک. حەمە کەمال، یەکێک لەو دەگمەنانەیە، کە ناتوانم بزانم جگە لە فەیلەسووف، دەکرا ببوایەتە چ شتێکتر. بەڕاستیی ئەو فەیلەسووفێکی ڕاستەقینەیە، چ ئەو کاتەی لە ناوەوە تەعبیر لە بیروڕای فەیلەسووفەکانیتر دەکات و چ ئەوکاتەش ناخی خۆی لە بەرهەمەکانیدا بەشـێوازێکی فەلسەفیانە دەردەبڕێ.

ئەو لە مانگ دەچێت، هەم دەتوانی تەماشـــای بکەیت و هەم لە بەر ڕووناکاییەکەیدا شتەکانیتر ببینیت.

کاتێـک ڕۆژنامەیەکی ئێرانـی داوایان کردبوو، وتارێکیان لەسـەر بێکەس بۆ بنووسـم، هێشـتا ئێمە لەپرسەی ئەم شـاعیرەدابووین. بەڵام من ئەم داوایەم بە بەڵگەی سـەرلەنوێ ژیانەوەی شاعیرێکی مەزن لێکدایەوە، کە ئیتر بەتەنیا هی کوردەکان نیە..

ئەوەی ئێرانییەکان و دۆسـتانی فارس زمان دەتوانن لە شـێرکۆوە فێری ببن شیعرنووسـین نیە، بەڵکو مرۆڤدۆسـتی و هاوسێویستی و خۆشەویسـتیە بۆ زمان و مرۆڤایەتی و نیشـتیمان. شـێرکۆ لەم ڕووەوە دیاردەیەکـی ناوازەیە لە شـیعری جیهان و دەنگێکی بەرزە بەرەو ڕووی ناعەدالەتی و سەرمایەداری و فۆرمە ئایدیۆلۆژییەکانی چەوساندنەوەی مرۆڤ، کە پێدەچێت هەمان ئەو دەنگە خەفەکراوەی میراتی کۆلۆنیالیزم بێت بەمجۆرە ئیسـتاتیکی و مرۆڤدۆستانەیە لە ژێر خۆڵەمێشی مێژووەوە گەشاوەتەوە.

هەرچەندە هەمیشـە مایەیەکی نەتەوەخوازانە لە شـیعری شێرکۆدا

ئامادەیی هەیە، بەڵام شێرکۆ هەرگیز نەبووە بەداوی ناسیۆنالیزمێکی کوێرانــەوە، هێندەی ئەوەی ئەو مرۆڤدۆســتانە و ئەویترویســتانە بــاس لە ئازارەکانــی مــرۆڤ دەکات و لەم پێناوەشــدا مرۆڤاندنی سرووشت، گیانداران، ڕووەک و خشۆکەکان وەک بەشێک لە پڕۆژە مرۆڤدۆستیەکەی ئامادەییەکی بەرچاویان هەیە.

شیعری شێرکۆ لە ماڵێک، یان وڵاتێک دەچێت لەو کاتەدا کە لۆکاڵی و کوردیانــە و دیارگەرایانەیە، لە هەمان کاتیشــدا ماڵێکە بەبێ هیچ دەرگایەک، سنوورێک، یان دیوارێک گشت مرۆڤایەتی لێوەی دەچێتە ژوورەوە و خۆراکی ڕۆحی بۆ ئەزموون و ئازارەکانی خۆی بەدەست دەهێنێت. هەمیشە بۆ شێرکۆ قوورس و زەحمەت بوو لە ڕۆژگارێکدا بنووســێت کە پڕە لە ڕەگەزپەرســتی و لوتبەرزیی ناسیۆنالیستانە و کەچی ناسیۆنالیســتێکی لوتبەرز نەبێت کە شــانازی بە مێژووی شکۆدار و زنجیرەی پاشایەتیی و میرنشینە کوردییەکانەوە بکات بۆ سەلماندنی هەنووکەی خۆی، (کارێک کە ناسیۆنالیستە پەڕگیرەکان دەیکەن)، بەڵکو ئەو هەمیشە لە شیعرەکانیدا ساتەوەختی هەنووکەی تێکۆشــان و ڕەنجی مرۆڤایەتی و نەتەوەکەی دەکردە عەشقێک بۆ مانــەوە و ســەلماندنی بوونی مرۆیی، وەک بوونێک لە تێکۆشــاندا نەک بوونێکی زەلیلانە.

کاتێک دەڕوانیتە پانۆرامای شــیعری شــێرکۆ بەباشی هەستدەکەی پێویست ناکات کورد بیت بۆ ئەوەی ئەم شاعیرەت خۆشبوێ، چونکە ئــەو لە هــەزاران شــوناس و ڕوانگە لە بەرهەمەکانیــدا، تەنیا یەک ڕوانگەی کوردیانە و تایبەتە و ئیتر وەک ماسیە ڕەشە بچکۆلەیەکی ئــازاد هەموو بیرکردنەوە و خەیاڵی خــۆی بەناو دەهلیزی خەیاڵدا

لەبەردەم مرۆڤایەتیی پەخشدەکاتەوە. لەم ڕوانگەیەوە شێرکۆ داهاتوویەکی زۆر گەشاوەتری هەیە وەک لەو ماوە کورتەی ژیا و ئامادەیی فیزیکیانەی ئەو لە کوردستان و شاری سلێمانی، سنووری بۆ جیهانبوونەکەی دادەنا.

شێرکۆ، بەبێ ئەوەی فەیلەسووف بێت ئاراستەیەکی دیکەی بۆ ئەویترویستی و هاوسێیەتی و هاوڕێیەتی و ئەویترناسی دیاریکرد. ئەو هەرگیز میراتێکی ڕقهەڵگرتن لە نەتەوە سەردەستەکانی بۆ جێنەهێشتین، بەڵام بەردەوام فێریکردین پێویستە محاکەمەی تاوانباران بکەین، نەک تەنیا لەسەر مرۆڤکوشتن و ئینکاریکردنی بوونی مرۆییانەی کوردەکان، بەڵکو لەسەر ژینگەپیسکردن، قەلاچۆکردنی زیرۆح و ژینگەی مرۆڤایەتی. ئەو لە پێش و هاوکات بە فەیلەسووفانی وەک لیڤیناس و دێریدا و پاوڵ ڕیکیۆر، هەستەوەرێکی قارڕەیی (کۆنتینانتاڵ) بوو، کە بە شیعر مەسەلەگەلێکی هێناوەتە پێش، کە بونیادی فەلسەفی ئەم فەیلەسووفانە پێکدەهێنێ و سنوورەکانی نێوان عیرفانی شەرقی و ئەقڵانیەتی خۆرئاوایی لێکتر نزیکدەخاتەوە. ئەو لە یەک کاتدا توانی لە شیعر، چ لە فۆرمە تەقلیدی و چ لە فۆرمە مۆدێرن و کراوەکانیدا، هەمان کات ئامراز و ئامانجێک بدۆزێتەوە کە مرۆڤایەتی لە سەرەتای هووشیاری و هەستکردنیەوە بە بوونی خۆی، عەودالی بووە.

شیعری شێرکۆ پێش هەموو شتێک شیعری مانایە و ناوەڕۆکەکەی مرۆڤانە و شۆرشگێرانە و ئازادیخوازانەیە. کۆکردنەوەی ئامراز و ئامانج، دروستکردنی هارمۆنی و هاوسەنگی لە ئاستی مانا و ئێستاتیکادا، ئاشتکردنەوەی فۆرم و ناوەڕۆک، تەواوکردنی ڕووخساری دەرەکیی زمان بە شەپۆلە مۆزیکیەکانی ناوەوەی، لە

هونەرە هەرە بەرزەکانی شێرکۆ بێکەسن.

ئەو لە ڕووی عاتیفی و خەیاڵ و ئاراستەی فیکرییەوە، لە شیعری کوردیدا تیکەڵێکە لە (نالی) و (مەحوی)، لە ئەزموونی تاراوگەیی و پەرتبوونی زمانیدا، پتر نالیانە و لە ئەزموونی ڕۆحیی و مەعنەویدا، لە مۆسیقای زمان و لە هەڵەکەسەمای وشەکانیدا ڕەگێکی قووڵی (مەحوی)انەی تێدایە. ئەم شێوازە شیعریە، درێژە پێدەری هەمان مۆسیقاسازییە لە زماندا کە لەلای (مەولانای ڕومی) و (حافزی شیرازی) و تەنانەت (بێدڵ)ی دەهلەوی دەبینرێتەوە و وشە لە چوارچێوەی بەیت و ڕستەدا کاژ دائەماڵێ و نوێبوونەوەی خەیاڵ بەرهەمەکەیەتی و ئومێد لە ئاسۆیدا دەدرەوشێتەوە.

ئەم شێوازە شیعریە و درێژبوونەوەکەی لە شیعری مۆدێرنی شێرکۆبێکەسدا، نیشانەی نزیکایەتی ئەزموونی ئێستاتیکی و مەعنەوی و ڕۆحیی و کۆژانی مێژوویی و لەمێژینەی ئەم میللەتانەیە پێکەوە، کە دەکرێت لەسەر بنەماکانیەوە خۆشەویستیی مرۆیی و لێبووردەیی و پێکەوەژیان دابمەزرێت بە شێوازێکی جیاوازتر لەوەی لە خۆرهەلاتی ناوینی ئێستادا بەدی دەکرێ. لە ڕووی ئێستاتیکیشەوە، شێرکۆ قوتابییەکی (گۆران)ە بەڵام ئێستاتیکای گۆران لە ئاراستەیەکی سرووشتیەوە، لە ڕەهەندێکی پاسیڤەوە دەگۆڕێ بۆ ئێستاتیکایەکی بەرگریکەرانە. ئەو وەک گۆران هەستئامێزی لەگەڵ دنیای دەوروبەریدا ناکات، بەڵکو یەکسەر دنیای دەوروبەر، خشۆک، گەڵا، باران، دار، بەرد و خۆڵ و با و زریان، کات و شوێن بە گشتی دەهێنێتە قسە و مرۆیانەی دەکات.

بەلای شێرکۆوە، سرووشت بابەت یان ئۆبژەیەکی دابڕاو لە بکەری هەستەوەر نیە، بەڵکو تەواوکەری سۆزەی هەستەوەرە و پێکەوە لە گفتوگۆیەکی ڕاستەوخۆی زیندوودان.

لە ڕوانگەی ناوەڕۆکی هاوچەرخانەی شـیعرییەوە، چ بە ئاراستەی ئاسـۆیی و چ بە ئاراستەی ستوونی و شاقوولی، هەروەک چۆن لە ڕواڵەت و بابەتدا، لە ئاسـتی جیهانی و ناوچەییدا، شێرکۆ تێکەڵێکە لە نیرۆدا، لۆرکای مەزن، شـاملوو، مەحمـوود دەرویش و ماغوت و چەندانیتـر.. بەبـێ ئـەوەی تایبەتمەندی خۆی ونبـکات. ئەمەش وادەکات بەرهەمەکانـی شـێرکۆ هەوێنـی چەندیـن لێکۆڵینـەوەی ئەدەبیـی و ئێسـتاتیکی و فەلسـەفیی بەراوردکاریانـەی لەخۆیاندا هەڵگرتبێـت.. شـێرکۆ لە شـیعر و زمانی کوردیـدا، وەک قاڵییەکی ڕەنگاوڕەنگی دەسـتچنی کچانی کرماشـان و سـنە و سلەیمانی و دیاربەکر و قامیشلوو، بە ڕەنگ و تایەبەتمەندی خۆیەوە دەمێنێتەوە و دەناسرێتەوە تەنانەت ئەگەر ناوەکەشی نادیار بێت.

من دڵنیام نەوەی دواڕۆژ لە ئێران و دەوروبەردا، کە کەمتر گیرۆدەی چوارچێوە ئایدیۆلۆژییەکانە و پتر بەدوای شوناسی سۆبژەکتیڤانەی خۆیدا ویڵـە و بە دیدێکی جیهانویسـتانە و گەردوونگەرایانەوە بۆ مرۆڤبوونی خۆی دەڕوانێت، پتر بەلای شـێرکۆدا دێن، تا نەوەکانی پێشـووتر کـە چاویلکـە ئایدۆلـۆژی و حوکمە پێشـوەخت و دیدە نەژادگەراکانیان نەیاندەهێشـت بابەت و ناواخنی شـیعری شێرکۆ ببینن، کە لە مرۆڤایەتی و کوردەکان و کوردستان زیاتر نیە.

بـۆ ئەوانـەی لە بـەر هۆکاری زمان لە شـیعری شـێرکۆ تێناگەن، پێشـنیاریان پێدەکەم گوێ لە دەنگ و ڕیتمی مۆسـیقایی ئەو بگرن، لەوێدا هەسـت بە بەرزیی ئێسـتاتیکیانەی ئەم مرۆڤە دەکەن، کە لە ساتەوەختێکی هەسـتیاردا کۆچی دوایی کرد و چۆوە لای هاوڕێ شـاعیرەکانی خۆی.. ئەو شـاعیرانەی نابێت تەنیـا لە یەک وڵات و

قەبرســتان بنێژرێن، بەڵکو پێویستە گۆڕستانێکی گریمانەکراو، یان ســێمبوولیی هاوبەشیان لە گشــت وڵاتان و لەلای گشت میللەتانی ئازادیخواز هەبێت.



## جەمال غەمبار:

غەمێک بە کۆڵی بارانەوە،

تک.تک

ئەو لە قۆناغی شەشــی ئامادەیی بوو کە ناســیم و زانیم لە هەمان گەڕەکــدا دەژیــن، کە بەبێ ئــەو یادکردنــەوەی بێتامــە. مزگەوتی گەڕەکەکــەی ئێمــە کەوتبــووە دەرەوەی شــەقامی بازنەیــی لــە تووی مەلیک. ئێمە لەو بەشــەی شــار بوین کــە دەبوو زۆرجاران بۆ ســواربوونی پاســەکان تا کارگــە بەردەکــەی «عیرفان» بەپێ بڕۆیشتینایە و لەوێشەوە بەپێ بهاتینایەتەوەماڵەوە، دوائەوەی لە شــەقامی بازنەیی و ڕێک لە ئاســتی تانکیە ئاوەکەی تووی مەلیک بپەڕینایەتەوە بۆ سەر جادە قووڕەکە..

ئێمە هێشــتا لەبەشــی قووڕایی شــار بووین، کە بێ زەبروزەنگیش نەبوو. زستانان غەمبارم دەدی وەک باڵندەیەکی سەربڕاو کە هێشتا گیانی دەرنەچووبێت، لە کۆڵانەکەی ماڵی خۆیانەوە بەرەو وێستگەی پاســەکان، بە باڵەفرە و لەنجەولار دەڕۆیشــت تا خۆی لە گۆلاوی قــووڕ و چلپاوەکان بپارێزێت. ئەو، ئەم ســەربڕاوی و باڵەفرتێیەی

دواجــار خســـتە ناو شــیعرەکانییەوە. شــیعری ئەو لــە باڵندەیەکی ســـەربڕاو دەچێت کە پێش گیانکێشـــان، لەدەســـتی چەقۆبەدەست، واقیع، ڕزگاری بووبێت و بێ ئامانج و ئاراســـتە، لەســـەر ئەو خاکە خۆی بگەوزێنێ.

پاوڵ سیلان، شاعیری گەورەی فەرەنسا، شیعرێکی بۆ جینۆسایدی یەهوودییەکان هەیە بەناوی (فوگ)، کە تیایدا وەسفی گایەک دەکات بــەر لەبردنــی بۆ قەسســـابخانە بۆنـــی خوێـــن دەکات و دەکەوێتە سمکۆڵ و خۆگەوزاندن، وەکئەوەی لەخاک بپرسێت: چۆنە ئەوەندە تینووی مژینی خوێنە!

من زۆرجاران بەو شــیعرەی سیلاندا، کەســـایەتی شیعریی جەمال غەمبارم بیر دەکەوێتەوە. غەمبار بەرجەستەکەری غەمە لە شیعری کوردیدا و ئەمەش وایکردووە، شــیعری غەمبار شــیعرێکی پاسیڤ بێت و شـــیعرێک بێت ئەوەندەی هووشیاریی غەم بەرجەستە بکات، ئەوەندە شیعرێک نەبێت کە بیەوێ لە دیدەگای غەم بپەڕێتەوە.

نـــەوەی مـــن، کاتێ لـــە گۆڤارەکاندا شـــیعرێکی تـــازەی غەمبارمان دەخوێنـــدەوە، ئەمـــە وەک ڕووداوێـــک وابـــوو، کـــە چاوەڕوانیـــی ڕووداوەکانی پاشتری تێدا دروست دەکردین. ئێمە زوو تێگەیشتین کە شـــیعری غەمبار ئاســـانیش خـــۆی نادات بەدەســـتەوە و زمانی غەمبار ئەوســـا، تەمومژاویتر بوو لەچاو شـــیعر و قەسیدەکانی ئەم ڕۆژگارەیـــدا. ئەمـــەش هەم پەیوەندیـــی بە بارودۆخە ڕەشـــەکەوە هەبـــوو، کە داوای لیدەکردیت بوونی خۆت لە ســـێبەر و تاریماییدا بسەلمێنیت، نەک بە ڕۆژی ڕووناک. دەبوو زمان هەمیشە تارماییەک، پەردەیـــەک لە تەمومژ بـــەدەوری خۆیدا بگێڕیت، بۆ ئەوەی گیرۆدە نەکرێ بە یەک مانایی و ڕاستەوخۆگەراییەوە.

لەلایەکـــی تریشـــەوە پەیوەندیـــی هەبوو بـــە شـــارەزایی غەمبار لە

ئەدەبیی کلاسیکی کوردی و زمانە بەرزەکەی، لەگەڵ شارەزایی و خوێندنەوەی بۆ ئەدەبیی جیهانیی لە ڕێگەی زمانی عەرەبییەوە. ئەو هەمیشە بە چاوەڕوانییەوە دەینووسی لەبەردەم نمونە بەرزەکانیدا..

هێشتا نەچووبووە تاقیکردنەوەکانیی پۆلی شەشەمی ئامادییەوە، کە ناسیم. لە مزگەوتەکەی گەڕەکی خۆمان، لە تووی مەلیک، کە ئێستا کەوتۆتە سەرووی گوندی ئەڵمانی و خوار شاری یارییەوە. مجێوری مزگەوتەکە ڕێگەی بە ئێمە نەدەدا بچین بۆ ئەوێ، بەڵام کاتێ غەمبار واسیتەی بۆ کردین، ئیتر کێشەمان نەما. چەندجارێک پێکەوە پیاسەمان کرد، دانیشتین و کتێبم لێوەرگرت و بردمی بۆ بازاڕ و کەسانیتری پێناساندم و دڵی دامەوە. ئەودەم ئێمە منالە وردکەبووین، بە غەمباریان دەگوت: ئەم منالە وردکانە چین شوێن خۆتیان دەخەیت! بەڵام ئەو هەمیشە کەسێک بوو لە نێوان شاریبوون و ئازاری گوندا مایەوە، ئەو بەشێکی لەسەر جادەی قیر و بەشێکی لە قووڕدا بوو. ئەو لە ئێمە تێدەگەیشت. بۆخۆیشی، هەرچەندە شاریانە دەژیا، بەڵام بە ئەسڵ خەڵکی گوند بوو، بەڵام بیرم نیە کامیان..

نازانم پێش وەرگیرانیی بوو لە کۆلێژی یاسای بەغدا، یان لەو کاتەدا بوو کە غەمبار عاشق بوو. ئەمە کەمێک لە ئێمەی دابڕی، بەڵام چاوێکی هەر لێمان بوو. وردە وردە و تا دەهات لە لەگەڵ شیعر و عەشق و دیلاندا دەماننناسییەوە. ئەو بەبێ دیلان نەدەژیا: زۆرجار تەڕیی حەوشەکەیان و بۆنی شیعر و دەنگی دیلان لە ماڵی ئەواندا تێکەڵ دەبوون و من غەمبارم بەوانەدا دەناسییەوە. دایکێکی هەبوو، میهرەبانتر لەگەڵای درەخت، باوکیشی لە قەندی میاندواو شیرینتر، هەردووکیشیان لە کار و بیدەنگیدا: پاشا و لە لووتکەدا

بوون. جەمال لە باڵادا سەر باوکی و لە حوزن و میهرەبانیدا سەر دایکی داوەتەوە..

بۆخۆیشـی جۆگەلەیەک بوو ئێمەی دەبەسـت بە شار و شیعرەوە. ئیتـر گەورەبوونیـش هات، تـا متمانەمان بە خۆمـان زیاتر بێت و بوێرین لەگەڵ غەمبار پیاسـە بکەین! ئەوە شانازیی بوو، بەتایبەتی کە ئیتر تێگەیشـتبووین ئەو سیاسەتیش دەکات. ئەگەرچی هەرگیز نەمزانـی چۆن و لەگەڵ کێ، بـەڵام چەپایەتییەکی تێدا بوو، جۆرێ لـە ماتەریالباوەڕی نا شۆڕشـگێڕانە. من وا هەسـتدەکەم هەسـتە شـیعرییەکەی و بڕوای غەمبار بە وشە و خەیاڵ و ڕێکخستنەوەی جیهـان لە زمانی شـیعردا، هەموو باوەڕبوونێکیان (بە تێگەیشـتنە خۆرهەڵاتییەکە)، لە شـۆڕش لێسـەندبۆوە. ئەو زیاتر پیاوی سوڵح و چاکسازیە، نەک شۆڕش.. ئەگەر وا نەبوایە من بە دیوارنووسین دەستمپێدەکرد، نەک بە شیعرنووسین.

لـە یەکـێ لـە پیاسـەکانی ئێواراندا بـوو، کاتی گەڕانـەوە ماڵ، کە ئەمنـەکان بەرەوڕوومان هاتن و چواردەوریان گرتین! مەگەر هەر زمانی غەمبار و شـێوازە ئەدەبیەکەی بیتوانیبا لە تەڵەیەکی گەورە ڕزگارمان بکات. ئەدەب هەمیشە ڕزگارکەر بووە و دەبێت..

غەمبار هەمیشە بە ڕێگاوە بوو، بەتایبەتی لە ماوەی عاشقایەتییەکەیدا هیـچ حەجمینی نەبوو: لەماڵی خۆیانەوە بـۆ ماڵی یار، لەوێش دڵی جێدەهێشـت و ئێواران دەهاتەوە بـۆ لای کتێبەکانی و دیلان. وەک ئەوەی عەشـق وزەیەکی بۆ سـەفەر پێبەخشـیبوو، کە چیرۆک و بەسـەرهاتی ئۆدیسیۆسـی بیـر دەهێنایتـەوە. ئەو هەمیشـە وەک ڕۆحێکـی ئۆدیۆسیۆسـی شـیعر مایەوە. هەمیشـە لەسـەفەردا و هەمیشـە عەوداڵ، بەڵام هەمیشـە پێرفێکـت و دوور لە پەڕپووتیی شاعیرانە. هەمیشە ڕێکپۆش، کراس و پانتۆڵ ئوتوو کراو، هەمیشە

بۆنخۆش و ڕیش تاشـراو، ئەگەرچی سەردەمەکە داریوشیانە بوو:
بەبێ ڕیش و سمێڵ مانات نەبوو.
بێ ڕیشـیی ئەوەندە کاریگەریی کردبووە سـەر دەروونیی ئێمە و هەسـتی دواکەوتـن لە سـەردەمەکە وای لێکردبوویـن، کە هەموو ڕۆژێ بـە دزیـی لـەو مزگەوتەدا کـە غەمبار لـەلای مجێورەکەی واسیتەی بۆ کردبووین، بچین سەعیی تیا بکەین، لە ئاودەستەکانیدا بە لەتە تیغێک و لەبەردەم تەلزمی ئاوێنەدا، ڕیش و لاجانگمان داغان دەکرد.. غەمبار، لەو سـەردەمە داریووشـیانەیەدا، تەنیا غەمبارانە شـاعیربوو، دەنا ژیانێکی باشتر لە قەیس و مەجنوون دەژیا. ئەوە تەنیا پاشتر بوو کە شیعر ژیانی زەوتکرد و بوو بە غەمیی ژیانی.
غەمبار بۆ من لەوکاتەدا پتر لەوەی کەسێکی واقیعیی بێت، ڕەمزێک بـوو. ڕەمزی زمانێکـی ڕەوانبێژانە، کەسـایەتیەکی ئێسـتاتیکی و لەهەمان کاتیشـدا بەرگریی و نیشتیمانپەروەری، ئەمە جگە لەوەی پەیوەندییەکی بێئەندازە جوان و ڕێزدارانەی لەگەڵ نەوەی ئەدەبیی پێشـخۆیدا هەبوو. هەرچەندە خۆی مۆدێرنیست بوو، بەڵام نەریتی ڕەت نەدەکـردەوە. ئـەو هەڵگـری ناکۆکیـی بوو لە خۆیـدا، بەڵام بە شـێوازێکی ئاشـتیانە لەگەڵ ناکـۆک و دژەکانـدا دەژیا. بەهرە زۆرەکانی، فرەییان بە کەسـایەتی ئەو بەخشیبوو: شیعر و زمان و ڕەوانبێژییەکی دەوڵەمەند، دەنگ و شێوازێکی شایستەی خوێندنەوە، کە نەوەی ئەم سەردەمەشـی خسـتۆتە ژێـر کاریگەریی خۆیەوە، خوێندەواریـی و تەواوکردنی خویندن و لەپـاش هەموو ئەمانەش: خۆشنووسـیی. ئەوم دەبینی لە چاپخانە و ئۆفیسـی سـەرکەوتن، چەندین کاتژمێر لەگەڵ نووسینەوەی کتێبەکان بە پێوە دەوەستا.
غەمبـار، «شـاز» بـوو، بـە زمانـی شـاری و لادێـی و ژن و منداڵـی دەزانـی و خۆشەویسـت بوو. مـن وشـەکانی: «دڵەکەم»،

«ڕۆحەکەم»، «کەسەکەم»، «ئازیزم»، «سوپاس»، «شایانی نیە» و لە هەمووشیان خۆشتر: «حەوبرا»، لەوەوە فێربووم، کە پاشان لەمەی دواییاندا لاساییشم دەکردەوە.

ئەو بۆ نەوەی ئێمە، ڕەمزێکی ئەخلاقییش بوو، کەسایەتیەکی داوێنپاک، بەدوور لە فیتنەگێڕی و دەروەست بە نیشتیمانەوە. من لە سلێمانیدا دووکەس گیانی نیشتیمانپەروەرییان تیدا جۆشدامەوە، یەکەمیان بەهۆی مۆسیقا و دووەمیان بە هۆی شیعرەوە، یەکەمیان مامۆستا دلێر ئیبراهیم و بنەماڵەکەیان، لە گەڕەکی مەجی بەگی کۆتایی حەفتاکان و دووەمیان جەمال غەمبار لە گەڕەکی تووی مەلیکی هەشتاکان. یەکەمیان بە مۆسیقا و هاندانم بۆ خوێندنەوەی (داغستانی من)، کە پێموایە ئەو کتێبە بۆ هەر کەسێ بیەوێ نیشتیمانی خۆشبوێ بەسوودە و دووەمیان بە شیعر و بەتایبەتیش شیعری نالی، کە غەمبار یەکێ بوو لەوانەی زوو سەرنجی بەلای چامەکەی نالی و سالمدا ڕاکێشام و من پاشتر تێگەیشتم کە غوربەتی شاعیران لە نیشتیمانەوە دەستپێدەکات و بەناو تەمەن و تاراوگەدا شۆڕ دەبێتەوە بۆ ناو شیعر و وشەکان و نەمریی..

لە شیعری غەمباردا کۆی چەپاندنی ستەمکارانەی هەشتاکانی بەعس بەرجەستەبووە. شیعری ئەو، زمان و شەتاوی وشەکانی، حوزن و قەهر و نۆستالیژیای هەشتاکان بەیان دەکات. غەمبار، لە هەشتاکاندا سزای ڕۆحیی درا و لە تاراوگە و پاش هاتنەوەی بۆ نیشتمان هاواری لێهەستا. ئەو بەیانکەری چەپێنراوێکی ڕۆحیە کە لەو دەیەی قەهرەدا نەدەکرا بەیان بکرێ. غەمبار بەمکارەی، بەم خۆهەڵگرتنەی توانیی زەمەنی ستەم و زەمەنی نائومێدیی پێکەوە ببەستێتەوە. لێرەشەوە، شیعری ئەو بەیانکەری کەمێ بەدرەنگەوەی ستەمکاریی هەشتاکان و کەمێ بە شەرمەوەی نائومێدیی هەنووکەیە،

کە لە دوای ڕاپەڕینەوە درێژبۆتەوە بۆ ئێستا..
ئـەو ئێوارەیـەی لـە مونەزەمـەی بەناو شـەهید عوسـمانەوە، بە ئارپیجی و دۆشـکە پەیکـەری کاوەی ئاسـنگەریان دایە بە ڕێژنە، جەمـال غەمبار لەناو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا بوو. سـەردانی هەڵەبجە و کەرکووکـی دەکرد و لە سـلێمانیدا فیگەرێکی دیار بوو. لە دوای سـاڵی هەشـتاو پێنج، سـاڵی قەدەخەی چوونەدەر، نەمبینییەوە تا گەڕانـەوەم لە دووهەزاردا، کە ئیتر ئەو لە ئاسـتانەی جێهێشـتنی نیشـتماندا بوو. لـە دیدارێکی کورتدا زانیم غەمبـار ئاگاداری کۆی چالاکییەکانم بووە و ئەمەش دڵخۆشـیی کردم. ماڵئاواییمان لێککرد و تا ساڵی، وابزانم ٢٠١١نەمبینیەوە، کە ئەو دەم هاتبۆوە بۆ ئەوەی لـە هەولێر کۆڕ بگێرێت و شـیعری کاپتنەکـەی بخوێنێتەوە. داوای لێکردم من پێشکەشـی بکەم. وێڕای ئەو وشـانەی کە پێویست بوو لەبەردەمی ئەودا بگوترێن، ئەم دێڕەشم گوت:
غەمبـار تاوانبـارە بـەوەی نەوەی ئێمەی پەلکێشـی ناو شـیعر و ئەدەبیات کرد..

بیری عەتا دەکەم،
عەتا نەهایی،
کە نازانم بۆچی ئەو
نەبووە سەرۆک کۆمار،
تا لەوە زیاتر زمان،
هەست بە بێڕێزی نەکات
لە زاری هەرکەسدا..

هیچکەس بە قەد ڕۆماننووسیک،
هێندەی شاعیرێک،
هێندەی حەیرانبێژێک و
تەنانەت بەقەد پاقلەفرۆشێکیش
کە هاوار دەکات:

پاقلەی کوڵاو،
زمان و ڕۆح ئاشتناکاتەوە..

هیچ کەس هێندەی سیاسیەکیش
کە نازانێت بخوێنێتەوە،
ئافات نیە بۆ وڵات،
بەڵا نییە بۆ سەردەم..

ئەو، سێمبوولی خۆشەویستی
لە وڵاتێکدا
(بۆنی دەم دەکرێ
نەکا گوترابێ: خۆشمدەوێ)!
پۆل پۆل گەنجانی دێهات و
شارەدێ
لەدەوری ئەم کانییە دەنیشنەوە
تنۆک، تنۆک
ئەو پلووسکی ڕۆحە
دادەبارێتە مرۆڤبوونمانەوە
وەکئەوەی کوردبوون
هەرچەندە ئازاربەخش،
پێویستییەک بێت بۆ مانەوە
وەکئەوەی ئەم تابلۆی برینە
ڕەنگێکی بوێ لەسەر کێشی
(هەڵاڵە)
وەکئەوەی ئەم مەرگە

دوایین دیمەنی فیلمێک بێ
لە دەرهێنانی پەڕێک گوڵ
بەناوی
(تەها کەریمی)..

عەتا نەهایی!
زمانت بخەمە سەرسەرم
وەک ئەوەی دۆستیت تاجە و
دەستت پڕ لە میهرەبانیی
بۆ گەنجانی وڵات،
چ پەڕجووێکە (بانە)
ئەو شارە تەنیایەی نێوان
(سلێمان بەگ) و (ئاربەبا)
ئەم پێخەمبەرەی پێبەخشین
کە لە دەستەکانییەوە
شەربەت و
لە زمانییەوە شیرینیی
تک.. تک
وەک حەرفی قەدەخەکراو
ئازار، ئازار
دێنە خوار
منیش لێرەوە،
بڵند.. بڵند
هەڵدەکشێم
تۆقەن، تۆقەن

باڵا،
مەڵۆ، مەڵۆ
کۆدەبمەوە
تا لە گشتێکدا فرەیی
کۆکەمەوە و
بمەوێ پڕ بە جیهان هاوار بکەم:
بژی ئازادی..

٢٠١٣

## له بەرهەمەکانی دیکەی نووسەر:

■ ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی هزری و فەلسەفی:

- دیاردەگەرایی تاراوگە، چاپی یەکەم: دەزگای باران، سوید ١٩٩٥. چاپی دووەم: دەزگای ئاراس، هەولێر ٢٠٠٢
- سۆفیستەکان، چ١ ستۆکهۆڵم ١٩٩٨، چ٢ دەزگای سەردەم، سلێمانی ١٩٩٩، چ ٣ دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی زنجیرەی کتێبە فەلسەفییەکان: ٢٠٠٩
- دنیای شتەبچووکەکان، دەزگای سەردەم، سلێمانی ١٩٩٩، چاپی دووەم، ڕەنج ٢٠٠٥
- کتێبی نالی، دەزگای موکریانی، هەولێر ٢٠٠١
- نەتەوە و حەکایەت، بەرگی یەکەم، دەزگای سپیرێز، دهۆک ٢٠٠٢، چاپی دووەم دەزگای موکریانی، هەولێر: ٢٠٠٨، هەورەها یانەی قەڵەم: ٢٠٠٩
- قەفەسی ئاسنین، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی ٢٠٠٣

- هاوکاتی و هاوشوناسی، دەزگای سپیریز، دهۆک ٢٠٠٤
- لە پەیوەندییەوە بۆ خۆشەویستی، دەزگای سپیریز، دهۆک ٢٠٠٤، چاپی دووەم، کتێبخانەی سۆران، هەولێر ٢٠٠٤، چ ٣: یەکێتی ژنان، سلێمانی ٢٠١٠
- نووسین و بەرپرسیاری (لێکۆڵینەوە)، چ یەکەم: ٢٠٠٦، چاپی دووەم بە دەستکارییەوە، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی ٢٠٠٦
- فەنتازیای خواردن: دەزگای چاپ و پەخشی خەندان، چ یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٦
- زانکۆ لە مۆدێلەوە بۆ واقیع (وتار و گفتوگۆ لەسەر زانکۆ و پەروەردە)، چاپی یەکەم: دەزگای گەنجان: سلێمانی ٢٠٠٧
- ترسان لە فەلسەفە. دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠٠٩
- دیکارت و ئەقڵانییەت. دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، زنجیرەی کتێبە فەلسەفییەکان، هەولێر ٢٠٠٩.
- پییەر بۆردیۆ و کۆمەڵناسیی فەلسەفی: دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، زنجیرەی کتێبە فەلسەفییەکان، ژ. ١٥، هەولێر ٢٠١٠
- کتێبی ستایشەکان. (وتاری فەلسەفی). دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠١١
- مێژووی هزری کۆمەڵایەتی، دەزگای زەریاب، هەولێر ٢٠١١
- پێشسوکراتییەکان، بەرگی یەکەم، فەلسەفەی یۆنانی دێرین، دەزگای زەریاب، هەولێر: ٢٠١٢

■ گفتوگۆ:

- مرۆڤ وەک بەخشندە. چاپی یەکەم (بەرگی یەکەم) چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی ٢٠٠٦

- ئۆپۆزیسیۆن و دەسەڵات: لە چەند تەوەرێکی جیاوازدا. کتێبی گۆڤاری سڤیل، ژمارە (٢)، چاپخانەی ڕۆکسانا، هەولێر ٢٠١٠
- کۆمەڵگای شلەقاو، ئامادەکردنی لەتیف حسین، دەزگای والآ، سلێمانی ٢٠١٠
- زمان، فەلسەفە و شوناس. ئامادەکردنی مەحموود شێرزاد. هەفتەنامەی کاکێشان، کوردستانی نوێ، ٢٠١١، سلێمانی.

■ بەرهەمی ئەدەبی:

- گۆرانییەک بۆ گوندە سووتاوەکان (شیعر)، کۆپنهاگن ١٩٨٩
- کۆپنهاگن! (شیعر)، کانونفرهنگ ایران، دانمارک ١٩٩٤
- زمانی عەشق، زەمەنی ئەنفال (شیعر) چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی ٢٠٠٠
- من و مارەکان (چیرۆک) مەڵبەندی لاوانی میدیا، سلێمانی ١٩٩٩
- خودایە بۆ نەتکردم بە قۆخفرۆش؟ سلێمانی، چاپخانەی سەردەم ٢٠١١

■ وەرگێڕان:

- ئەفسانەی خۆشەویستی (سەمەد بیهرەنگی) ئەفسانەچیرۆک، چاپخانەی سەرکەوتن، سلێمانی ١٩٨٣
- دەنگی پێی ئاو (سهراب سپهری) چ١، ١٩٨٩، چ٢ کۆپنهاگن ١٩٩٠
- درآمدی بر شعر معاصر کردی، (شیعری هاوچەرخی کوردی بە فارسی)، کۆپنهاگن، ١٩٩٠
- پیدرۆپارامۆ (ڕۆمان)، خوان ڕۆلفۆ (بەهاوکاری ئازاد بەرزنجی) دەزگای سەردەم، سلێمانی ١٩٩٩، چ ٢، سلێمانی ٢٠٠٩
- دەروازەکانی کۆمەڵناسی (منوچهر محسنی)، بەهاوکاری کۆمەڵێ وەرگێڕ، دەزگای موکریانی، هەولێر ٢٠٠٢، چ ٢ و چ ٣
- ئەلبوومی کیژی جنۆکان (چیرۆکی منداڵان لە دانمارکییەوە)، دەزگای

سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٢.

- خۆبەکۆیلەکـردن (ئەتیـن دۆلابۆتی) بە هاوکاری لەگـەڵ مراد حەکیم.
دەزگای موکریانی، هەولێر ٢٠٠٥.

- ژیان کورتە (ڕۆمان)، یۆستین گۆردەر، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠٠٥، چ ٢ دەزگای سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٩.

# Person and experience

## Some Persons in my life

Rebwar H. Amin Siwayli

kurdistan 2013



# *Person and experience*

## Some Persons in my life

*Rebwar H. Amin Siwayli*

لەدەرەوەی پێشداوەرییە هاوکاتییەکان لەسەر کەسایەتییەکان، ئەم کتێبە دەیەوێت ئەزموونی نوسەرەکەی بکاتە پێوەری قسەکردن لەسەریان بەبێ گوێدانە ڕق و خۆشەویستی زەمانە لەبارەیانەوە. ئەمە فۆرمێکی گێڕانەوەی بوێرانەیە بۆ ئەوەی هەرگیز کەسایەتییەک کورتنەکەینەوە لەو پەیوەندییانەی بە دەسەڵات و پێشداوەرییەکانیەوە دەبەستێتەوە و بچووکی نەکەینەوە لە هەڵە و کەموکورییەکانیدا. لەسەر کێ نووسین لەم کتێبەدا هێندەی چۆن لەسەرنووسین گرنگە و ئەمەش شێوازێکی گێڕانەوەی سۆبژەکتیڤانەیە تا هەرگیز کەسایەتییەکان لەیەک ڕوانگەوە نەبینین..


**Zeryab Publisher** . دەزگای زەریاب

بە هاوکاری گۆڤاری سڤیل